## پێڕست:

ناوی کتێب: چیرۆکەکانی سەمەدی بیهڕەنگی

بابەت: کۆ چیرۆك

نووسەر: سەمەدی بیهڕەنگی

وەرگێڕ: حەمەکەریم عارف

بڵاوکەرەوە:

نەخشەی بەرگ:

پیت چنین:

هەڵەچن:

شوێنی چاپ:

ساڵی چاپ:

تیراژ:

ژمارەی سپاردن:

# پێشەکی

سەمەدی بیهرەنگی لە ساڵی( ١٣١٨)ی هەتاوی(١٩٣٩) دا لە ماڵێکی خوارووی گەڕەکی چەرەندابی تەورێز هاتووەتە دنیاوە. بابی کاسبکارێکی هەژارو دەستکورت بووە. سەمەد هەر لە منداڵییەوە لە باوەشی هەژاریدا پەروەردە بووەو بە هەموو واتای وشەی هەژاری، هەژاری جەربانددووە. بە چاوی خۆی دەردو ژانەکانی دیتوون، بۆیە هەر لە سەرەتاوە هۆگری خۆشەویستی وان بووە.

سەمەد دەرچووی ئەنیستیتۆی مامۆستایان بووە، هاودەورەی بهرۆزی دهقانی و کازمی سەعادەتی بوو. لەو سەروبەندەدا کە تاریکی باڵی بەسەر هەموو لایەکا کێشا بوو، ئەم سێ هاوڕێیە خونچەی هیواو باوەڕیان لە دڵی پڕ جۆش و خرۆشیاندا پەروەردە دەکرد. سوور بوون لەسەر ئەوەی کە: تروسکە هەرچەند کەم و بچووك بێ هەر رووناکییەو رۆژێ دێ هەموو لایەك رۆشن دەکاتەوە.

بیهرەنگی لە ساڵی( ١٣٣٤=١٩٥١)دا پەیمانگەی مامۆستایانی تەواو کرد. لەسەر داوای خۆی رەوانەی گوندە دوورەکانی ئازەربایجان کرا، یازدە ساڵی رەبەق لە ممقان، قدجهان، ئازەرشهر، گورگان و ئەخیرجاندا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە مامۆستایەتی کرد. سەمەد لە ناوجەرگەی هەژارانەوە هەڵقووڵاو چۆوە نێو ئەوان.

سەمەد هەم مامۆستا بووەو هەم قوتابی، باوەڕی بەوە نەبوو فێر بوون تەنیا لە پێناوی فێربووندا بێ و بەس، بەڵکو باوەڕی وابوو کە فێر بوون و زانیاری دەبێ لە پێناوی خزمەتی جەماوەری خەڵکدا بێ، ژیان و گوزەرانی گەلان بگۆڕێ.. هەژاری سەمەدی خاراندبوو و رۆژ لە دوای رۆژ پتر ئاشنای هەژاری و ستەم دەبوو و هەستی دەکرد هەرگیز ناتوانێ چارەنووسی خۆی لە چارەنووسی ئەم هەژارانە جیا بکاتەوە کە لەگەڵیاندا ژیا بوو، ئەو هەژارانەی کە هۆگریان بوو بوو.

سەمەدە عاشقی ڕەمەکی مەردم بوو، دەردو ڕەنجی ئەوان قوتابخانەی تێکۆشان بوو، دەستە دەستە خەباتگێڕانی پێ دەگەیاند، قینی لە دوژمنی چینایەتی هەژاران بوو. سەمەد هەر بەوەوە نەدەوەستا دەردو هۆی هەژاری چەوساوان دەست نیشان بکا، بەڵکو چارەسەریشی بۆ دەدۆزینەوە. رێگای خەباتی بە زەحمەتکێشان نیشان دەدا. ئەوەتا لە چیرۆکی کوێر ئۆغڵیدا دەڵێ: ئێمە کاتێ دەتوانین خۆشەویستی خۆمان بۆ جەماوەر بسەلمێنین کە بە گژ دوژمنەکانیا بچین. تۆ کە خوێنی زۆرداری دەڕێژی، خۆشەویستی خۆت بۆ خەڵکی دەسەلمێنی. یا ئەوەتا لە

چیرۆكی بیست وچوار سەعات لە نێوان خەو و بێداریدا دەڵێ: پڕ بە دڵ حەزم دەكرد ڕەشاشەكەی نێو جامخانەكە هی من بوایە.

سەمەد باوەڕی بە تواناو هێزی لەبن نەهاتووی جەماوەر هەبوو، دڵنیا بوو كە مێژوو گەلان دروستی دەكەن.... ئەوەتا لە چیرۆكی كوێرئۆغڵیدا بە ئاشكرا ئەمە دەردەبڕێ: تواناو هێزی كوێر ئۆغڵی لە سەرچاوەی تواناو هێزی ڕەمەكی مەردومەوە هەڵقولاّ بوو...

گەورەترین سیفەتی كوێر ئۆغڵی پشت بەستن و باوەڕ بوون بوو بەو هێزو توانایە.

سەمەد لە سەردەمێكا دەژیا كە تیرۆرو زەبرو زەنگی ڕژێمی فاشتی پەهلەوی بە توندترین شێوە تەنگی بە خەڵكی و ڕۆشنبیران هەڵچنی بوو. هەر لێرەوە سەمەد هەست بە گەورەیی هێزی لەبن نەهاتووی چەوساوان دەكاو ڕێگای خەباتی بێوچان دەگرێتە بە.

ئەوەتا لە چیرۆكی ئەفسانەی خۆشەویستیدا ئەم ڕاستییە دەردەبڕێ‌و دەڵێ: پاشای شار، شمشێرسازیی قەدەغە كردبوو. بەلاّم چونكە مەردوم پێویستیان بە شمشێر بوو، ئاسنگەرانی شار بە ڕۆژ ئاسنگەرییان دەكردو شەوانیش بە نهێنی و لە ژێر زەمینانـدا شمشێریان دروست دەكرد.

خەباتی سەمەد ئەنجامو درێژەی خەباتی هونەرمەندانی پێشكەوتنخوازو شۆڕشگێڕانی ولاّتی ئێرانە، ئەو خەباتەی وێڕای زەبرو زەنگی دەسەلاّتی ڕژێمی ئێران نە بە سەمەد دەست پێدەكاو نە بەو كۆتایی دێت. سەمەد دژی كەلتوورو فەرهەنگی ئیستیعماری دەخەبتی، هەوڵی دەدا كەلتووری ڕەسەنی شۆڕشگێڕانەی ڕەمەكی مەردوم بە خەڵكانی شۆڕشگێڕ بناسێنێ.

سەمەد لە سەرەتای( ١٣٤٧=١٩٦٨)دا هەر لە ڕێگای چالاكی ئەدەبییەوە ئەمیر پرویز پویانی ناسی. سەمەد بە حوكمی ئەوەی دۆستو ئاشنای لە تەورێزدا زۆر بوو، هەندێكیانی بە پویان ناساند.

پویان لە ئاخرو ئۆخری ساڵی ١٣٤٧=١٩٦٨دا لەگەڵ یەكێك لە ئەندامانی گروپەكەیاندا چوو بۆ تەورێز تا كۆمیتەی تەورێز دامەزرێنن. لەم سەفەرەیدا بوو كە هەواڵی مەرگی سەمەدی بیست. ئەوە بوو دوایی لەگەڵ بهروزی دەهقانی، عەلی ڕەزا نابدل، مناف فلكی دا گفتوگۆیان كردو ئەنجام لە هەمان ساڵدا كۆمیتەی ناوەندی تەورێز لەو سێ كەسە پێك هات.

سەمەد ئەستێرەیەكی پرشنگداری ئاسمانی ئەدەبیاتو كەلتووری شۆڕشگێڕی گەلی ئێرانە. ڕاستە ،خۆی ڕۆیی. بەلاّم بەرهەمەكانی لە دڵی هەموو چەوساوەیەكی ئێراندایە، چیرۆكەكانی هەتاوی ئازادینو دڕ بە شەوەزەنگی كۆیلەیەتی دەدەن.

سەمەد جگە لە چیرۆك، گەلێ وتاریشی نووسیوون، لەوانە لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ مەسەلەی پەروەردەو فێركردن لە ئێرانا، گەلێ وتاری مێژوویی‌و زانستی كە لە كتێبی وتارەكانی بیهرەنگیدا بلاّوبوونەتەوە. ئەو شیعرانەی كە لە شیعری نوێی فارسییەوە كردوونی بە ئازەری نیشانەی تواناو دەسەلاّتی سەمەدە لە بواری زمانی توركیدا. ئەوەتا نووسەرێك لە ستایشی سەمەدا دەڵێ: شاكاری سەمەد ژیانی بوو.

**سەمەد تەنیا لە بواری گۆڕینی بارودۆخی زەحمەتکێشاندا مامۆستا نەبوو، بگرە لە مەیدانی گۆڕینی شێوەی مەرگیشدا هەر مامۆستای جەماوەر بوو، ئەوەتا لە چیرۆکی ماسییە رەشە چکۆلەکەدا دەڵێ: مردن بە ئاسانی دەتوانێ بەرەو رووم بێ، بەڵام من تا بتوانم بژیمو درێژە بە ژیان بدەم. نابێ بچمە پێشوازی مەرگ، خۆ ئەگەر بە ناچاری ڕووبەڕووی مەرگ بوومەوە، کە هەر دەبمەوە، ئەوا گرینگ نییە، گرینگ ئەمەیە کە ژیان یا مەرگی من چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی خەڵکانی دی هەبێ.**

**وەکو دیتمان کاریگەریشی هەبوو، کێ دەتوانێ نکوڵی لەوە بکا کە گەلێ لە شۆڕشگێڕانی ئێران، لە سەرەتادا لە سەمەدو بەرهەمەکانی سەمەدەوە دەستیان پێکردووەو پەندو دەرسیان لە ژیانو مەرگی ئەوەوە وەرگرتووە. بەرهەمەکانی سەمەد هێندە کاریگەر بوون، کە کورتبینو زۆردارو سەرمایەدارانی هەراسان کردبوو. هەر بۆیەش زۆردارانی ترسنۆك لە رێگای بەکرێ گیراوەکانیانەوە سەمەدیان لە ئاوی ئاراس دا شەهید کردو هەوڵیاندا مەرگی سەمەد لە خەڵکی بشارنەوە، بۆیە تەنیا ئەوەندەیان دەربارەی گوت: سەمەدی بیهرەنگی، مامۆستای گوندەکانی ئازەربایجان لە رووباری ئاراسدا خۆی خنکاند.**

**مۆمی هەڵایساوی هونەرمەندی خەڵکی و شۆڕشگێڕانی ئێران کوژایەوە، بەڵام یادی هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.**

(١٩٨٢)

# کوێر ئۆغلیو
# کەچەڵ هەمزە

عەیامێ بەو عەیامەی پاڵەوانێکی جوامێر لە ئازربایینجاندا هەبوو بە نێوی کوێر ئۆغلی. کوێر ئۆغلی بەر لەوەی ببێتە پاڵەوانو بە پاڵەوانێتی ناو دەربکات نێوی رۆشەن بوو. بابی رۆشەن نێوی عەلی کیشی بوو. عەلی مەیتەرو ئەسپەوانی حەسەن خان بوو. لە ئەسپ پەروەردەکردنا هاوتاو لینگەی نەبوو: بە تاقە نیگایەك حاڵی دەبوو کە فلانە ئەسپ چتۆ ئەسپێکە.

حەسەن خان لە خانە زۆردارو زاڵمەکان بوو. وەکو گشت خانو میرانی دی نۆکەرو خولامو قۆشەنی زۆری هەبوون. هەر کارێکی مەیل لێبایە دەیکرد. پیاوانی دەکوشت، زەویو زاری خەڵکی زەوت دەکرد، باجو خەراجی بێ حیسابی لە جوتیارانو کاسبکاران وەردەگرت، پاڵەوانانی ئازادیخوازی دەزینندانی دەکردو ئەشکەنجەی دەدان. چ کەسێك لێی رازی نەبوو. تەنێ بازرگانانی گەورەو ئەشرافان لە خان رازی بوون. ئەوان بە هاوکاری یەکدی خەڵکیان تالان دەکردو بێگاریان پێدەکردن. کۆڕی عەیشو نۆشیان ساز دەدا، بۆ خۆیان لە شوێنانی سازگاردا کۆشكو تەلاری جوانیان دروست دەکردو ئەوی بە خەیاڵیاندا نە دەهات ژیانو گوزەرانی خەڵکی بوو. تەنیا ئەو کاتانە بیریان لە خەڵكو جوتیاران دەکردەوە کە بیانویستبا باجیان لەسەر زیاد بکەن.

حەسەن خانو خانەکانی دیش بە خۆیان نۆکەرو گوێڕایەڵی خانی گەورە بوون. خانی گەورە باجو خەراجی لەوان وەردەگرتو پشتیوانی لێدەکردنو رێی دەدانێ بە مەیلی خۆیان باجو خەراجو سەرانە لە خەڵکی وەربگرن، بەڵام بە مەرجێ ئەوە لە یاد نەکەن کە دەبێ هەموو ساڵێ بەشە خەراجی ئەو زیاتر بکەن.

بە خانی گەورەیان دەگوت خودکار. خودکار دەوڵەمەندترینو بە دەسەڵاترین خان بوو. سەدانو هەزاران خانو میرو سەرکردەو جەلادو پاڵەوانان نانخۆری دەرباری ئەو بوون وەکو سەگ لێی دەترسانو بێ چەندو چوونو کوێرانە ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بوون.

رۆژێ هەواڵیان بۆ حەسەن خان هێنا کە حەسەن پاشای دۆستی دێتە دیدەنی. حەسەن خان دەستوری دا کە مەجلیسی عەیشو نۆش سازبکەنو بچنە پیری پاشاوە.

حەسەن پاشا چەند رۆژێ لە ماڵی حەسەن خانی مایەوە، ئەو رۆژەی کە لەسەر رۆیشتن بوو گوتی:– حەسەن خان، بیستوومە کە ئەسپی زۆر چاکت هەن!

حەسەن خان با چووە کەوڵییەوەو گوتی: لەم دەورووبەرەدا چ کەس ئەسپی منی نین. ئەگەر مەیلت لێیە جوتێکت پێشکەش دەکەم.

حەسەن پاشا گوتی:- جا بۆ مەیلم نەبن!.

حەسەن خان ئەمری بە ئەسپەوانەکەی کرد کە ئەسپەکان بۆ لەوەڕ نەبات تا پاشا ئەسپانی دڵخوازی خۆی هەڵبژێرێ.

عەلی کیشی، ئەسپەوانی پیر، دەیزانی کە لە نێو ڕەوەکەدا ئەسپی گەلەك چاك هەن، بەڵام شتاقیان ناگەنە تۆزی پێی ئەو دوو جوانوەی کە بابیان ئەسپی دەریایی بوو. ڕۆژێ ڕەوە ئەسپەکەی بردبووە ڕەخی دەریا و بە خۆشی لە پەنایەکدا هەڵاژابوو. لە پڕ سەیری کرد جووتە ئەسپێك لە دەریاوە هاتنە دەرێ و لەگەڵ دوو ماینی ڕەوەکەدا جووت بوون. عەلی کیشی ئەو جووتە ماینەی نیشانە کرد تا ڕۆژێ هەریەکەیان جوانوویەکی بوو. عەلی کیشی جوانووەکانی زۆر خۆشدەویستن و دەیگوت چاکترین ئەسپی دنیایە دەردەچن.

ئیدی ئەوە بوو وەختێ کە حەسەن خان گوتی دەیەوێ ئەسپ پێشکەش دۆستەکەی بکات، عەلی لە دڵی خۆیدا گوتی: بۆ ئەسپەکان نەبەمە لەوەڕێ؟ خۆ لە ڕەوەکەدا ئەسپی لەم جووتە جوانووە چاتر نین!

ڕەوەکەی بەرەڵڵای ناو لەوەڕگە کرد و جووتە جووانووەکەی بۆ قەسری خان هێنان.

حەسەن پاشا بەخۆشی و پێکەنینەوە لە کۆشکی وەدەرکەوت تا ئەسپەکانی هەڵبژێرێ. سەیری کرد چ ئەسپێك لەوێ دا نین و تەنێ جوتێ جوانووی بچووك و لەڕ لەبەر کۆشکدا وەستاون.

گوتی: حەسەن خان، بێگومان ئەمانە ئەسپە پێشکەشییەکانتن، نا بە خۆم زۆرم لەم بارگینانە هەن. بیستبووم کە تۆ ئەسپی چاکت هەن. ئەگەر ئەمانە ئەسپە چاکەکانت بن دەبێ ئەوانی دیت چۆن بن!

حەسەن خان کە ئەم قسەیەی گوێ لێبوو خوێن زاییە دەموچاوی، دنیای لەبەر چاو تاریك بوو. نەڕاندی بەسەر عەلی کیشیدا: ناپیاو ئەدی پێم نەگوتبووی ئەسپەکانت مەبە لەوەڕێ!

عەلی کیشی گوتی: خان سەلامەت بێ، بەخۆت دەزانی من مووی سەرم لە ئەسپەوانی تۆدا سپی کردووەو ئەسپ ناسێکی شارەزام. لە ڕەوەکەی تۆدا ئەسپی لەمانە چاتر نین.

خان هێندەی دی لەم کەڵەوەکێشی و پڕکێشییەی عەلی کیشی دەهری بوو، ئەمری کرد:

- جەلاد، خێرا چاوی ئەم کابرا بێ ئەدەبە لە میل بدە.

عەلی کیشی هەرچەندە پاڕایەوە کە من تەخسیرم نییە، فایدەی نەبوو. جەلاد خێرا پڕی دایە عەلی و چاوانی لە میل دا.

عەلی کیشی گوتی: خان، هەنووکە کە لە گەورەترین نیعمەتی دنیایە مەحرومت کردم، ئەم جووتە جووانووەم وێدە.

خان کە هێشتا دانەمرکابۆوە هاواری کرد: بارگینە قۆترەکانت بەرەو خێرا لێرە وەل بە!

عەلی جووتە جوانووی داپێش و لەگەڵ ڕۆشەنی کوڕیدا سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی. عەلی لە بیری تۆڵەسەندنەوەدا بوو، تۆڵەی خۆی و ملیۆنان هاووڵاتی خۆی. بەڵام دەبوا چاوەڕوانی ڕۆژی تۆڵە بێ. چەندین ڕۆژو شەو لەگەڵ کوڕەکەی و جووتە جوانووەکەدا دەشت و چیای بڕی.

ئاقیبەت لەسەر کێویێکی سەختو هەزار بە هەزاردا گیرسایەوەو ئاکنجی و جێگیر بوو. بەم کێوەیان دەگوت چنلی بل .

عەلی کیشی بە هاوکاری "رۆشەن" زۆری زەحمەت بە پەروەردە کردنی جوانووەکانەوە کێشا تا ئەنجام جووتە جوانوو بوون بە جووتێ ئەسپی خورتو خۆشبەزی ئەوتۆ کە تا ئەو رۆژە ،رۆژگار ئەسپی وای بە خۆوە نەدیتبوو. .یەکێك لە ئەسپەکانیان ناونا قیراتو ئەوی دی دووراتت. ..قیرات ئەوەندە خۆشبەزو تیژڕۆ بوو کە رێگای سێ مانگانی بە سێ رۆژان دەبڕی. هێندەی خورتو شەڕکەربوو بە تەنێ بەگژ لەشکرێکا دەچوو. ئەوەندە بە ئەمەكو دڵسۆز بوو کە جگە لە کوێر ئۆغڵی رێی بە کەسی دی نەدەدا سواری بێ، مەگەر کوێر ئۆغلی بە خۆی جڵەوەکەی دابا دەستی. ئەگەر لە کوێر ئۆغڵی دوور بکاوتایەوە دەگریا و دەی حیلاندو حەزی دەکرد کوێر ئۆغلی بێت سازی بۆ لێ بداتو شیعرو ئاوازی پاڵەوانێتی بۆ بڵێ. قیرات زمانی کوێر ئۆغڵی چاك دەزانی، بیری کوێر ئۆغڵیی لە چاوانو حەرەکەتی دەستو بە دەنیا دەخوێندەوە.

هەڵبەت دووراتیش لە قیرات کەمتر نەبوو.

رۆشەن خەبەری لە نەخشەکەی بابی هەبوو. بە دڵو گیان تێدەکۆشا زووتر رۆژی تۆڵەستاندنەوە نزیك بکاتەوە.

وەختێ عەلی کیشی گیانی دەدا، تاڕادەیەك خەیاڵی ئاسوودە بوو. چونکە ئەو تۆوی تۆڵەیەی کە چاندبووی، هەنووکە چەکەرەی کردبوو. دڵنیا بوو کە "رۆشەن" نەخشەکەی ئەو جێبەجێ دەکاتو تۆڵەی خەڵکی لە خانانو لە خودکار دەستێنێ.

"رۆشەن" جەنازەکەی بابی لە چنلی بلدا ناشت.

رۆشەن توانی لە ماوەیەکی کورتا نۆ سەدو نەوەدو نۆ پاڵەوانی مێرخاز لە چنلی بلدا خڕ بکاتەوەو خەباتێکی بێ ئامان دژ بە خانانو خانی گەورە هەڵگیرسێنێ. لە ماوەی ئەم خەباتدا بە کوێر ئۆغڵی شۆرەتی دەرکرد، واتە کوڕی کوێر.

زوو بە زوو چنلی بل بوو بە پەنای چەوساوانو ئازادیخوازانو تۆڵەسێنان. پاڵەوانانی چنلی بل کاروانی خانانو میرانو خودکاریان تالان دەکردو دەیان دا بە خەڵکی هەژارو دەستکورتو لێ قەوماوان. چنلی بل قەڵای قایمی کەسانێ بوو کە یاسایان ئەمە بوو: ئەوی کار دەکات هەقی ژیانی هەیەو ئەوی بەروبوومی رەنجی کەسانی دی تالان دەکاتو دەیکات بەعەیشو نۆش دەبێ لە نێو ببرێ. ئەگەر نان هەبێ دەبێ بۆ هەمووان بێو ئەگەر نەبێ دەبێ هەمووان برسی بنو تێبکۆشن نان پەیدا بکەن، ئەگەر ئاسایشو بەختەوەری هەبێ دەبێ بۆ هەمووان هەبێو ئەگەر نەبێ دەبێ بۆهیچ کەس نەبێ.

کوێر ئۆغڵیو پاڵەوانەکانی لە هەموو شوێنێ لایەنگری خەڵكو دوژمنی سەرسەختی خانانو ومفتەخۆران بوون. هیچ خانێك لە ترسی "چنلی بل"ییەکان خەوی بە ئیسراحەتی نەبوو. خانەکان هەر چەند هەوڵیان دەدا خەڵکی چنلی بل ئاوارە بکەنو کوێر ئۆغڵی بکوژن، نەیاندەتوانی. قۆشەنی خانی گەورە چەند جارێ حەملەی کردە سەر چنلی بل، بەڵام هەموو

جارێك لە پێچی کوێستانانندا لەلایەن چنلی بلەوە دەکران بە پۆری خوراوو جگە لە ریسوایی چیدی بۆ خان نەدەمایەوە.

ژنانی چنلی بلش چیوایان لە پیاوەکان کەمتر نەبوو. بۆ نموونە "نیگار"ی ژنی کوێر ئۆغڵی چەندین جار بە تەدارەکی جەنگەوەو بە سواری ئەسپو شمشێر بە دەست پەلاماری ناوجەرگەی قۆشەنی دوژمنی دابووو خەرمانی کەلاکی لێ هەڵدابوونەوە.

هەر یەکێك لە پاڵەوانێتیو سەفەرە جەنگییەکانی کوێر ئۆغڵی، بۆ خۆی نەقلێکی سەربەخۆیە. نەقڵەکانی کوێر ئۆغڵی لە بنەڕەتا بە تورکی دەگوترێنو لەگەڵ شیعری جوانو زۆر پڕ مەعنادا ئاشقەکانی ئازربایجان بە سازو ئاوازەوە بۆ خەڵکی دەلێن.

## نەقڵی ڕفاندنی قیرات

ڕاپەڕینی "چنلی بل"یان وردە وردە بە جۆرێ پەرەی سەند کە خانی گەورە تەواو تەنگەتاو بوو. کە بینی دەرەقەتی کوێر ئۆغڵی نایەت، ناچار نامەی بۆ گشت خانو میرو سەرکردەو پاڵەوانو سەردارانی لەشکر نووسیو و داوای لێکردن بێنە لای تا تەگبیران بکەن.

وەختێ هەموو ئامادەبوونو هەرکەس لە جێی خۆی ڕۆنیشت، خانی گەورە دەستی بە قسان کرد:

"گەلۆ، وەکو ئاگادارن ماوەیەکە چەند دزو ئاژاوەگێڕێك لە چیادا خڕبوونەتەوەو ئەمنو ئاسایشی وڵاتیان شڵەقاندووە. سەرکردەو دەم سپی ئەم دزانە مەیتەر زادەیەکی بێ سەروبەرە بە نێوی کوێر ئۆغڵی کە لە پیاوکوژیو دزیو تالانو بڕۆدا هاوتای نییە. لە هەر لایەکی وڵاتا دزێ، پیاوکوژێ، ئاژاوەگێڕێ هەبێ، دەچێتە ناو تاقمەکەی ئەوەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ دارو دەستەکەی کوێر ئۆغڵی زۆرترو خەتەرتر دەبێ. خۆ ئەگەر هەروا دەستەوەستان دانیشین، ڕۆژێ دێ چاو هەڵدەبڕینو سەیر دەکەین "چنلی بل"یان هەموو زەویو زارو سەروەتو سامانەکەیان داگیر کردووین. ئەوساکە یان دەبێ باروبنە بپێچینەوەو هەلێین یا بڕۆین لەلای ئەم دزو ئاژاوە گێڕانە نۆکەریو خزمەتکاری بکەین. خۆ هیچ مەعلومیش نییە کە خواوەند زەرەیەك ڕوحمی خستبێتە دڵی ئەم خاینانەوە..

خانان، میران، سەرداران، پاڵەوانان ئاگادارتان دەکەمەوە. ئەم دزە ئاژاوەگێڕانە ڕەحم بە داكو بابی خۆشیاندا ناکەن. خەتەرێکی گەورە هەڕەشە لە ئاسایشی وڵات دەکات. ناچار بووم فەرمانی ئەم ئەنجوومەنی تەگبیرکردنە دەربکەم. نووکە تەگبیرمان چییە؟ ئایا ئەم هەموو نەجیبزادەو خانە بەڕێزو پاڵەوانو سەردارە ناودارانە دەرەقەتی مەیتەرێکی بەرەڵڵا نایەن؟

خودکار قسەی تەواو کردو لە سەر تەختە بە جەواهیر نەخشێنراوەکەی ڕۆنیشت. ئامادەبووانی مەجلیسەکە چەپڵەیان لێداو هاواریان کرد: بژی خودکار، زامنی ئەمنو ئاسایشی وڵات!...مردن بۆ ئاژاوەگێڕانی چنلی بل!

هاواری دانیشتوانی مەجلیسەکە دیوارەکانی دەلەرزاند. خودکار بە حەرەکەتی دەستو سەر وەڵامی خانانو سەردارەکانی دەدایەوە. پاش ئەوەی دەنگەکان نیشتنەوە، گفتوگۆ دەستی پێکرد.

یەکێك گوتی:– ئەگەر پارەیەکی زۆر بدەینە کوێر ئۆغڵی دەست لە رێگری هەڵدەگرێ.

یەکێکی دی گوتی:– ئەو موڵکانەی دەورو بەری چنلی بل بدەینە کوێر ئۆغڵی کە چۆنی مەیل لێیە باجو خەراج لە خەڵکی وەربگرێو ئیدی واز لە ئێمە بینێ.

یەکێکی دی دەیگوت:– یەکێك بنێرین بۆ کن کوێر ئۆغڵیو بزانین دوا قسەی چییە. هەر چەندی پارەو زەوی دەوێ بیدەینێو ئاشت ببینەوە.

حەسەن پاشاش لەم مەجلیسەدا بوو. حەسەن پاشا حاکمی توقات بوو، ئەو زەلامە بوو کە حەسەن خان لەبەر خاتری وی چاوانی عەلی کیشی لە میل دابوو. حەسەن پاشا دەستە ڕاستی خانی گەورەبوو. لە هەموو میوانداریییەکی خودکاردا حازر دەبوو، کاتێك کە خودکار کەمێك نەخۆش بایە، بەدیار سەرییەوە دادەنیشتو بە ڕاست یا بە درۆ خۆی خەمبار نیشان دەدا. فڕوفێڵی لەشکرکێشی بەڵەد بوو. هەموو ئەندامانی قۆشەن وەکو سەگ لێی دەترسانو وەکو مەڕ مل کەچی دەبوون. بە کورتی،. حەسەن پاشا لە مەجلیسەکەی خودکاردا بووو هێشتا چ قسەیەکی نەکردبوو. خودکار گوێی لە پێشنیازی هەموویان گرتو ئەنجام گوتی:– هیچ یەکێك لە پێشنیازەکانی ئەنگۆ ئاژاوەی چنلی بل ناکوژێنێتەوە. با هەنووکە گوێ بگرین بزانین حەسەن پاشا چ دەڵێ.

خانو میرەکان لە دڵی خۆیاندا کەوتنە جنێودان بە حەسەن پاشا. ئاخر خانو میرو سەرداران هەمیشە بەغیلی بە پایەو مەقامی یەکدی دەبەن. حەزدەکەن لە کن خانی گەورە لە هەموو کەسێ شیرینتربن تا بتوانن بە ئازادیو پڕکێشی پترەوە باجو خەراجان لە خەڵکی وەربگرنو باشتر عەیشو نۆش بکەن.

حەسەن پاشا ڕابوو، ئیکلامێکی کرد، عاردەکەی بەر پێی خودکاری ماچ کردو گوتی: خودکار سەلامەت بێ، من سەگی کێم تا بتوانم لە حوزووری سێبەری خوادا زار هەلێنم، بەلام هەنووکە مادامەکی ئەمری موبارەکی خودکار ئەمەیە کە منی لە کسۆکان کەمتریش قسەیەك بکەم، ناچار مل دەدەمە خەت، چونکە گوتراوە. "ئەمری خودکار فەرمانی خوایە."

حەسەن پاشا ئیکلامێکی دی کردو گوتی: – خودکار سەلامەت بێ، من کوێر ئۆغڵی چاك دەناسم. بە هیچ شتێ دانامرکێتەوە، مەگەر بە سێدارە . چاوانی بابە بێ ئەدەبەکەی لەبەر خاتری من دەرهێنران، ئێستا حەزدەکەم بەم دەستانەی خۆم کوێر ئۆغڵی خەفە بکەم. تا ئەم رێگرە بمێنێ، ئێمە ئاوێکی بە ئیسراحەت ناتوانین بخۆینەوە. پێویستە لەشکر بکەینە سەر چنلی بل. لە شکرێ کە تۆزی بەری خۆر بگرێو سەرێکی لە مەشریقو سەرێکی لە مەغریب بێ.

هەڵبەتە دیسان ئەمر، ئەمری موبارەکی خودکارەو من سەگی تۆمو جگە لە حەپە حەپ چیدیم نییە بیلێم.

حەسـەن پاشـا ئیکلامێکـی دی کـرد، عـاردی بـەر پێـی خودکـاری مـاچ کـردو لـە جێـی خـۆی ڕۆنیشتەوە.

مەجلیسەکە بێدەنگ بوو. هەموو چاویان لە دەمی خودکار بوو.

ئاقیبـەت خودکـار گـوتی:- ئافـەرین حەسـەن پاشـا. ئافـەرین بـۆ هـۆش وگۆشـت بـە ڕاسـتی سەگێکی زرینگی.

حەسەن پاشا بەم ستایشە وەکو سەگانێ کە لە بەردەم خاوەنەکانیان کلکە لەقێ دەکەن تا شادیو ڕەزامەنـدی خـۆ نیشـان بـدەن، بزەیـەکی کـردو خـۆی شـادو ڕازی نوانـد. ئـەوجا خودکـار گوتی:- ئێمە چ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی لەشکر بکەینە سەر چنلی بل. لەشکری ئەمجارە دەبـێ ئەوەنـدە گـەورە بـێ، تـاوێرانی چـنلی بـل لـە ترسـناندا بێنـە لـەرزین. حەسـەن پاشـا لـەم سەعاتەوە سەرپشکی کە چۆنت بە چاك زانی سەربازگیری بکەو ئامادەی حەملەبە. تۆ دەبی بە سەرداری گشت قوشەن. تەدارەکی حەملە ببینەو دوای ئاژاوەگێڕانی زۆزان ببرەوە. ئەگەر کوێر ئۆغلێت کوشت، دەتکەم بە جێداری خۆم.

خانی گەورە پاشان ڕووی کردە مەجلیسەکەو گوتی: ئامادەبووان ئەوە ئیدی خەبەرداربن کە لـەم سـاتانە بـە دواوە حەسـەن پاشـا سـەرداری گشـتی قۆشـەنەو دەسـەڵاتی تـەواوی هەیـە. هـەر کەسێك سەرپێچی لە فرمانەکانی ئەو بکات ئەوا سێدارە دەستی ماچ دەکات.

ئامادەبووان نەیازانی چ بلێن. دڵیان پڕ بوو بوو لە کینەو حەسوودی.

***

حەسـەن پاشا لـە مەجلیسـەکەی خودکـار وەدەرکـەوتو یـەك ڕێ بـەرەو توقـات چـووو کەوتـە سـەربازگیری. لـە کـاتی سـەربازگیریدا لەگـەڵ پاڵـەوانانو سـەردارانی ژێـر دەسـتی خۆیـدا شـورای جـەنگی بـەرپا دەکـرد تـا نەخشـەی پـەلاماردانی چـنلی بـل بکێشـن. لـە یـەکێك لـەم شـورایانەدا "مورتوز"ی مەیتـەر کە پاڵـەوانێکی گـەورە بـوو، بە حەسـەن پاشای گوت:- پاشا سـەلامەت بـێ، ئێمـە خـاکی بـەر پێـی تـۆو خودکـارینو دەزانـین کـە فـەرمانی ئێـوە، فـەرمانی خوایـەو هـیچ کـەس هەقی نییە سەرپێچی لە فەرمانی ئێوە بکات، بەڵام ئەمەش هەیە کە تا کوێر ئۆغڵی بەسەر پشتی قیراتـەوە بـێ، ئەگـەر هـەموو دنیـا کۆببنـەوە، ناتوانن موویـەك لـە سـەری ئـەو کـەم بکەنـەوە، ئەگـەر دەتـەوێ کـوێر ئۆغڵـی لـە نێـو ببـرێ دەبـێ سـەرەتا ئەسـپەکەی لـە دەسـت دەربێـنین دەنـا شـەڕکردن لەگەڵ کوێر ئۆغڵیدا بێفایدەیە.

قسەکەی مورتوزی مەیتـەر بەلای حەسەن پاشاوە ئاقڵانـە بـوو، بۆیـە گـوتی:- مورتـوز، کەسـێ دەردێ بزانـێ دەرمانەکەشـی دەزانـێ، بڵـێ بـزانم چـۆن دەتـوانین قـیرات لـە دەسـتی کـوێر ئـۆغڵی دەربێنین؟ مورتوزی مەیتەر گوتی: پاشا سەلامەت بێ، قیرات بە پـارە نایەتـە کڕین، دەبـێ یـەکێکی لە خۆبردووو بڕوات بۆ چنلی بل یا سەری خۆی دابنێ یا قیرات بدزێو بیهێنێ.

حەسـەن پاشـا سـەیرێکی مەجلیسـەکەی کـرد. هـەموو سـەریان داخسـتبوو. ورتـە لـە کەسـەوە نـەدەهات. لـە پڕ لـە قەدەمـەی مەجلیسەکەوە کوڕێکی شرۆڵەی پێخاوسی کەچەڵ هەستایە سـەر پـێ. مەجلیسـەکە تەماشـایان کـرد. هـەمزە کەچـەڵیان ناسـییەوە. کەچـەڵ هـەمزە نـە بـابو داکـی

هەبوو نە ماڵو ژیان. کەس نەیدەزانی لە کوێ دەخواو دەخەوێ. لە هیچ مەجلیس و مزگەوتێکا جێی نەدەبووەوە، چونکە پێڵاوانی دەدزی. سەگ حسێبی بۆ دەکرا، ئەو بۆی نەدەکرا. نووکە چتۆ خۆی گەیاندبووە ئەم شورای جەنگییە! هەر خۆی دەیزانی، پێشینیان گوتویانە کەچەڵان هەزار فێڵو فەندیان هەیە.

هەمزە هاتە ناوەندی مەجلیسەکەو گوتی:- پاشا، ئەم کارە، کاری منە. لێرەدا ئیدی پاڵەوانێتیو شانو بازوو بە کەڵك نایەت، دەبێ فێڵو فەند بخرێنە کار، فەندو فێڵیش پیشەی باوو باپیری منە. ئەگەر توانیم قیرات بێنم ئەوا هێناومە. خۆ ئەگەر نەشمتوانی بیهێنمو کوێر ئۆغڵی لە قافدا گرتمی، لەمە زیاتر نابێ: با لە هەزاران کەچەڵی وڵاتدا یەکێکیان نەمێنێ.

حەسەن پاشا گوتی:- هەمزە، گەر توانیت قیرات بێنی، لە ماڵە دنیایەت دەگرم.

هەمزە گوتی:- پاشا، ماڵی دنیا بە تەنیا بە کەڵکی من نایەت.

پاشا گوتی:- دەتکەم بە هەمزە بەگ. پایەو مەقامی بەگێتیت دەدەمێ.

هەمزە گوتی:- نەء ، پاشا. ئەمەش بە تەنیا گرێی کاری من ناکاتەوە.

پاشا گوتی:- دەتکەم بە کوڕی خۆم.

هەمزە گوتی:- نەء ، ئەم مەجلیسەت بە قوربان بێ! من هیچ یەکێك لە مانەم بە تەنیا ناوێتو تۆش هەرسێکیانم بەسەریەکەوە نادەیتێ. با شتێکت لێ داوا بکەم کە بۆ من لە هەرسێکیان بە نرختر بێ و بۆ تۆ هەرزانتر.

حەسەن پاشا گوتی:- بڵێ بزانم چیت دەوێ؟

هەمزە گوتی:- پاشا، من کیژەکەتم دەوێ.

حەسەن پاشا بەم قسەیە تووڕە بوو، مستێکی بە دەسکی کورسییەکەدا کێشاو نەڕاندی:- ئەم گەوجە بەرەڵڵایە وەدەرنێن. بابایەکی کەچەڵ دەیەوێ ببێ بە زاوای من..

ئەگەر مورتوزی مەیتەر، فریای کەچەڵە نەکەوتبایە، جەلادان هەر ئەو دەقەیە پارچە پارچەیان دەکرد. مورتوزی مەیتەر بەردەمی جەلادەکانی گرتو بە حەسەن پاشای گوت:- بە قوربانت بم پاشا چما فەرمانەکەی خانمی گەورەت فەرامۆش کردووە کە:- دەبێ هەر چۆنێ بووە کوێر ئۆغڵی لە ناو بەرین؟

حەسەن پاشا هێدی بۆوە، لەبەر خۆوە تێفکری، سەیری کرد چ چارێکی نییە جگە لەوەی کە دەبێ کەچەڵ هەمزە ڕازی بکات. لەبەر ئەمە بە هەمزەی گوت: ئاخر گێلە پیاو تۆ چت لەم کیژە دیتوە کە لە هەموو شتێ بە نرختری دەزانی؟

هەمزە گوتی:- پاشا، خۆت دەزانی کەچەڵان بە فەندو فێڵن. منیش ئیدی حیسابو کیتابێکی خۆم دەکەم. من دەزانم تۆ نایەی ئەم سێ شتەم وێکرا بدەیتێ. یانی هەم سەروەتو سامانم بدەیتێ، هەم مەقامی بەگێتیم بدەیتێو هەم بمکەیت بە کوڕی خۆت، بەڵام ئەگەر کچەکەت بخوازم، دەبم بە زاوات. زاواش وەکو کوڕی خەزورە. ئەوجا سەروەتو سامانو مەقام خۆبەخۆ دێن.

هەموو مەجلیسەکە ستایشی هۆشو بیری هەمزەیان کرد.

حەسەن پاشا لە فکران ڕاچوو، حەزی نەدەکرد کچەکەی بداتە هەمزە کەچەڵ و لەلایەکی دییەوە بیری کردەوە کە ئەگەر قیرات بە دەست بێت، کوێر ئۆغڵی بە سەرو ماڵەوە تیا دەچێ و ئەم دەبێ بە جێدارو ڕاوێژکاری خان. بۆیە گوتی:- هەمزە. قایلم.

هەمزە گوتی:- نەء پاشا. بەم جۆرە نابێ، ئەو زەحمەتە بکێشەو قەولنامەیەك بنووسەو ژێرەکەی ئیمزا بکەو بمدەیە با بیخەمە تەنکەی باخەڵم، ئەوجا ماوەیەك دیاری بکەو، ئەگەر تا ئاخری ماوەکە قیراتم هێنا ئەوا کچەکەتم بدەیەو ئەگەر نەم هێنا ئەوا فەرمان دەربکە کە لە ملم بدەن.

حەسەن پاشا ناچار قەولنامەیەکی دوو دێری نووسی، ژێرەکەی ئیمزاکردو دایە دەست کەچەڵ هەمزەوەو ماوەی دیاری کرد. کەچەڵ هەمزە کاغەزەکەی وەرگرت، قەد و نوشتی کرد، خستییە گیرفانەکەی بەر باخەڵی و بە سنجاقێکی گەورە گیرفانەکەی بەست و گوتی:- پاشا هەنووکە من مەرەخەس دەبم.

* * *

هەنووکە حەسەن پاشا و مەجلیسەکەی بەو حاڵەوە بەجێ دێڵین تا تەدارەکی لەشکرو پەلاماردانی چنلی بل ببینن و دەچین بە دوای کەچەڵ هەمزەدا.

کەچەڵە پێڵاوەکانی لە پێ کرد، زەنگاڵەکانی توند لە لاقی پێچا، هەندێ نانی خستە توێشەبەرەیەکەوەولە پشتی بەست و گۆپاڵێکی بەدەستەوە گرت و کەوتەڕێ. شەوو ڕۆژ هەر ڕۆیی، قۆناغ بە قۆناغ ڕۆیی، لە سێبەری دەوەناندا سووکە پشووی دا، بە کێواندا هەڵگەڕاو داگەڕا تا دەمەو عەسرانێك گەییە قەراخ چنلی بل.

کوێر ئۆغڵی لەسەر تاوێرێکی گەورە وەستابوو. چاوی بڕی بووە ڕێگای کاروانەکان، سەیری کرد زەلامێك ڕووی کردۆتە چنلی بل و بە چوار چنگۆڵە بە چیادا دێت. کوێر ئۆغڵی چاوەڕوانی کرد تا کەچەڵ هەمزە گەییە بن تاوێرە بەردەکەو دەستی بە سەرکەوتن کرد.

کوێر ئۆغڵی لە تاوێرەکە هاتە خوارێ و پێشی لە کەچەڵ هەمزە گرت و گوتی: نەجوڵێی! بڵێ بزانم تۆ کێی؟ لە کێوە دێی و کێوە دەچی؟

هەمزە لەپڕ سەری هەڵبڕی و سەیری کرد لاوێکی بە سام لە بەردەمیا وەستاوە، پیاو ناوێری سەیری ناو چاوی بکات. چاوەکانی پڕکینە، سمێڵەکانی وەکو شاخی بەرانان. ئامادەی شەڕە قۆچ بوون. شمشێرێکی بەقەدەوە بوو پیاو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەم شمشێرە هەرگیز کۆ لە ڕشتنی خوێنی خانان و دوژمنانی خەڵکی ناکاتەوە. سەیرکە چتۆ لە نێو کیفەکەی دا هەست بە تەنگە نەفەسی دەکات! دەڵێی پۆڵاکەیان بە کینە زاخاو داوە! دەتگوت شمشێرەکەی کوێر ئۆغڵی هەمیشە پێی دەگوتیت. "ئەی کینە، تۆش وەکو خۆشەویستی موقەدەسی! ئێمە ناتوانین خۆشەویستی خۆمان بۆ خەڵکی بسەلمێنین ئەگەر ڕکەبەرایەتی دوژمنی خەڵکی نەکەین. تۆ بە ڕشتنی خوێنی زاڵمان، خۆشەویستی بۆ چەوساوان دەسەلمێنی".

کەچەڵ هەمزە دەست بەجێ کوێر ئۆغڵی ناسی، بەڵام خۆی لە گێلی داو بە فێڵ گوتی: بە دووی کوێر ئۆغڵیدا دەگەڕێم.

کوێر ئۆغڵی پرسی:- کوێر ئۆغڵیت بۆچییە؟

هەمزە گوتی:- دەردو بەڵات لە گیانم! مـن ئەسپەوانم. شەوو ڕۆژانم لە نۆکەری خانان و پاشایان بەفیڕۆ داوە. ئەوەندەم ئاو لە گۆلاوی پڕ قورباقە خواردۆتەوە هەموو دەم و لێوم بووە بە تامێسکە..بریا دایکم لە بری من سەگێکی ڕەشی دەبوو و منی گیرۆدەی ئەم مەینەتییە نەدەکرد. چونکە کەچەڵم، ناتوانم لە هیچ شوێنێ بەند ببم، هەرچەندی خزمەتیان دەکەم و ڕەنجیان بۆ دەکێشم، هەرکە پێم دەحەسن کە کەچەڵم وەدەرم دەنێن. ئیدی بە دەست ئەم سەرە کەچەڵەوە ئەم دنیا بەر بڵاوەم لێ هاتۆتەوە یەك. ئیدی نازانم چ هەشێ بەسەری خۆمدا بکەم. هەنووکە هاتووم کوێر ئۆغڵی ببینم، بە قوربانی ئەو پێیانەی بم، بیستوومە کە گوایە ئەوەندە مەردو جوامێرە بێ خەڵکی پاروە نانێك ناخوات. ئیدی هاتووم یا ڕێم بدات پاشماوەی خوانەکەی بخۆم و لە پەنا بەردێکا ئەم ڕۆژانەی دوا دوایی تەمەنم بگوزەرێنم، یا سەرم لە جەستە جوێ بکاتەوەو بۆ هەمیشە لە خەم و پەژارە رزگار ببم. ئەم سەرە نەگبەتە هەر بۆ نەمان باشە. بە قوربانی پێی کوێر ئۆغڵی بم.

کەچەڵ هەمزە قسەکانی تەواو کردو کەوتە گریان و فرمێسك ڕشتن. هێندە بە کوڵ دەگریاو ئەسرینی هەڵدەڕشت کە کوێر ئۆغڵی دڵی بە حاڵی سووتاو گوتی:- هەستە با بڕۆین! من کوێر ئۆغڵیم.

هەمزە هەرکە گوێی لەم قسەیە بوو، خۆی خستە سەر پێی کوێر ئۆغڵی و گوتی: بە قوربانت بم کوێر ئۆغڵی پەنام هێناوەتە بەر دەرکەی تۆو دەرم مەکە! بەزەییەکت پێمدا بێتەوە!.

کوێر ئۆغڵی، هەمزەی هەستاندەوەو گوتی: هەستە، ئاخر تۆ پیاوی! پیاو نابێ بۆ پارووە نانێك بکەوێتە سەر پێی کەس.

کەچەڵ هەمزە هەستا، کوێر ئۆغڵی گوتی:- ئێ، بلێ بزانم چ کارێکت پێدەکرێ؟

هەمزە گوتی:- من بە قوربانی تۆ بم کوێر ئۆغڵی، من دەزانم کە تۆ ناتوانی بەم سەرە کەچەڵەوە بمکەی بە کەبابچی و شەرابداری خۆت. هەر ئەوەندە ئەسپێکم بدەیە بۆت پەروەردە بکەم، هیچی دیم ناوێ. باب و باپیرەمیش هەر ئەمە پیشەیان بووە.

کوێر ئۆغڵی دەستی کەچەڵ هەمزەی گرت و لەگەڵ خۆیدا هێنایە کن ئەسپەکانی.

دۆستەکان گوتیان:- کوێر ئۆغڵی ئەمەت لە کوێ دۆزیوەتەوە؟ وا چاکە هەرچییەکی دەوێ بیدەیێ و بڕوات، باش نیە لە چنلی بلدا بمێنێ.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- ئەدی لە بیرتان چۆوە ئێمە لە پێناوی ئەم مرۆڤانەدا، لە پێناوی ئەم کڵۆڵانەدا دەجەنگین؟ ئێمە بۆچی لە چنلی بلدا خڕبوینەتەوە؟ دەمەوێ وەڵامی ئەمەم بدەنەوە. دەلی حەسەن یەکێك لە یاوەرەکانی بوو، گوتی:- کوێر ئۆغڵی بە ڕاستی ئینسانی حەقیقی تۆیت، کینەی لە بن نەهاتوو لە تەك خۆشەویستی لە بن نەهاتوودا لە کانگای دڵ و گیانتدا ڕیشەی داکوتاوە. کە یەکێك دەبینی پێویستی بە خۆشەویستی و دڵسۆزییە ئامادەی واز لە هەموو شتێکی خۆت بێنی وبەوی ببەخشیت.کاتێ کە ڕووبەڕووی دژمن دەبیتەوە ئامادەی

دەستبەرداری هەموو خۆشەویستتیەکی خۆت ببیت تا بە هەموو تواناتەوە ڕق و کینەی بەسەردا بڕێژی و خوێنی بڕێژی....

ژنانی چنلی بل لە هەموو لایەکەوە هاتبوون و گوێیان بۆ گفتوگۆکە ڕادەدێرا. نیگار خانمی ژنی کوێر ئۆغڵی، پیاوو ژنەکانی دایە لاوەوەو هاتە ناوەندی دانیشتوانەکان و ڕووی کردە دەلی حەسەن و گوتی:- تۆ ڕاست دەکەی دەلی حەسەن، بەلآم ئەمجارەیان پێ دەچێ کوێر ئۆغڵی خۆشەویستی و دڵسۆزی بێهودە بکات. بەچییا مەعلومە کە ئەم پیاوە جاسوسی حەسەن پاشا نەبێ؟

کەس قسەی نەکرد. کوێر ئۆغڵی کە دیتی هەموویان لایەنی نیگاریان گرت. گوتی:- ئەم بەلەنگازە گەر سەراپا ئاگریش بێ ناتوانێ بەر پێی خۆشی بسووتێنێ. وا چاکە وازی لێ بێنین لە چنلی بلدا وەمێنێ و دوا ڕۆژەکانی تەمەنی بەبێ قرەو برە بەسەر بەرێ.

کەچەڵ هەمزە لە چنلی بلدا مایەوە. نانی دەخواردو ئەو کارانەی ئەنجام دەدا کە یاوەران پێیان دەگوت. کارەکانی ئەوەندە بەچاپکی و بە چاکی جێبەجێ دەکردن کە زوو بە زوو ڕێزی هەمووانی بە دەست هێنا. چنلی بل شوێنێ نەبوو کە ڕێزی ئینسانی تێدا بە جل و بەرگ و دەوڵەتەوە بێ. ئەسڵەن لێرەدا کەس سەروەتی نەبوو. ئەوەی هەبوو سەروەتی هەموویان بوو. هەموویان کاریان دەکرد، هەموو شەڕیان دەکرد، هەموو دەیان خوارد و لە کاتی خۆیدا مەجلیسی شەراب و سازو سەماو ئاوازیان بەرپا دەکرد.

کوێر ئۆغڵی کە زرینگی و وریایی کەچەڵ هەمزەی بینی، بارگینە قۆترێکی دایە دەست. ئەم بارگینە ئەوەندە ڕەتابوو، پێستی بە سەر ئێسقانییەوە وشك بوو بوو.

کەچەڵ هەمزە کەوتە خزمەت و تیمارکردنی بارگینەکە، جا چ خزمەتێ! ئێوارەو بەیانی تیماری دەکرد و بە دڵ و بە گیان خزمەتی دەکرد. هەندێجار جۆو ئالیکی ئەسپەکانی دیشی بۆ ئەو دەدزی. پیرە بارگین هەر دەیخوارد و دەیخوارد، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگی هەڵدەهێنا، بە جۆرێ کە لە ماوەیەکی کورتا تەواو قەڵەو بووو ئامادەی کاربوو.

ڕۆژێ کوێر ئۆغڵی سەرێکی تەویلکەی داو، کە چاوی بە پیرە بارگینە کەوت هەوەڵجار نەیناسییەوە، پاشان کە ناسییەوە سەرسام بوو.

گوتی:- هەمزە قەت باوەڕم نەدەکرد، ئەوەندە، شارەزای ئەسپ بەخێوکردن بیت.

هەمزە گوتی:- من بە قوربانی تۆ بم کوێر ئۆغڵی. من هەرکە چاوم کردۆتەوە خۆم لە ناو ئەم کارەدا بینیوەتەوە، باب و باپیرایشم هەر ئەمە پیشەیان بووە..

کوێر ئۆغڵی گوتی:- نازانم ئەمساڵ چۆنە دورات بڕێك لاوازو لەڕ بووە. وا چاکە بە تۆی بسپێرم، هەمزە دەبێ خزمەتێکی ئەوتۆی بکەیت کە زۆر زوو بگاتەوە ڕێزەی قیرات.

کەچەڵ هەمزە بەم قسەیە ئەوەندە شاد بوو هەر مەپرسە. ئەمڕۆکە دورات دەدەنە دەستی ئەو، بێگومان سبەی نۆرەی قیراتیش دێت.

یاوەرانی کوێر ئۆغڵی، لە ژن و پیاو، کەسیان رازی نەبوون کە دورات بدرێتە دەست هەمزە، بەڵام هەمزە بە جۆرێ جێی خۆی لە دڵی کوێر ئۆغڵیدا کردبۆوە کە کوێر ئۆغڵی بچووکترین گومانی لێی نەبوو.

دورات و قیرات پێکەوە لە تەویلەدا بوون. هەردوو ئەسپەکە پێوەندیان لە پێدا بوو بە کلیلی جیاوازەوە، هەریەکەیان زنجیرێکی لە ملدا بوو، زنجیرەکانیان بە دیواری تەویلەکەوە دا کوترابوون.. هیچ پاڵەوانێك نەیدەتوانی بچێتە کن ئەسپەکان، خۆ ئەگەر بە رێکەوت چوباش بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی ئەسپەکان بکاتەوەو بیانباتە دەرێ. کلیلەکان لەلای خودی کوێر ئۆغڵی بوون.

کوێر ئۆغڵی هەمزەی برد و دوراتی دایە دەستی. هەمزە زۆری هەوڵ لەگەڵ تیمارکردنی ئەسپەکەدا دا، بەڵام وەختێ ئەسپەکە کەوتە بوژانەوە و رەنگ هەڵهێنان، کەچەڵ هەمزە جۆ و ئالیکەکەی لێ کەم کردەوە. ئەسپەکە بەرە بەرە لەڕ دەبوو. کوێر ئۆغڵی لە هەمزەی پرسی:- ئاخر هەمزە بۆ دورات رۆژ بە رۆژ لەڕتر دەبێ؟ ناشێت باش خزمەتی نەکەیت؟

کەچەڵ هەمزە گوتی:- من ئەوەی لە دەستم بێ دریغی ناکەم. بەڵام پێموایە دورات پێویستی بە هەوای ئازاد هەیە. ئاخر کوێر ئۆغڵی ئەم حەیوانە بەستەزمانە شەو و رۆژ لەم تەویلەیەدایە. پێ و گەردنیشی لە زنجیردایە. بێگومان هەر ئەمە سەرچاوەی لەڕ بوونەکەیەتی.

کوێر ئۆغڵی کلیلی پێوەندەکەی دوراتی دەرهێنا و دایە دەست هەمزە تا جار جارێ ئەسپەکە بێنێتە دەرێ و هەوای ئازاد لێی بدات.

دیسان یاوەرەکانی ئیعترازیان گرت کە پیاو نابێ باوەڕ بە هەموو کەسێك بکات، ئەگەر کەچەڵ هەمزە دورات بەرێ و ڕابکات، چ کارێ بکەن.

کوێر ئۆغڵی هەمدیس ژنان و پیاوانی کڕکردەوە و گوتی:- چتان خەم نەبێ و شتی وا نابێت.

کەچەڵ هەمزە کارێکی وایکرد کە دورات بە چەند رۆژێك چۆیەوە تۆغیانی جارانی.

رۆژان بە خێرایی تێدەپەڕین و هەمزە دەترسا نەتوانێ لە کاتی خۆیدا قیرات بگەیەنێتە حەسەن پاشا. ماوەکەش لە تەواو بووندا بوو.

پاش ماوەیەك بیرکردنەوە و خەیاڵ و گومان و نیگەرانی، ئاخری شەوێ بەخۆی گوت:- من ئەگەر ساڵێك ودوو ساڵیش لێرە بمێنمەوە، کوێر ئۆغڵی هەرگیز کلیلی پێوەندەکەی قیراتم ناداتێ. خۆ لە ناوچەی توقاتدا کەس نییە فەرقی دورات و قیرات بکات. وا چاکە هەر ئەمشەو دورات بەرم و بیدەمە دەستی حەسەن پاشا و بلێم ئەمە قیراتە. ئەوجاش کیژی پاشا بگوازمەوە و چەند رۆژێ عەیش و نۆش بکەم و خەمی دنیا لە بیر بکەم. تا کەی پاشماوەی خوانی هەموو کەس و ناکەسێك بخۆم و روو لە هەر کوێیەك بکەم و وەدەرم نێن؟ کە کیژی پاشا بوو بە ژنم ئیدی کەس ناتوانێ خراپ سەیرم بکات، ئیدی کەس ناوێرێ پێم بڵێ کەچەڵ هەمزە. دەبم بە هەمزە بەگ! دەبم بە زاوای پاشا. زاوای پاشا مەیلی لەچی بێ دەتوانێ بیکات. ئەوساکە تۆڵەی هەر هەموو شەوانی برسێتی و دەربەدەریم دەکەمەوە. بۆ خۆم لە هاوینە هەوارەکاندا کۆشکێك دروست دەکەم، کەنیزو کارەکەری زۆرم دەبن، پارە بە لێشاو خەرج دەکەم، شەرابی چاك

دەخۆمەوە، کەباب و گۆشت و قەل دەخۆم و، جلی پۆشتەو پەرداخ و چاك لەبەر دەکەم، ڕاوگەو جیێ ڕاوی تایبەتیم دەبیێ، مەیتەرو دەرگاوان و.. وم.. دەبن!.. ئاخ، خوایە!.. خەریکە لە خۆشیاندا شێت دەبم!..

کەچەڵ هەمزە بەدەم ئەم بیرانەوە ئامادەی ڕۆیشتن دەبوو. دوراتی زین کرد و سوار بوو، کەوتە ڕێ و وەکو با لە چنلی بل دوورکەوتەوە.

بەیانی دەلی حەسەن هات سەری ئەسپەکان بدات، سەیری کرد نە دورات لە جێی خۆیەتی و نە کەچەڵ هەمزە دیارە. یەکسەر زانی کە کار لە کار ترازاوە. بە ڕق و هاوارەوە چووە دیار سەری کوێر ئۆغلی و بێداری کردەوە و گوتی:– ڕابە، ئیدی کاتی خەو نییە. کەچەڵ هەمزە دووراتی بردووە!..

لە چنلی بلدا مقۆ مقۆ پەیدا بوو. یاوەران لە ژن و پیاو دەستیان کرد بە سەرزەنشتی کوێر ئۆغلی کە: ئەدی پێمان نەگوتیت نابیێ متمانە بە هەموو کەسێك بکریێ؟ فەرق ناکات ئەسپی پالەوان ببەن یا ژنی. هەردووکیان هەر ناموسن. تا ئێستا باڵندە نەیتوانیوە لە ترسی ئێمە بە ئاسمانی چنلی بلدا بفڕیێ. کە ناوی کوێر ئۆغلی و چنلی بل و یاوەران دەهات، خانان و پاشایان و خانی گەورە وەکو بی دەلەرزین، بەلاّم هەنووکە سەیرکە بزانە کاری ئێمە گەییوەتە کویێ! بابایەکی کەچەڵی بیێ ناوونیشان هاتووەو ئەسپی لیێ دزیوین. هاکا ئەمڕۆ و سبەی هەواڵ بگاتە هەموو شوێنێك و دوژمنان لە هەموو لایەکەوە پەلامارمان بدەن. کوێر ئۆغلی تۆ بە دەستی خۆت کارێکی وەهات کرد کە ئەگەر هەموو دنیا دەستیان تێکەڵ بکردایە نەیاندەتوانی ئەم کارە بکەن. ئێستا بڵیێ بزانین دورات لە کویێ پەیدا دەکەیتەوە؟

کوێر ئۆغلی گوتی:– ئەگەر دورات نەماوە، خۆ قیرات ماوە و سواری دەبم و دەڕۆم و دورات دەدۆزمەوە. بەس سەرزەنشتم بکەن.

نیگارخانم هاتە پێشی و گوتی:– بۆ سەرزەنشتت نەکەین؟ تۆ یاسای چنلی بلت شکاندووە. ئەدی تۆ خۆت بە ئێمەت نەگوت نابیێ بکەوینە ژێر کاریگەری سۆزو بەزەیی و خۆشەویستیی نابەجێی خۆمانەوە؟ ئەدی خۆت نەت دەگوت هەندێجار خۆشەویستی و سۆزی نابەجیێ دەبێتە مایەی هەزاران خیانەت و تووش بوون؟ تۆ بە هۆی بەزەیی نابەجێی خۆتەوە ڕێت خۆشکرد کە خیانەتکاران پیێ بنێنە خاکی چنلی بلەوە. تۆ چوزانی ئەو جاسوسە لە کوێوە هاتبووو دوراتی بۆ کویێ بردووە کە دەلێی بە دوویدا دەچیت و ئەسپەکە دێنیتەوە؟ دورات ڕۆیی و هەنووکە دەبیێ چاوەڕێی حەملەی دوژمنان بکەین... دیواری پۆلاّیینی چنلی بل درزی تێکەوتووەو ئەم کارە دوژمنانمان خۆشحاڵ دەکات و ئازاتریان دەکات...

کوێر ئۆغلی یەکجار تووڕە بوو، بەلاّم کە دەیزانی خۆی گوناهبارە ،چ قسەیەکی نەدەکرد و تەنیا لە داخانا سمێڵەکانی دەجووو جینگڵی دەدا. لە پڕ هەستایە سەر پیێ و رووی کردە ئیوازو لە نەعرەتەی دا. ئیواز، شەرابم بدەیە!

ئیوازی پاڵەوان شەرابی هێنا. کوێر ئۆغلی حەوت کاسە شەرابی دوا بە دوای یەك خواردەوە. پاشان رووی کردە دەلیی مەیتەرو هاواری کرد. ئەسپەکە زین بکە!

قیراتیان زین کردو هێنایانە پێشێ. کوێر ئۆغڵی دەتگوت لاڵ بوو بوو. لات کەلامی نەدەکرد. دەموچاوی بەجۆرێ سوور هەڵگەڕا بوو بنیادەم وای هەست دەکرد هەر ئێستا گڕ دەگرێ. قیرات هەرکە کوێر ئۆغڵی بەسەر پشتی خۆیەوە بینی، حیرس و تووڕەیی ئەویشی گرتەوە. سمکۆڵانێکی کردو گەردو تۆزێکی ئەوتۆی هەستاند کە کوێر ئۆغڵی لەبەر چاو دیار نەما. ئەوسا کوێر ئۆغڵی نەعرەتەیەکی کێشا، نەعرەتەیەکی ئەوتۆ کە ئەگەر لە مەیدانی شەڕدا بوایە قۆشەن هەتڕەشی دەچووو چەکی دەستی دەکەوت. قیرات لە وەڵامی ئەم نەعرەتەیدا هەستایە سەر پاشوو، یاڵ و گەردنی بەرز بوونەوە، بە جۆرێ حیلاندی کە تاوێری سەر شاخەکان هاتنە لەرزین و کەوتن، دەنگێ لە هەموو لایەکی چنلی بلەوە دەنگی دایەوە، دەتگوت سەدو یەك ئەسپ پێکەوە دەحیلێنن. ئەوساکە ئەسپ وسوارەکەی بە نێو گەردەلوولدا لە زۆزانەوە دەرچوون.

پاش تۆزی یاوەرانی چنلی بل لەسەر تاوێری نیگابانییەوە، لە ناو جەرگەی دەشتەکەدا، پەڵەیەکی سپییان بینی کە وەکو تێسکەی تفەنگ دەڕۆیی و خەتێکی سپی لە پاش خۆیەوە بەجێ دەهێشت.

* * *

کەچەڵ هەمزە لە ترسی گیانی خۆی لە هیچ شوێنێ نەوەستا. ئەسپەکەی داژۆت و دەڕۆیی. جار جاریش ئاوڕی دەدایەوەو پتر ئەسپەکەی تاو دەدا. زۆری نەمابوو بگاتە چل ئاشان، دیسان ئاوڕی دایەوە، لە دوورەوە تەپوتۆزێکی بەدی کرد، دەتگوت خاك دەبێ بە تۆزو دەچێت بە حەوادا، کە وورد بۆوە، سەیری کرد کوێر ئۆغڵییەو بە سواری قیرات وەکو با دێت و کۆ لە هیچ هەورازو نشێوێ، ناکاتەوە. بەجۆرێ دێت کە ئەگەر بکەوێ هەپرون بە هەپرون دەبێ.

کەچەڵ هەمزە دەمی وشك بوو، زمانی لەگۆ کەوت، هەستی کرد دەمێکە مردووەو خراوەتە گۆڕەوە. ئیدی هیچی بۆ نەکرا ئەوە نەبێ کە خێراتر خۆی گەیاندە بەر دەرکی ئاشەکە، دابەزی، جڵەوەکەی دوراتی بە دیرەکی بەر دەرگای ئاشەکەوە بەست، بە پەلە ئاشەوانەکەی گازکرد. ئەهای ئاشەوان خێرا وەرە دەرێ بەدبەخت! ئەجەلت گەییوەتە بەردەرگا..

ئاشەوانەکە دەم و دەست هاتە بەر دەرگا، بەڵام توانای ئەوەی نەبوو خۆی لەسەر لاقان رابگرێ. بە نیگەرانی و ترسەوە پرسی:– چی بووە برادەر؟ چیت لە منی پیرەمێرد دەوێ؟

هەمزە گوتی:– من هیچم ناوێ، تەماشا بکە، ئەوەی وادێت ئەوە کوێر ئۆغڵییە. لە چنلی بلەوە دێت. رەوە ئەسپەکەی گڕۆی بووە. هیچ دەواو دەرمانێ نەخۆشی ئەسپەکانی چاك نەکردۆتەوە. ئاخری حەکیمەکان پێیان گوتووە کە مێشکی ئاشەوان دەوای ئەم دەردەیە. هەنووکە کوێر ئۆغڵی بە دووی مێشکی ئاشەواندا دەگەڕێ تا ئەسپەکانی چاك ببنەوە، ئەگینا بەبێ ئەسپان ناتوانن لەگەڵ خان و پاشایاندا شەڕ بکەن. حەسەن پاشا منی ناردووە تا ئاشەوانەکان ئاگاداربکەمەوەو فریای خۆیان بکەون. چما نەت بیستووە کە حەسەن پاشا بە تەمایە لەشکر بکاتە سەر چنلی بل؟

ئاشەوانەکە توانای قسەکردنی نەبوو. ئەنجام گوتی:– با بیستوومە، بەڵام هەنووکە تۆ دەڵێی چ قوڕێ بەسەر خۆدا بکەم؟ حەوت هەشت نانخۆری سەرو پێچکەم بە ملەوەیە. بۆ کوێ هەڵێم؟

کەچەڵ هەمزە گوتی:- خێرا خۆت رووت بکەرەوەو جلەکانی من لەبەر بکەو بچۆ ژێر ئاشەکەوە. من تەگبیرێکی کوێر ئۆغلی دەکەم. ئەگەر نەشم توانی ئەوا با من بکوژێت، تۆ ژن و منداڵت هەن، دڵم نایەت حەوت هەشت سەر خێزان هەتیو بکەون. من بابایەکی بێ کەسم، لە ژیان تێر بووم. ئاشەوانەکە دەم و دەست جلەکانی خۆی داکەندو جلەکانی کەچەڵەی لەبەر کرد و چوو لە ژێر ئاشەکە خۆی شاردەوە. کەچەڵ هەمزەش دەم و دەست جلەکانی کابرای ئاشەوانی لەبەر کرد و لە پڕ خۆی لە ئارد وەرداو دەموچاوی خۆی سپی کرد.

کوت و پڕ کوێر ئۆغلی وەکو ئەجەل گەییە بەر دەرکی ئاشەکەو لە نەعرەتەی دا:- ئەهای ئاشەوان، خێرا وەرە دەرێ!

کەچەڵ هەمزە بە جلی ئاشەوانییەوە هاتە دەرێ و گوتی: لەگەڵ منت بوو؟ فەرموو لە خزمەتت دام.

کوێر ئۆغلی گوتی:- ئەو ئەسپ سوارەی کە هەنووکە بەر لەمن هاتە ئێرە چی لێهات؟

کەچەڵ هەمزە گوتی:- لە ژێر ئاشەکەدا خۆی شاردۆتەوە، نازانم چی کردووە، هەرکە تۆی بینی رەنگی زەرد هەڵگەڕاو چوو خۆی تەپاندە ژێر ئاشەکەوە، بە منیشی گوت کە شوێنەکەی بە کەس نەڵێم.

کوێر ئۆغلی خۆی هەڵدایە خوارەوەو گوتی:- تۆ جڵەوی ئەسپەکەم بۆ بگرە. بەخۆم دەزانم چی بەسەر دێنم.

ئەوسا جلەوەکەی قیراتی دایە دەست کەچەڵ هەمزەو خۆی چووە ژوورەوە. ئەوجا دانەوییەوەو گوتی:- وەرە دەرێ هەمزە!

ئاشەوانەکە پتر چووە ژێر ئاشەکەوەو گوتی:- بۆ بێمە دەرێ؟ من ئەو مێشکەم نییە کە گەڕی ئەسپەکانت چاك دەکاتەوە.. واچاکە لێرە بمرم و نەیەمە دەرێ.

کوێر ئۆغلی گوتی:- بێ برەوە گەوجە. گەڕی چی؟ مێشکی چی؟ پێت دەڵێم وەرە دەرێ و تووڕەم مەکە!

ئاشەوانەکە، پتر چووە ژێر ئاشەکەوە، کوێر ئۆغڵیش خۆی بە ژێر ئاشەکەدا کرد، دەستی گەیاندە پێی ئاشەوانەکەو رای کێشایە دەرێ، بەڵام کە چاوی پێی کەوت سەیری کرد ئەمە کەچەڵە نییە و زەلامێکی دییە. ئەوجا بۆی دەرکەوت کە کەچەڵە چ کڵاوێکی کردۆتە سەری! دەم و دەست هەستاو غاری دایە دەرێ. لە دەرێ ڕا چی ببینێ؟ سەیری کرد کەچەڵ هەمزە سواری قیرات بووەو ئامادەی حەرەکەتە. هەمزە ئەسا کە دوراتی تیمار دەکرد، سوکە ئاشنایەتێکی لەگەڵ قیراتیشدا پەیدا کردبوو، ئەمە جگە لەوەی کوێر ئۆغلی بە خۆی جڵەوەکەی قیراتی بە کەچەڵە سپاردبوو، ئیدی لەبەر ئەمە بوو کە هەمزە توانی بووی بە تۆزێ نەوازش و بە زمانی نەرم سواری قیرات ببێ. کوێر ئۆغلی ئیدی ئەرزو ئاسمانی لەبەر چاو تاریك بوو بوو. غەزەب چاوی کوێر کردبوو. ویستی شمشێرەکەی هەڵکێشێت و پەلاماری بدات، بەڵام لەپڕ بیری کەوتەوە کە قیرات هەر بجوڵێ ئیدی باڵندەش نای گرێتەوەو ئەوساکە کار لە کار دەترازێ.

لەبەر ئەمە کەمێ هێور بۆوەو بە هەمزەی گوت:- ئەهای هەمزە، زۆر خێرا هاتەو قیرات ئارەقی کردۆتەوە.، ئاخر بەو جۆرە سواری ببی نەخۆش دەکەوێت. وەرە خوارێ و کەمێك ڕای بکێشە تا ئارەقەکەی وشك بێتەوە.

هەمزە گوتی:- قەیدی نییە. پەلەم نییە. هێواش هێواش دەڕۆم، ئارەقەکەی خۆ بەخۆ هیشك دەبێتەوە.

هەمزە ئەمەی گوت و ئاوزەنگی لە ئەسپەکە دا. کوێر ئۆغڵی سەیری کرد هەمزە زۆر ناشیانە ئەسپ داژوێ، جڵەوەکەی ئەوەندە توند ڕادەکێشێت، لەوەیە لالغاوەی ئەسپەکە دابڕزێ. کوێر ئۆغڵی خۆی پێ نەگیراو گوتی:- ئاخر نمەك حەرام، نمەکم کوێرت بکات. بۆ لەبەر چاوی من حەیوانەکە ئەزیەت دەدەی؟ چما نازانی من قیراتم لە هەردووك چاوانم خۆشتر دەوێ؟ چاك هەقی ئەو نان و نمەکەت دامەوە کە دامیتێ.

هەمزە گوتی:- کوێر ئۆغڵی تۆ پاڵەوانیت. ڕێ و ڕەسمت هەیە. بە پیاوەتی و جوامێری مەنشوریت. لە مانگێ کەمتر پاشماوەی خوانەکەتم خواردووە، ئیدی بۆ بە ڕوومیا دەدەیەوە؟ لە تۆ ناوەشێتەوە.

ئەسپێك کەماڵی چییە کە ئەوەندە دەپارێیتەوە!

کوێر ئۆغڵی گوتی:- هەمزەی فێڵباز، خۆت لە گێلی مەدە. تۆ خۆت دەزانی قیرات دەکاتە چی. هەنووکە ئەگەر خان و پاشایان بزانن قیرات براوە، دەزانی چەند خۆشحاڵ دەبن؟

هەمزە گوتی:- کوێر ئۆغڵی، من دەبێ بڕۆم. ئەم قسانە بە کەڵکی من نایەن.

هەمزە ویستی بکەوێتە ڕێ. کوێر ئۆغڵی گوتی:- ئەهای هەمزە، گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم. من دەزانم تۆ قیراتت بۆ خۆت ناوێ. ڕاستم پێ بڵێ بزانم کێ ناردبووتی بۆ چنلی بل.

هەمزە گوتی:- کوێر ئۆغڵی، چاك بزانە، ئەوەی لە چنلی بلدا پێم گوتیت هەمووی ڕاست بوو. ئەمسەرە کەچەڵە دنیای ڕۆشنی لێ تاریك کردووم. چووبمە هەر شوێنێ وەکو سەگ وەدەریان ناوم. کەس حەزی نەکردووە سەیرم بکات. هەنووکە دەڕۆم و قیرات دەدەمە دەست حەسەن پاشا تا منیش ڕۆژێکی ڕۆشن ببینم و تۆڵەی خۆم لە چارەنووس بستێنم.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- تۆ خۆت ئەم بیرەت بەسەردا هات یان حەسەن پاشا ئەم ڕێیەی بۆ کێشایت؟

هەمزە گوتی:- حەسەن پاشا.

کوێر ئۆغڵی تێفکری و گوتی: تۆ پێت وایە چ کەسانێك تۆیان خستۆتە ئەم ڕۆژە ڕەشەوە؟

هەمزە گوتی:- من چوزانم. دیارە چارەنووسی من وابووە.. رەنگە خوا... من چوزانم. من تەنیا دەمەوێ تۆڵە لە چارەنووسی خۆ بستێنم.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- هەمزە، تۆش وەکو ملیۆنان هاووڵاتی ئێمە بە دەستی خەڵکانی وەکو حەسەن پاشاوە تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشە بوویت. تۆ لەبری ئەوەی شەڕیان لەگەڵ بکەی، یارمەتییان دەدەی. تۆ خیانەت لە چنلی بل، لە ملیۆنان هاووڵاتی خۆت دەکەی. قیرات بێنەو با

بگەڕێینەوە بۆ چنلی بل. تۆ پێویستە ببی بە یەکێك لە یاوەرانی چنلی بل‌و دژی حەسەن پاشا بخەبتی. تۆ لەم ڕێگایەوە دەتوانی تۆڵە بستێنی‌و لەگەڵ ملیۆنان هاوولاتیدا بگەیتە ڕۆژی ڕۆشن.

کەچەڵ هەمزە گوتی:– کوێر ئۆغڵی من ڕێگای خۆم هەڵبژاردووە. هیچ پێوەندییەکیشم بە هاوولاتیانمەوە نییە. هەرکەسەو لە خەمی خۆیدایە. ئەوا من ڕۆیشتم.

کوێر ئۆغڵی وتی:– خیانەتکار ئەسپەکەم وێدەو هەرچەندت پارە، ماڵی دنیا دەوێ لە منی وەربگرە.

کەچەڵە پێکەنی‌و گوتی:– کوێر ئۆغڵی، تۆ خۆت دنیا دیدەی، چما نازانی خوا بە خوایەتی خۆی ناتوانێ کەچەڵان بخەلەتێنێ؟

گریمان من لە ئەسپەکە دابەزیم، ئەوساکە هێندەم مەودا دەدەی تا چەندم پوڵ دەوێ وێم دەی؟ بە گیانی کوێر ئۆغڵی ناتوانم مامەڵە بکەم. ئیدی وازم لێ بێنە با بڕۆم. ڕێگام دوورە. من دەچم بۆ توقات. ئەگەر ڕاستەو کوێر ئۆغڵیت وەرەو بۆ ئەوێ‌و قیرات لە حەسەن پاشا بسێنەوە. با منیش لەم ڕێگایەوە خۆشییەکم پێ ببڕێ. ئیدی واز لە من بێنە.

کوێر ئۆغڵی گوتی:– هەمزە، ڕاوەستە با نرخی ئەسپەکەت پێ بلێم تا دەستت نەبڕن. قیرات گەلێك لە هەشتا هەزار سەرکردەو هەشتا هەزار بەرانی سپی‌و هەشتا هەزار خەزنە پوڵ زیاترە. لە هەشتا هەزار ڕەوە ئەسپ‌و هەشتا هەزار گاجووت زیاترە.

هەمزە گوتی:– کوێر ئۆغڵی، دڵنیا بە من قیرات بە ماڵی دنیا نادەم. من مەرجم لەگەڵ حەسەن پاشادا کردووە کە دوناخانمی کچە بچوکیم وێدا. ئەوا من ڕۆیشتم‌و تۆش خۆت دەزانی، ئەگەر قیراتت خۆش دەوێ بە خۆت وەرە بۆ توقات. منیش لەوێم، قەولت دەدەمێ کە یارمەتیت بدەم. خوا حافیز.

کوێر ئۆغڵی چیدی جڵەوی خۆی بۆ نەگیراو هاواری کرد:– بڕۆ هەی خاین، من کوێر ئۆغڵی نەبم ئەگەر سەرت وەکو قونە ئاروو لە لەشت جوێ نەکەمەوە. بە زمانی منەوە بە حەسەن پاشا بڵێ. من کوێر ئۆغڵی نیم گەر زمانی لە پشتی ملەوە دەر نەیەنم. نامەردم گەر ماڵەکەی نەکەمە گۆڕی. ناپیاوم گەر قیرات بە ناو خوێنی خاناندا تاو نەدەم.

هەمزە گوتی:– ئەمە خۆت‌و حەسەن پاشا دەیزانن، پێوەندی بە منەوە نییە.

هەمزە ئەمەی گوت‌و ئاوزەنگی لە ئەسپەکە داو لە چاو تروکانێکدا دیار نەما. کوێر ئۆغڵی لەبەر دەرکی ئاشەکەدا کەوت‌و هاواری کرد. ئەوجا دانیشت‌و سازەکەی بەسینگیەوە گوشی‌و بە عەزرتەوە کەوتە ساز لێدان‌و گۆرانی عاشقانەو کینە ئامێزی چڕی.

ئیستا چتۆ دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ چنلی بل‌و تەماشای یاوەرەکانی بکات؟ ئەگەر نیگار، دەلی حەسەن، دەلی مەیتەر، ئیواز، دەمیرچی‌و پاڵەوانەکانی دی بپرسن کە: چیت لە قیرات کرد، چ وەڵامێکیان بداتەوە؟

کەچەڵ هەمزە داخێکی وای بە دڵییەوە نابوو، بە ئاوی هەموو دنیا نەدەکوژایەوە. ئاش کڕو کپ‌و ئەو مات. چ تەنیاییەکی کوشندە بوو!

سازەکەی توڕدا، بە دەما کەوت و چنگی لە عاردی گیرکرد، شەو داهات، ئاشەوانەکە دەمێ بوو هەڵهاتبوو، ڕۆیشتبوو.

کوێر ئۆغڵی کاتێ چاوی هەڵێنا، سەیری کرد هەتاو تازە زەردەی داوە. یەجگار برسی بوو. دوراتیش دەمێ بوو جۆی نەخوارد بوو. لەم کاتەدا کابرایەك بە جووتێ گای بە بارەوە گەییە جێ. لە کوێر ئۆغڵی پرسی:– هاوڕێ، ئاشەوانەکە لە کوێیە؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:– ئاشەوانەکە لێرە نیە. جارێ من لێرەم.

کابرا باوەڕی نەکرد. کوێر ئۆغڵی بواری قسەکردنی نەدایێ و دەم و دەست جواڵەکانی لەسەر پشت گایەکان داگرت و بردنییە ژوورەوە.

دوو تای جۆ بوو، ئەوانەی هەڵڕشتە بەر دورات.. دووتاش گەنم بوو، لە ئاشەکەی کردن تا بیانکاتە ئارد. کابرا ویستی شتێك بڵێ، بەڵام نیگای توڕەی کوێر ئۆغڵی زمانی بەست. تا هەتاو هەندێك بەرز بۆوە، کوێر ئۆغڵی هەویری شێلا بوو نانیشی کردبوو. ئەوجا یەکێك لە گایەکانی سەربڕی، کەبابی دروست کردو دەستی بە خواردن کرد. پاش ئەوەی تێر بوو بە کابرای گوت: –

– هاپۆ، بمبوورە لەوەی کردم. چەندت پوڵ بدەمێ؟ وەرە پێشەوە، مەترسە.

کابرا زمانی چوو بووە کلیلە. کوێر ئۆغڵی نرخی گاو گەنم و جۆکەی زۆر بە زیادەوە دایێ و سواری دورات بوو و بەرەو چنلی بل کەوتە ڕێ.

* * *

دۆستانی چنلی بل، لە ژن و پیاو یەکجار نیگەرانی کوێر ئۆغڵی بوون. چاویان بڕی بووە ڕێگاکە کەی کوێر ئۆغڵی دێتەوە. لە پڕ سەیریان کرد کوێر ئۆغڵی وا دێتەوە. جڵەوی دوراتی گرتووە، سەری داخستووەو سەروچاوی وەکو ئاشەوانان سپییە. یەکسەر بۆیان دەرکەوت هەمزە لە چل ئاشاندا کڵاوی کردۆتە سەر کوێر ئۆغڵی، هەموو سەریان داخست. نە سەلامێ نە کەلامێ. کەس چاك و خۆشی لەگەڵ نەکرد.

کوێر ئۆغڵی کە گەییە جێ، ئیواز چووە پێشی و گوتی:– سەودایەکی چاکت کردووە. کوێر ئۆغڵی بڵێ بزانم چەندت سەرباقی دایێ تا دوراتت وەرگرت؟ ئاشەوانییش فێربوویت، پیرۆزە.

کوێر ئۆغڵی چەندین جار سەفەری کردبوو، بەڵام وەختێ لە سەفەر دەگەڕایەوە هەرگیز دۆستەکانی بەو ساردییە ڕوو بە ڕووی نەبوو بوونەوە. ژنان روویان لێ وەردەگێڕا و پیاوان وەڵامی سڵاویان نەدەدایەوە. لە هەموو خراتر قسە بە تەوسەکانی ئیواز بوو کە وەکو کێو قورسایی دەخستە سەر دڵی و ئازاری دەدا. کوێر ئۆغڵی لە حاڵێکی ئەوەندە پەرێشاندا بوو زۆری نەمابوو فرمێسك بە چاوانیا بێنە خوارێ، ئاخری سازەکەی هەڵگرت و ئاوازێکی خەمناکی لێدا کە ئاخر ئەنگۆ بۆ ئەوەندە مات و مەلولن؟ بۆ بە بزەیەك، بە دوو قسانی خۆش دڵم شاد ناکەن؟ ماڵی دنیا وەکو چڵکی دەستەو ئیدی ئەمە تازێ گرتنی ناوێ. بە بزەیەك شادم بکەن. مات و مەلول مەبن. ئاخر ئاورتان لێم بەردا. دڵتان کردم بە کەباب، خەمی خۆم سەرو زیادمە، ئێوە ئەوەندە خۆتان سەخڵەت مەکەن.

دۆستەکان ئەوەندە دڵیان ڕەنجابوو تەنانەت ئەم قسانەش دڵی نەرم نەکردن، چ کەسێك تەماشای کوێر ئۆغڵی نەکرد. هەندێکیان دەستیان بە ئیعتراز کرد کە:-کە قسەی ئێمە لە لای کوێر ئۆغڵی پوڵێ ناکات ئیدی بۆ لە چنلی بلدا وەمێنین. چاکتر وایە هەرکەسە بڕوات بە دوای کاری خۆیدا.

ئەم قسەیە زۆری کار لە کوێر ئۆغڵی کرد. لەلایەکەوە قیراتی لە دەست دابوو، لەلایەکی دییەوە بابایەکی کەچەڵ کڵاوی کردبووە سەری. ئێستا هەموو ئەم دەردو مەینەتییەی بەس نەبوو و دۆستەکانی کەوتنە گلەیی و گازەندە. کوێر ئۆغڵی نەیتوانی لەوەی پتر خۆی بگرێ و لە پڕ بە ڕەقی گوتی:- من کەسم بە تۆبزی گل نەداوەتەوە، کێ حەزدەکات دەتوانێ بڕوات. ئەسپەکە هی خۆم بوو، هەنووکە کە لە دەستم داوە. پێوەندی بە کەسەوە نییە.

ئەم قسەیە پاڵەوانەکانی زویر کرد. مقۆ مقۆ لە چنلی بلدا بڵاوبۆوە. لەم لاو لەو لاوە یەك دوو پاڵەوان ئامادەی ڕۆیشتن بوون.

دەلی حەسەن، تانری تانیمار، دیل بیلمز، قورخو قانماز کە لە سەرکردە ناودارەکانی کوێر ئۆغڵی بوون لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی دیدا چاویان بڕییە نیگار خانم. نیگار خانم لە نێو دۆستانی چنلی بلدا ڕێزێکی زۆری هەبوو. ئەو جگە لە جوانی و پاڵەوانێتی، زۆر کارزان و بە هۆش بوو. دۆستان هەموو بە قسەیان دەکرد.

نیگار خانم کە بینی ناکۆکی کەوتە نێو پاڵەوانەکان و لەوەیە لێکدی جودا ببنەوە، ڕابووە سەر پێ. هەموو ئەوانەی کە ئامادەی ڕۆیشتن بوون لە جێی خۆیان دانیشتنەوە. دەمیرچی ئۆغڵی، ئیواز، دەلی مهدی، چوپور سەفەرو ئەوانی دی دانیشتنەوە. نیگار ڕووی کردە هەموویان و گوتی: -چما لە بیرتان چووە کە بۆچی هاتوونەتە چنلی بل؟ ئێمە ئەم ئۆردوگایەمان بە خوێنی خۆمان بەرپا کردووەو تا تاقە یەك زۆر لێکراو لە وڵاتدا بمێنێ دەست لە خەبات هەڵناگرین. تا ژیانی خوشك و برایانەی چنلی بل لە سەرانسەری وڵاتداو بۆ هەموو مەردم نەیەتە دی، ئێمە هەقی ئەوەمان نییە لە یەکدی جودا ببینەوە. کوێر ئۆغڵی ئەگەر حەزی لێیە بە خۆی دەتوانێ بڕوات. تا گیانمان لە بەرا بێ شمشێر دانانەین، تەنیا ئەو ڕۆژە نەبێ کە گشت دوژمنانی خەڵك و هەموو مفتەخۆرەکانمان لە نێو بردبێ..

نیگار خانم قسەکانی تەواو کرد و هات لە ناوەندی هەموو سەرکردەو پاڵەوانەکان دانیشت و ڕووی لە کوێر ئۆغڵی وەرگێڕا.

زویربوون و تۆرانی نیگار خانم ئا لەم کاتەدا دڵی کوێر ئۆغڵی پڕ لە خەم و کەسەر کرد. سازەکەی هەڵگرت و بەدەم سازلێدانەوە کەوتە گازاندە لە نیگار.

ئەی نیگاری ڕندی من، ئەوە لە کێوە فێر بوویت دڵم بشکێنی؟ ئاخر بۆ وەکو ئاسکی غەزریو تەماشام دەکەی؟ خۆ تۆ تۆرانت نەدەزانی!

نیگار چ قسەیەکی نەکرد. تەنانەت سەریشی هەڵنەبڕی تا تەماشای کوێر ئۆغڵی بکات. کوێر ئوغڵی وای لێهات. خەریك بوو دەست بە گریان بکات. دووبارە سازەکەی هەڵگرت و دەستی کرد

بە گازاندەو تکاو پاڕانەوە. ئاخر بۆ رووم لێ وەردەگێڕی نیگار؟ دوو قسان بکە تا بزانم گوناحم چییە.

نیگار مۆڕەیەکی لێکردو بەرەقییەوە گوتی:- یانی تۆ وات لێهاتووە بلێی کێ حەزدەکات با بڕوات؟ قەدری زێر لەلای زەڕنگەرە. تۆ کە لە ئێستاوە دەستت کردووە بە ستایشی خۆ، ئەدی چۆن دەتەوێ فریای خەڵکی بکەوی‌و رایانکێشیتە مەیدانی خەباتەوە؟ هەڵبەتە هەر کەسێك وەکو تۆ لووت بەرزی بکات، هیچ کاتێ نرخی مەردم نازانی. ئێمە بۆ ئەوە لێرە کۆ نەبووینەوە هەر کەس بە مەیلی خۆی رەفتار بکات. خۆ ئاشقی چاوو برۆی تۆش نەبووین کە هەرچییەکت گوت لێتی قەبوڵ بکەین. ئێمە لەبەر خاتری ئازایەتی‌و بیری ئازادیخوازانەی تۆ هاتووینەتە چنلی بل‌و تۆمان بە سەرکردە قەبوڵ کردووە. ئێمە لێرەدا هەموومان کاردەکەین‌و دەجەنگین‌و خوشك‌و برایانە دەژین‌و هەموو هەقی قسەکردنمان هەیەو هەقی ئەوەمان هەیە باسی عەیب‌و هەڵەی کەسانی دی بکەین. ئەگەر یەکێکمان تێدا هەڵکەوێ‌و نەیەوێ دان بە عەیب‌و هەڵەی خۆیدا بنێ، هەڵبەتە دەبێ رووی لێ وەرگێڕین. جا ئەو کەسە هەر کەسێ بێ، من بم، مەحبوب خانم بێ، کوێر ئۆغڵی بێ، دەمیرچی ئۆغڵی بێ، گورجی مەمەد بێ یا ئەو کەسە بێ کە تازە هاتۆتە ئێرەو چ شۆرەت‌و ناوێکی نییە.

دەگێڕنەوە دەڵێن کە کوێر ئۆغڵی چ قسەیەکی دی نەکرد، ئەوەندە لە هەڵەکەی خۆی تەریق بۆوە کە سەری لەبەر خۆی ناو رۆیی لە سوچێکا لەسەر سەوزە گیایەك بە دەما کەوت. سێ شەوو رۆژی رەبەق بە برسێتی‌و تێنوێتی یەك تەختە خەوت.

لەم لاوە دۆستانیش لە کردەوەکەی خۆیان ژێوان بوونەوە. لە بەینی خۆیاندا دانیشتن‌و ڕاوێژو تەگبیریان کرد کە:- ئێمەش غەدرمان کرد لە جیاتی دڵدانەوەی کوێر ئۆغڵی، سەرزەنشتمان کردو هێندەی دی حاڵیمان پەرێشان کردو دڵیمان شکاند.

هەرچەند بە دەوروبەری کوێر ئۆغڵیدا هاتووچۆیان کرد خەبەری نەبۆوە. ئاخری پەنایان بردە بەر نیگارخانم. دەمیرچی ئۆغڵی گوتی:- نیگار، هەنووکە ئیدی دەبێ تۆ هەوڵبدەی، جگە لە تۆ کەسی دی ناتوانێ دڵی کوێر ئۆغڵی بێنێتەوە جێ.

نیگار گوتی:- باشە، جارێ واز بێنن با بنوێ. وەختێ ویستی بێداربێتەوە، هەمووتان بڵاوەی لێبکەن، ئەوساکە ئیواز دەی هێنێ بۆ لای من‌و خۆم دەزانم چۆن دڵی دەدەمەوەو هەموو لایەك ئاشت دەکەمەوە.

دۆستان هەرکەسەو چوو بۆ شوێنی خۆی. هەنووکە گوێ لە نەقڵی کوێر ئۆغڵی بگرن. رۆژی سێیەم خەونی بینی، لە خەویا بە سواری قیرات لە تۆقاتداو لەبەردەم حەسەن پاشا وەستاوەو نەعرەتە لێدەداو مێری مەیدان داوا دەکات. لە پڕ لە خەو ڕاپەڕی‌و سەیری کرد ئیواز بە دیارییەوە وەستاوەو ئەوەندە خەمبارو پەشێو حاڵە هاکا لە سەلای گریانێ بدات. کوێر ئۆغڵی کە ئیوازی بەو حاڵەوە بینی کزە لە جەرگی هەستا. سازەکەی نووساند بە سینگییەوەو ئاوازێکی خەمناکی لێدا. ئیواز بۆ وا پەرێشانی؟ بڵێ چیت دەوێ. سەرم لە ئۆغرتایە، گیانم لە ئۆغرتایە،

هەرچییەکت دەوێ بیڵێ‌و وا بە خەمباری دامەنیشە، تا کوێر ئۆغڵی زیندوو بێ نابی گەردو غوباری خەم بنیشێتە سەر چنلی بل.

ئیواز گوتی:– رابە کوێر ئۆغڵی، هەستە باپڕۆین. هەموو چاوەڕێی تۆن.

کوێر ئۆغڵی سازەکەی داناو گوتی:– ئیواز، چما دەکرێ جارێکی دی پیاوان‌و ژنانی چنلی بل چاوەنۆڕی من بن؟ من وام نەڕەنجاندون کە جارێکی دی ڕووم بدەنێ.

ئیواز گوتی:– کوێر ئۆغڵی ئەم قسەیە چییە؟ تۆ سەرکردەی ئێمەی.

کوێر ئۆغڵی وتی:– تا قیرات نەهێنمەوە، ناتوانم بێمە کن دۆستەکانم.

ئیواز گوتی:– کە وایە ماتەڵی چیت؟ هەستە جلەکانت بگۆڕە، چەك‌و ئەسڵەحە ببەستەو بڕۆ.

کوێر ئۆغڵی هەستا. یەك دوو هەنگاوی نا، لە پڕ گوێی لە دەنگی سازو ئاواز بوو، سازو ئاوازێکی هێندە خەمناك‌و پڕ حەسرەت کە باڵندەی لە ئاسمان ڕادەگرت. کوێر ئۆغڵی چاوێکی بەو ناوەدا گێڕا، لە پڕ نیگاری بینی ساز بە دەست لە بەرزاییەك، لە ژێر درەختێکدا وەستاوەو بە سازو ئاواز کوێر ئۆغڵی گازدەکات.

کوێر ئۆغڵی خۆی پێ نەگیراو بەرەو لای نیگار چوو. کاتێ گەییە سەر بەرزاییەکەو پێی نایە نێو مێرگوزارەکەوە، چی ببینێ؟ سەیری کرد مەجلیسێکی دۆستانە لە تەواوی خەڵکی چنلی بل پێکهاتووە. سفرەیان راخستووە، خواردن‌و شەراب حازرە، پاڵەوانانی ژن‌و پیاو، ئەڵقاو ئەڵق دانیشتوون، بەڵام کەس نە قسە دەکات‌و نە دەست بۆ خواردن دەبات. هەموو چاوەڕوانی کوێر ئۆغڵی بوون.

کوێر ئۆغڵی چووە ناو مەجلیسەکەوە. ئیدی بازاڕی ماچ‌و ئاشت بوونەوە گەرم بوو. پاڵەوانان‌و کوێر ئۆغڵی هەریەکەیان بە جۆرێ دۆستایەتی‌و ئاشت بوونەوەی خۆیان نیشان دا. ئیواز هاتە ناوەندی مەجلیسەکە‌و بوو بە ساقی. هەموو خواردیان‌و خواردیانەوەو کەیفیان کۆك بوو‌و گلەیی‌و گازاندە فەرامۆش کران. کوێر ئۆغڵی سەربهوردی خۆی دەگەڵ کەچەڵ هەمزەدا بۆ گێڕانەوە. پاڵەوانەکان هەر یەکەیان لە سوچێکەوە گوتی: من هەر ئێستا دەچم قیرات دێنمەوە‌و سەری حەسەن پاشا بە دیاری دێنم.

کوێر ئۆغڵی هەموویانی کڕ کرد‌و گوتی: وا چاترە خۆم بە دووی ئەسپەکەدا بچم. قیرات چاوی لە ڕێی منە. ئەوسا کوێر ئۆغڵی هەستاو جلی شەڕی پۆشی‌و شمشێرێکی تیژی بەست، مەتاڵ‌و ڕم‌و تفاقی شەڕی لەگەڵ خۆدا هەڵگرت‌و فەروەیەکی بەسەردا کردن، سازەکەی کردە شانی‌و بە تاقی تەنیا بە پێیان ڕێگای توقاتی گرتە بەر. شەو‌و ڕۆژ هەر ڕۆیی‌و ڕۆیی نە سەری سەرینی بینی‌و نە چاوی چووە خەو تا گەییە شاری توقات. دنیا خەریك بوو تاریك دەبوو.

کوێر ئۆغڵی لە دەرکەی ماڵی پیرێژنێکی دا. پیرێژن دەرکەی کردەوە. کوێر ئۆغڵی چنگێ پارەی دایە پیرێژنەکە کە شیوی بۆ ساز بکات‌و ڕێگای بدات شەوێ لە ماڵەکەی دا بحەوێتەوە.

شەوێ کە شیویان خوارد‌و سفرەیان کۆ کردەوە، پیرێژن تەماشایەکی سازەکەی کوێر ئۆغڵی کرد‌و گوتی:– ئاشق، هەنووکە سازەکەت هەڵگرە‌و تۆزێکم بۆ لێبدە با گوێ بگرم.

کوێر ئۆغڵی گوتی:– دایە گیان تازە درەنگە‌و کاتی خەوە. بەیانی بۆت لێدەدەم.

پیرێژن گوتی:- ئاخر من سبەینێ دەچمە زەماوەندی "هەمزە بەگ" ئەگەر مەیلت لێیە نووکە لێبدەو گەر مەیلت لێ نییە ئەوا هیچ.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- دایە گیان، هەمزە بەگ کێیە؟

پیرێژن گوتی:- هەمزە بەگ زاوای حەسەن پاشایە.. لاوێکی نەترس و ئازایە. دەلێن کوێر ئۆغڵییەك نازانم چییە.. تۆ دەیناسیت؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:- ناویم بیستووە، ئێ؟

پیرێژن گوتی:- هەمزە بەگ چووە ئەسپەکەی ئەوی فڕاندووەو هێناویێتی. حەسەن بەگ پاشا مەقامی "بەگێتی"و "دونا خانم"ی کیژی خۆی داوەتێ. سبەی زەماوەندیانەو منیش خزمەتی کچان و بووکێ دەکەم. دەبێ بەیانی زوو لە خەو ڕابم و بڕۆم.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- دایە گیان تۆ دەزانیت ئەسپەکەی کوێر ئۆغڵی لە کوێ دەبەستنەوە؟

پیرێژن گوتی:- لە تەویلەی حەسەن پاشادا، بەڵام دەلێن ئەسپێکی شێتە. نایەڵێ کەس توخنی بکەوێ. هەموو مەیتەرەکانی حەسەن پاشای برینداری کردووە. ئێستا جۆو ئالیکی لە دەلاقەی سەربانی تەویلەکەوە بۆ دەخەنە ژوورەوە.

کوێر ئۆغڵی ئەوەی پێویست بوو وەری گرت و ئەنجام گوتی:- دایە گیان من ماندووم. واچاکە بنووم.

پیرێژن گوتی:- گوێ بگرە بزانە چت پێ دەلێم. وا چاکە سبەینێ تۆش بێی بۆ زەماوەندەکەو ساز لێ بدەی و گۆرانی بچڕی و پارەیەکی مۆڵ بە دەست بێنی. ئاخر گاڵتە نییە، شایی کیژی پاشایە!

خۆڵاسە شەوێ خەوتن. بەیانی کوێر ئۆغڵی ڕابوو وەکو ڕۆژی پێشوو جلی لەبەر کرد و چنگێ پارەی دایە پیرێژن و گوتی:- ئەگەر شەوێ هاتمەوە ئەوا ئەو پارەیە خەرجی خواردن بکە، ئەگەر نەهاتمەوە گەردەنت ئازا بێ.

* * *

کوێر ئۆغڵی هات هات تاگەییە کۆشکی حەسەن پاشا. چی لێرەدا بینی؟ سەیری کرد جەژنێکیان بەرپا کردووە کە ڕۆژگار جەژنی وای بەخۆوە نەبینیوە. کۆڕی مەجلیس هەر کە ژنەوتیان ئاشقێکی غەریبە هاتووە، هەموو کەوتنە خۆشی و، ڕاکێش ڕاکێش کوێر ئۆغڵییان بۆ مەجلیسی زەماوەندەکە برد.

حەسەن پاشا تەماشایەکی قەدو باڵای کوێر ئۆغڵی کرد، سەیری کرد ئاشقێکە باڵا بەرز، ناوشان پان، گەردن ئەستوور، سمێڵ زل، خۆڵاسە هیچ لەو ئاشقانە ناچێ کە تا ئێستا دیوونی. پرسی:- ئاشق، خەڵکی کوێندەرێی؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:- خەڵکی ئەوبەری قافم.

پاشا گوتی:- کوێر ئۆغڵی دەناسیت؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:- زۆر چاکی دەناسم، بەڵایەکی بەسەرم هێناوە کە تا دنیا دنیایە لە بیرم نەچێت.

حەسەن پاشا گوتی:- چ بەلایەك؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:- پاشا سەلامەت بێ، کوێر ئۆغڵی ئەسپێکی لەعنەتی شێتی هەیە، پێی دەڵێن قیرات.

یەکێك لە پاشاکان ویستی قسەیەك بکات، حەسەن پاشا قسەکەی بڕیو ئەوجا بە کوێر ئۆغڵی گوت:- ئێ، گوتت..

- بەڵێ قوربان، ئەسپێکی چاکە بەڵام مەخابن شێتە. ڕۆژێك بەڕێی خۆدا دەڕۆیشتم، ئەم سازی حازرییەم پێ بوو. لە پڕ کۆمەڵێك بە سەرما ڕژانو چاویان بەستمەوەو لەگەڵ خۆدا بردیانم. ئیدی بۆ کوێ چووینو چۆن ڕۆیشتین، ئەمەیان نازانم، کە چاویان کردمەوە سەیرم کرد لەسەر شاخێکمو لاوێکی مل ئەستوور بەرانبەرم وەستاوە. تومەز شوێنەکە چنلی بلەو ئەو لاوە مل ئەستوورەش کوێر ئۆغڵی بە خۆیەتی. ئیدی بۆ منیان بۆ ئەوێ بردبوو، ئەمەیان نەقلێکی سەیرو سەمەرەیە. تومەز ئەم ئەسپە شێت بوو بوو، هەرچی داو دەرمانیان دابویە فایدەی نەکردبوو. نەیدەهێشت کەس سواری بێ. هەر کەسێکیش توخنی کەوتبایە بە جووتەو قەپاڵ پارچە پارچەی دەکرد. کوێر ئۆغڵی حەکیمێکی دۆستی دەبێ دەچن بە دوایاو دەی هێنن. حەکیمی گۆڕ بە گۆڕیش دەڵێ جنۆکان دەستیان لەم ئەسپە وەشاندووە، دەبێت یەکێك بێت سێ شەو وسێ ڕۆژ دانیشێتو ساز لێ بداو ستران بچڕێ تا جنۆکەکان بتارێن. ئەو دەمە کوێر ئۆغڵی بە خۆی شارەزای سازو ئاواز نەبوو.

ئەوە بوو بە دوای ئاشقێکدا دەگەڕانو منی بەلەنگازیان بە گیر هێنا. خۆڵاسە، سەرتان نەیەشێنم، دەڵەکیان دامو خستمیانە بەردەم ئەسپەکە. مەگەر هەر خوا بزانێ لەو سێ شەوو ڕۆژەدا چیم بەسەرهات. بە ڕاستی هەر بوومە پەند.

حەسەن پاشا بە تاسەوە پرسی:- ئەدی ئەسپەکە؟ چاك بۆوە؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:- هەر زۆریش چاك بۆوە، ئیدی لەو ڕۆژەوە کوێر ئۆغڵی کەوتە فێربوونی سازو ئاواز. دەڵێن هەنووکەش هەر ١٠-١٥ ڕۆژ جارێ ئەو ئەسپە شێت دەبێتەوە. ئەوجا کوێر ئۆغڵی سازەکەی هەڵدەگرێو گۆرانی دەچڕێو ئەسپەکە چاك دەبێتەوە.

دیسان یەکێك لە پاشاکان ویستی قسەیەك بکات، حەسەن پاشا مۆرەیەکی لێکردو بێدەنگی کرد. گوتی:- ئاشق، ئێستا تۆزێکمان سازان بۆ لێ بدەو ستران بچڕە با گوێ بگرین.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- چ بڵێم؟

حەسەن پاشا گوتی:- تۆ کە بەچاوی خۆت قیراتت دیوە، بڵێ بزانم چۆن قەدو قەلافاتێکی هەیە، نیشانەکانی چین.

کوێر ئۆغڵی گوتی:- پاشا سەلامەت بێ. ئەو لەعنەتییە ئەسپێکی چاکە ،بەڵام مەخابن هەندێ جار شێتیەکەی سەر هەڵدەداتەوە.

ئەوجا سازەکەی لە سینگی توند کردو تێی چریکاند. پاشا تۆ نیشانەکانی قیراتت لە من گەرەکە، قیرات ئەسپێکە یاڵی لە ئاوریشم، گەردنی بەرزی هەردەم لە مەیدانی جەنگا شۆڕ نابێ، لە جوانوو قەد باریکترەو لە گورگی برسی زۆر خۆرترە. لە شەوی ئەنگوستە چاویش دا ڕێی

خۆی دەبینێ. لە مەیدانی جەنگدا هەرگیز دەست بەرداری سوارەکەی نابێ. ئەسپی کوێر ئۆغڵی دەبێ وەکو خۆی شێت بێ.

حەسەن پاشا گوتی:– ئەو قیراتەی کە ئەوەندەت تاریف کرد هەنووکە لە تەویلەی مندایە. بڵێ بزانم کوێر ئۆغڵی، ڕەشید ترە یا من کە ئەسپەکەیم ڕفاندووە؟

کوێر ئۆغڵی گوتی:– ئەگەر بەڕاستی ئەسپەکەیت رفاندبێ، زۆر ڕەشیدیت، بەڵام پیاوی ڕەشیدو عەگید گەلێك نیشانانی هەن. گوێ بگرە بزانە ئەم نیشانانەت تێدا هەن.. نیشانەکانی پیاوی کەڵەمێر بژنەوە. ڕەشید بەتەنێ پەلاماری قۆشەنی دوژمن دەدات و کاتێ لە نەعرەتە دەدات و دەچێتە مەیدان، دوژمن ناچارە فیرار بکات. ڕەشید کەسێکە کە سەری تەسلیم بوون دانانەوێنێ و لە کاتی تەنگانەدا لە یارو یاوەرانی خۆی دانابڕێ. دوژمن لافی پیاوەتی و ڕەشیدی لێ دەدات، بەڵام پیاوی عەگیدو چەلەنگ دەبێ مەڕ لە چنگی گورگ دەرباز بکات.

حەسەن پاشا گوتی:– ئاشق، ئەو نیشانانەی کە باست کردن هەموویم تێدا هەن. بە چاوی خۆتیش دەی بینی، هەنووکە هەستە با بچینە کن قیرات بزانم دەتوانی چارەی بکەیت یان نا.

کوێر ئۆغڵی بەم قسەیە شا گەشکە بوو، بەڵام شادییەکەی خۆی دەرنەبڕی. گوتی:– باشە با بڕۆین، بەڵام مەرجی من ئەمەیە کە: لە دەرێی تەویلەکە دادەنیشم و سازان لێ دەدەم، ئێوەش لە درزی دەرگاکەوە بنۆڕنە ئەسپەکە. ئەگەر بینیتان سازو ئاوازەکەم کاری خۆیان کرد، ئەوا، چ قسەیەکم نامێنێ و دەچمە ژوورەوەو دیسان سازان لێدەدەم، بەڵام ئەگەر کاری نەکرد، ئەوا لە ملیشم بدەن ئامادەنیم بچمە نێو تەویلەکەوە. ئاخر من دەزانم چ حەیوانێکی نا نەجیبە!

پاشا قایل بوو، هەستاو کەوتنەڕێ و گەیینە بەر تەویلەکە. کوێر ئۆغڵی لە درزی دەرگاکەوە تەماشای کرد، دەتگوت قیرات بۆنی کردووەو چاوی بڕیوەتە دەرگاکەو گوێچکەکانی قۆڵاغ کردوونەتەوە. هاتە لاوەوەو گوتی:– هەنووکە ئەنگۆ تەماشای ئەسپەکە بکەن و من سازان لێ دەدەم.

پاشایان وەکو مارو مێرو خڕبوونەوەو لە درزی دەرگاکەوە چاویان بڕییە ناو تەویلەکە. کوێر ئۆغڵی سازەکەی لە سینگی توند کردو دەستی پێکرد:

دلاوەرانی وڵاتی ئێمە لە مەیداندا پیاوانە دەوەستن و تا دوا هەناسە لەبەر دوژمن هەڵنایەن. تەنیا نا پیاوان لە قسەی ناخۆش نارەنجێن، هەرگیز چەقەڵ ئازایەتی گورگی نییە، یارانم دەستە دەستە، بەسەر پشتی ئەسپی خۆشبەزو تیژڕۆوە، شمشێری میسری لە پشت. هەریەکەیان کوێر ئۆغڵییەکە بۆ خۆی.

قیرات هەرکە گوێی لە دەنگی کوێر ئۆغڵی بوو لە خۆشیاندا کەوتە سمکۆڵ و چەپۆکان. دەتگوت دەیەوێ تەویلەکە ژێرو ژوور بکات.

حەسەن پاشا لە خۆشیاندا نەیدەزانی چ بکات. دەستی لە قەبرغەی دۆستەکانی ڕادەکردو دەیگوت: سەیرکەن! چ چەپۆکانێ دەکات!

کوێر ئۆغڵی وەختێ ئاوازەکەی تەواو کرد، حەسەن پاشا گوتی:– ئاشق خێراکە هەڕۆ ژوورێ. ئەگەر چارەت کرد لە ماڵە دنیات دەگرم.

ئێستا کوێر ئۆغڵی بۆی دەردەکەوێ کە دنیا لە دەستی کێدایە. ئیدی لافی پیاوەتی و دلاوەری لێنادات.

دەرکەیان کردەوەو کوێر ئۆغڵییان ناردە ژوورەوە. کوێر ئۆغڵی سازەکەی لە سینگی توند کرد و ئاوازێکی ئاشقانەی لێدا کە تەنیا قیرات دەنگی دەبیست. ئەوجا دەستەکانی کردە ملی ،کەوتە راموسانی سەروچاوی. قیراتیش لەسەر پێ بەند نەدەبوو.

دەموچاوی لەسەرو رووی کوێر ئۆغڵی هەڵدەسووو بەجۆرێ بۆنی پێوە دەکرد دەتگوت چێڵی تازە زاوەو گوێرەکەی دەلێسێتەوە.

کوێر ئۆغڵی لە پڕ ڕاچەڵەکی و هاتەوە سەر خۆی. دەتگوت لە خەو راپەڕیوە، بەخۆی گوت: هەی بێ هۆش، ئەوە چ دەکەی؟ دوژمن دەوری داویت و دەتەوێ خۆت کەشف بکەی؟

خێرا وەلاکەوت، دەرگای کردەوەو گوتی: پاشا، ئێستا ئەنگۆ کەمێك لاکەون، با من ئەسپەکە بێنمە دەرێ و کەمێ هەوا لێی بدات ئەوجا بیدەمە دەستت و سواری ببی، بەڵام پاشا دەبێ خەڵاتێکی چاکم بدەیێ. ئەم کارە یەجگار زەحمەتە!

حەسەن پاشا گوتی:- خاترجەم بە، دەبێ ئەوەندەت زێر بەسەردا هەڵڕیژم کە بە خۆت بلێی بەسە، بەڵام تۆزێ سەبرکە با ئێمە لاکەوین ئەوجا.. دەترسم بەڵایەکمان بەسەر بێنێ.

پاشاکان بە هانکە هانك خۆیان گەیاندە بورجی قەڵاکەو دانیشتن و لەوێ ڕا چاویان بڕیە ناو تەویلەکە. کە پاشاکان رۆیشتن، کوێر ئۆغڵی زینی ئەسپەکەی دۆزییەوە، خستییە سەر پشتی قیرات و کەوتە تەنگ کردن و ڕێکخستنی.

هەنووکە بابێنە سەر کەچەڵ هەمزە بەگی زاوای حەسەن پاشا.

کەچەڵ هەمزە لەبەر پەنجەرەکەی دوناخانم دا وەستابووو لێی دەپاڕاوە کە دەرکەی لێ بکاتەوە تا بێتە ژوورەوە. دوناخانم پێی رادەبوارد و لەو سەرەوە ئاوی پێدا دەکرد. هەمزە لە پڕ سەیری کرد خەڵکی بەرەو بورجی قەڵاتێ غاردەدەن. پرسی: چ خەبەرە؟

گوتیان:- ئەدی ئاگات لێ نییە؟ ئاشقێ هاتووەو قیراتی چاکردۆتەوەو هەنووکە دەیەوێ قیرات بێنێتە مەیدانەکە.

کەچەڵ هەمزە کە گوێی لەمە بوو بەندی دڵی پچڕاو زمانی کەوتە تەتەڵەو بە ناڵە ناڵ دووی ئەوان کەوت. وەختێ گەییشتنە بورجەکە کەچەڵ هەمزە خۆی گەیاندە پاشا و بەترس و لەرزەوە گوتی:- حەسەن پاشا، ماڵت وێران بوو، ئاشقی چی؟ ئەو پیاوە کوێر ئۆغڵی بە خۆیەتی!

حەسەن پاشا بزەیەکی تەوس ئامێزی کرد و گوتی:- هەمزە، من دەزانم کوێت دێشێت، دونا خانم هێشتاش نایەڵێ بچیتە کنی؟ خەمت نەبێ، وردە وردە دێتە سەر ڕێ و ڕام دەبێ.

هەمزە گوتی:- پاشا، تا زووە بیرێ بکەوە. هەر ئێستا کوێر ئۆغڵی دێت و قەڵاکەت بەسەردا دەڕمێنێ.

حەسەن پاشا دیسان پێکەنی و گوتی:- باشە، بڕۆ، بڕۆ دونا خانم چاوەڕێتە!..

کەچەڵ هەمزە لە بورجەکە هاتە خوارێ. چ چارەیەکی دی نەبوو. هات بۆ تەویلەکە. سەیری کرد کوێر ئۆغڵی سواری قیرات بووەو بەرەو مەیدان دەڕوات. غاری دایە بەرەوەو بە پێکەنینەوە

گوتی:– ئەی بە قوربانی ئەو قاچانەت بم، چەند لە شوێنی خۆیدا گەیشتی! دەمزانی دێیت، منیش لە سایەی سەری تۆوە بە مرازان گەییم. لەقەبی بەگییم وەرگرت و..

کوێر ئۆغڵی بە تووڕەییەوە سەیری هەمزەی کرد. هەمزە لە جێی خۆی وشك بووو رەنگی بوو بە جاوی سپی.

کوێر ئۆغڵی گوتی:– هەمزە تۆ خیانەتت لە کەسێك کرد کە داڵدەی دایت. ئامانجی تۆ پارەو مەقام و قازانجی شەخسییە. تۆ بۆ خەڵکی لە خانان و پاشایانیش خەتەرتری. چونکە بەلای کەمەوە پیاو دەزانێ ئەوان دوژمنن، بەڵام تۆ لە ژێر پەردەی دۆستایەتییەوە کارێکی وات کرد من داڵدەت بدەم و دۆستەکانی خۆم بڕەنجێنم. ئاژاوەت لە چنلی بلدا نایەوەو کارێکی واتکرد پاشایان غیرەت بیانگرێ و لەشکر بکەنە سەر چنلی بل.

هەمزە خۆی کرد بە مشکی تۆپیوو گوتی:– بە قوربانت بم کوێر ئۆغڵی بمبوورە. ئێستا بۆم دەرکەوت کە چ هەڵەیەکم کردووە. لەمە بەدواوە قەول دەدەم..

کوێر ئۆغڵی دەرفەتی نەدا قسەکەی تەواو بکات. هەڵی کێشایە شمشێرو سەری کەچەڵەی پەڕاند. مامێزی لە ئەسپەکە دا، قیرات چەشنی شەهێن باڵی گرت و کوێر ئۆغڵی گەیاندە ناوەندی مەیدان.

حەسەن پاشا لەسەرێ ڕا گازی کرد:– ئەهای عاشق، کەمێ بەم لاو بەولایدا بگێڕە با ببینم!

کوێر ئۆغڵی ئیشارەتێکی کردە قیرات، قیرات تەپوتۆزێکی ئەوتۆی لە مەیدانەکە هەستاند کە حەسەن پاشا لە خۆشیا یا لە ترسا لەسەر بورجەکەوە کەوتە لەرزین. گوتی:– ئاشق، تۆ سواریش بەڵەدی!

کوێر ئۆغڵی سازەکەی دەرهێناو تێی چریکاند: حەسەن پاشا چیدی لافی جوامێری لێ مەدە.، جارێ لە کوێتە، چیت دیوە، شمشێر وەشانیش بەڵەدم. ئەگەر دۆست و یاوەرەکانم لە چنلی بلەوە بگەن. شارو قەڵاکەت لە سەربازان چۆڵ دەکەن. من کوێر ئۆغڵیم و لە چنلی بلەوە هاتووم، کە دەبینی بە جل و بەرگی ئاشقەوە سواری قیرات بووم، ئەمە چ نییە، هەزاران فەندی لەم جۆرە بەڵەدم.

یەکێك لە پاشاکان گوتی:– حەسەن پاشا، من لەم ئاشقەی تۆ بە گومانم. بەڵا بە دوور نەکا کوێر ئۆغڵی بێ!

حەسەن پاشا دەتگوت لە خەو ڕابوو. ڕاچڵەکی و گوتی:– نە گیانە کوێر ئۆغڵی چی! یانی ئێمە ئەوەندە گەوجین کوێر ئۆغڵی بێت و هەموومان کەربکات و قیرات بەرێ؟

کوێر ئوغڵی لەسەری ڕۆیی:– من "مراد بەگلی"م پێ دەلێن لە مەیدانا مەردانە دەوەستم. لە کێواندا ڕێگا لە کاروانی خان و پاشایان دەگرم. بەزم و هەرا لە چیاو دەشتان دەنێمەوە. ئەگەر نەعرەتەیە لێبدەم سەربازانت شارو قەڵاکەت بەجێ دێڵن و هەڵدین.

حەسەن پاشا سەیری کرد کڵاوەکە تا ناقرگەی چووەتە سەری و کار لە کار ترازاوە. دنیا لەبەر چاوی تاریك بووو لەرزی لێنیشت.

ئەمری کرد دەم و دەست دەرگاکانی قەڵا دابخەن و کوێر ئۆغڵی دەستگیر بکەن.

کوێر ئۆغڵی سەیری کرد یەکێك لە دەرگاکانی قەڵایان داخست.رووی کردە حەسەن پاشاو تێی چریکاند. خەبەرێکم لە قاسیدێکەوە زانیوە گوتی:- قەڵا پێنج ڕێگای هەیە. ئەگەر نەعرەتەیەك لێ بدەم هەموو ڕێگاکان چۆڵ دەبن.

ئەمەی گوت و ویستی لە دەرگای دووەمەوە دەرچێ. قۆشەن پێشیان لێگرت. کوێر ئۆغڵی شمشێری زاخاودراوی هەڵکێشاو چۆن گورگ دەکەوێتە ناو پەزان، خۆی بە قۆشەنەکەدا دا. هەر سەر بووو بەحەوادا دەپەڕی، بەڵام قۆشەنەکە ئەوەندە زۆر بوو ڕێگا نەدەکرایەوە.

کوێر ئۆغڵی گەڕایەوە تا لە ڕێگای سێیەمەوە. بڕوات لێرەشدا ئەوەندەیان زیخ و چەو هەڵڕشتبوو کە ئەسپەکە بە زەحمەت دەیتوانی ڕێگای خۆی بکاتەوە. کوێر ئۆغڵی ئەمجارەش خۆی بە لەشکری دوژمنا داو وەکو گەڵای دار لێی هەڵوەراندن. قیراتیش بە چەپوك و قەپاڵ لە کوێر ئۆغڵی کەمتر نەبوو.

سێ نکالی قەڵای توقات وشکایی بووو لایەکی ئاو بوو، رووباری هەڵچووی دانوب بوو. حەسەن پاشا ئەم ڕێگایەی بە تاکی هێشتبووەوەو تاکو کوێر ئۆغڵی یا بە دەستی سەربازەکان بکوژرێ و یا خۆی بدا بە ئاوەکەداو بخنکێ.

کوێر ئۆغڵی سەیری کرد هەموو ڕێگاکان گیراوە. هەر چەندێ شمشێر بوەشێنێ و سەربازان بکوژێ ڕێگایان پتر دەگیرێن. سەیرێکی لای روباری دانوبی کردو بینی ڕێگاکە وازە، قیراتی بەرەو ئەوێ ئاژۆت.

گوتی:- ئەسپەکەم تاوداوە تا دوژمن بتۆقێنم، دەبێ ئەمڕۆ باج و خەراجی حەوت ساڵان لە پاشا وەربگرم. چونکە قیرات وەکو غەواسە روباری دانوب دەبڕێ.

ئەمەی گوت و خۆی بە ئاوەکەدا دا. ئاو گەییە گوێی ئەسپەکە. کوێر ئۆغڵی سەیری کرد ئاوەکە زۆر خوڕەو ئەسپەکە نائومێدانە پەل دەکوتێ. دەستەکانی لە ملی قیراتدا تێك ئاڵاندو لە نەعرەتەی دا:

ئەی ئەسپە ئاسك ئاساکەی من، ئەی ئەسپە شەهێن ئاساکەی من، بلەزینە، بلەزینە. هەموو بەیانی و ئێوارەیەك تیمارت دەکەم، ناڵی زێرت بۆ دەکەم، هەر چۆنێ بووە لێرەم دەرباز بکەو بمگەیەنە چنلی بل.

قیرات کە گوێی لەم ئاوازەی کوێر ئۆغڵی بوو. دەتگوت باڵی لێ ڕوا. بە دەم مەلەکردنەوە خۆی گەیاندە ئەوبەری روبارەکە. کوێر ئۆغڵی ئاوڕی دایەوەو سەیری کرد حەسەن پاشا هێشتا لە بورجەکە نەهاتۆتە خوارەوە. هاواری کرد:- ئەهای پاشا، ئەمجارە خۆت لە بورجەکەدا شاردەوەو چاك لە دەستم دەرباز بوویت. بۆ کوێ دەچیت،جاریکی دی یەکدی دەبینینەوە!.

ئەمەی گوت و کەوتە ڕێ. هات و هات تا گەییە چنلی بل. قیرات هەرکە بۆنی چنلی بلی بەسەردا هات حیلەیەکی وای کرد کە لە هەموو کێوو بەندەنەکاندا دەنگی دایەوە. دۆستان هەموو دەوری کوێر ئۆغڵییان داو گوتیان:- کوێر ئۆغڵی بەخێر بێیتەوە! بڵێ بزانین چیت بینی؟ چتۆ ئەسپەکەت دۆزییەوەو هێنات؟

کوێر ئۆغڵی سەربهوردەکەی خۆی هەر لە ئاشەکەوە تا روباری دانوب بۆ دۆستەکانی گێڕایەوە. دۆستەکانی پەشیمان بوونەوە لەوەی کە رەنجاندبوویان ، هەموو سەریان داخست.
کوێر ئۆغڵی گوتی:– نارەحەت مەبن، هەقی خۆتان بوو، من نەدەبوو متمانە بە هەموو کەسێ بکەم، نەدەبوو کلیلەکەم بە کەچەڵە بدایە. هەنووکە کارێ بووو ڕووی دا، بەڵام ئەوەش بزانن کە من کوێر ئۆغڵی"م پێ دەلێن.

نیگارخانم سەیری کرد کوێر ئۆغڵی دیسان خەریکە لە خەت دەدردەچێ، چاوێکی لە دۆستان داگرت و گوتی:– کوێر ئۆغڵی ئێمە دەزانین کە تۆ بەڕاستی کوێر ئۆغڵیت. ئەگەر وانەبوایە لە دەورت خڕ نەدەبووینەوە! راستە پیاوانەیت، ڕەشیدیت، پێچ و پەنای کارەکان شارەزایت، بەڵام هەر بەینی خۆمان بێ ڕەش و تاوەسووتیت و سەرو سیمات ئەم هەموو ستایشە هەڵناگرێ!..

دۆستان هەموو پێکەنین. کوێر ئۆغڵی بە خۆشی پێکەنی. ئەوجا سازەکەی نا بە سینگییەوە تێی چریکاند:

ئەی جوانی من، تۆ کە بەمن دەلێی ڕەش، ئەدی برۆکانی تۆ ڕەش نین؟ ئەو گیسوانەی رژاونەتە سەر گەردنت، ڕەش نین!

ئەی جوانەکەی چنلی بل چما ئەو خاڵەی سەر روخساری وەکو مانگ و هەتاوت ڕەش نییە؟
کوێر ئۆغڵی لە کانگای دڵەوە خۆشی دەویێ، گوێ بۆ سازو ئاوازم ڕادێرە، ئەدی ئەو کلەی کە لە چاوانت کردووە ڕەش بییە؟

هاوینی ١٣٤٧(١٩٦٨)

## سەربهوردی پروشه بەفرێ

ڕۆژێك بەفر دەباری، لە پشت پەنجەرەکەوە، وەستابوومو سەیری دەرێم دەکرد، پروشە بەفر بە سەماوە دەهاتنو لەسەر هەموو شتێك دەگیرسانەوە. لەسەر تەناف، دارو درەختو دیوار، لەسەر ئینجانەی گوڵانو لەسەر هەموو شتێك. پرۆشە بەفرێکی درشت بەرەو پەنجەرەکە دەهات. دەستم لە پەنجەرەکە ڕا بردە دەرێو بەفرەکە لەسەر دەستم نیشتەوە. چەند سپیو بێگەرد بوو! چ شێوەو روخسارێکی جوانو ڕێکی هەبوو! لە ژێر لێوەوە بەخۆم گوت: "خۆزیا ئەم پروشە بەفرە زمانی هەباو سەربهوردی خۆی بۆ گێڕابامەوە!".

لەم کاتەدا بەفرەکە هاتە زمانو گوتی: ئەگەر حەزدەکەیت سەربهوردی من بزانیێ گوێ بگرە تا بۆتی بگێڕمەوە: من چەند مانگێ لەمەوبەر دڵۆپە ئاوێك بووم. لە دەریای خەزەردا بووم. لەگەڵ ملیارد ملیارد دڵۆپە ئاوی دی دا ئەم لاو ئەو لام دەکرد. ڕۆژێکی هاوین، هەتاو گەرم بوو، من بەسەر دەریاوە پیاسەم دەکرد، لە پڕ گەرم ڕاهاتمو بووم بە هەڵم. هەزاران هەزار دڵۆپی دیش دەگەڵ مندا بوون بە هەڵم. لە سووکیدا باڵمان گرتبووو خۆبەخۆ بەرەو ئاسمان هەڵدەکشاین. با دوامان کەوتبوو بە کەیفی خۆی دەی بردین. ئەوەندە بەرزبووینەوە کە ئیدی خەڵکیمان لێ دیار نەمان. لە هەموو لایەکەوە پەڵە هەڵم دەهاتو تێکەڵ بە ئێمە دەبوو، هەندێ جاریش ئێمە دەڕۆیشتینو تێکەڵ بە پەڵەی گەورەتر دەبووینو پاڵمان دەدایە یەکەوەو پێکەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشاینو زۆرو زۆرتر دەبووینو لە پاڵ یەکدا توندتر دەبووین. هەندێ جار بەری هەتاو و هەندێ جار بەری مانگو ئەستێرانمان دەگرتو ئەوساکە هێندەی دی شەومان تاریك دەکرد.

وەکو هەندێ لە تنۆکە هەڵمەکان دەیانگوت: ئێمە بوو بووین بە هەور، با خۆی بە نێوماندا دەکردو شێوەی عەجیبو غەریبی لێ دروست دەکردین. بە خۆم کاتێ لە دەریادا بووم، هەندێ جار هەورم بەشێوەی وشترو بنیادەمو کەرو شتی دی دەبینی.

نازانم چەند مانگ لە ئاسمانا سەرگەردان بووین. زۆر چووبوینە سەرێ، هەوا ساردبوو بوو. ئەوەندە چووبووینە ناو یەکەوە نەمان دەتوانی دەستو لاقمان درێژ بکەین. بە کۆمەڵ هەرەکەتمان دەکرد. من نەمدەزانی کێوە دەچین. دەوروبەری خۆیشیم نەدەبینی. هەتاو لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوو، وێ دەچوو خۆمان بەری هەتاومان گرتبێ. زۆر پانو پۆڕ بوو بووین. چەند سەد کیلۆمەتر درێژیو پانیمان بوو. دەمانویست ببین بە بەفرو بگەڕێینەوە بۆ سەر زەوی.

من لە خۆشی زەویدا نەمدەزانی چ بکەم! ماوەیەك بوری. بە یەکێکم گوت: چ بووە؟ گوتی: — هەنووکە لەسەر زەوی لەم ئاستەوە زستانە. هەڵبەتە لەوانەیە لە شوێنانی دیدا دنیا گەرم بێ. ئەم سەرما کتوپڕە ئیدی نایەڵێ ئێمە ببین بە باران. تەماشاکە من خەریکە دەبم بە بەفر! تۆش...

هاوڕێکەم نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات، بوو بە بەفرو بەرەو زەوی کەوتەڕێ. لە پاش ئەوەوە، منو هەزاران هەزار تنۆکی دی یەك لە دووی یەك بووین بە بەفرو بەرەو زەوی بارین.

کاتێ کە لە دەریادا بووم، قورس بووم، بەڵام ئێستا سووك بووم. وەکو پوشەکە دەفڕیم. باکم بە سەرماش نەبوو. سەرما بوو بوو بە بەشێك لە بەدەنم. بە سەماوە بەرەو خوار دەهاتین.

کە لە زەوی نزیك بوومەوە سەیرم کرد خەریکە لە شاری تەورێزدا دەکەومەوە. چەند لە دەریای خەزەر دوور کەوتبوومەوە!

لەو سەرەوە دیتم منداڵێك خەریکە بە کوتەك لە سەگێك دەدات و سەگەکە دەقورسکێنێ. سەیرم کرد گەر بەو شێوەیە بڕۆم یەکڕاست دەکەومە سەر ئەو منداڵە ، تکام لە بایەکە کرد کە لەو مناڵەم دوور بخاتەوەو بم بات بۆ شوێنێکی دی. بایەکە تکای قەبوڵ کردم، هەڵی گرتم و هێنامییە ئێرە، کە سەیرم کرد تۆ دەستت بۆ ڕاگرتووم زۆرم خۆش ویستیت و..

* * *

لێرەدا دەنگی بەفرەکە نەما. کە سەیرم کرد توابۆوە.

# کەچەڵی کۆترباز

عەیامیٚ بەو عەیامەی کوڕە کەچەڵەیەك هەبوو دەگەڵ دایکە پیرەکەیدا دەژیا. خانووەکەیان حەسارێکی بچکۆلەی هەبوو. درەختێکی توو لەم حەوشەیەدا هەبوو. بزنە ڕەشەکەی کوڕە کەچەڵە لە ژێر ئەم دارتووەدا دەلەوەڕی، کاوێژی دەکرد، ریشی دەجوولاندو زەوییەکەی بە سمەکانی هەڵدەکولی و باعە باعی دەکرد، ژوورەکەیان روو لە قیبلە بوو، پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو، تەنورێکی لە ناوەندابوو، سەکۆیەك لەلای سەرێی بوو، لەبن میچەکەیدا کونێك هەبوو، بۆ دووکەڵکێش و تیشکی هەتاو وهەوا هاتنە ژوورەوە. پەنجەرەکەیان لە بری شوشە بە کاغەز گرتبوو. دیوارەکان کەفماڵ کرابوون، چوار دەوری تاق و ڕەفە بوو.

کوڕە کەچەڵە بەیانیان دەچوو بۆ دەشتان. چیلکەو گیای دەکردو بە کۆڵ بۆ ماڵێی دەهێنایەوە، بڕێکی لیٚ بە بزنەکە دەداو ئەوی دیکەی لە سەربانەکە کەڵەکە دەکرد تا زستان بیفرۆشێت یان بیداتە بزنەکەی. پاش نیوەڕۆیان کۆترانی هەڵدەفڕان. کۆتر بازێکی چاك بوو. دە پازدە کۆتری هەبوون. فیکەی چاکیشی لێدەدا.

پیرێژنەکەی دایکی لە بەیانی ڕا تا ئێواریٚ بە دیار خەڕەکەوە ڕۆدەنیشت و خوریانی دەڕست. دایك و کوڕ بەو جۆرە ژیانیان دەقەتاند.

ماڵی پاشا لە بەرانبەر ماڵی ئەمان بوو. کۆشك و سەرایەکی ئەوەندە جوان بوو ئەقڵ لە تەماشای حەیران دەبوو. کیژی پادشای ئاشقی کوڕە کەچەڵەی بوو بوو. هەر کاتیٚ کوڕە کەچەڵە بۆ کۆتر هەڵفڕاندن دەچووە سەربان، کیژە پادشا لەگەڵ نۆکەرو قەرەواشەکانیدا دەهاتە بەر هەیوانەکەو تەماشای کۆتربازیی کەچەڵەی دەکرد، گوێی لە فیکە کێشانی وی دەگرت. جار جارێکیش بە چاو و ئیشارەت هەندیٚ شتی بە کەچەڵە دەگوت، بەڵام کەچەڵە گوێی نەدەدایە. وا خۆی دەنواند کە ئاگای لە کیژە پادشای نییە، بەڵام ڕاستییەکەی، کوڕە کەچەڵەش ئاشقی کیژیٚ بوو بوو، بەڵام نەیدەویست کیژە پێی بزانیٚ. دەیزانی پادشا هەرگیز نایەت کیژی خۆی بدات بە بابایەکی کەچەڵ، کە لە هەموو موڵکی دنیادا تاقە بزنێك و دە پازدە کۆتران و پیرە داکێکی هەن. خۆ ئەگەر پاشاش قاییل بیٚ ئەوا کیژی پادشا ناتوانیٚ لەو کولانە دووکەڵاوییەی واندا هەڵکاو وەمێنیٚ.

کیژە پاشا هەرچی دەکردو دەکوشا کوڕە کەچەڵەی بۆ نەدەهاتە قسان. تا ڕۆژیٚ دڵی مەڕێکی کون کون کردو بە بەر پەنجەرەکەیەوە هەڵواسی. بەڵام کوڕە کەچەڵە خۆی لیٚ نەکردە ساحێب. لە پاڵ گەڵە دارو دڕکەکەدا کۆتری هەڵدەفڕاندو فیکەی دەکێشاو گوێی لە دەنگی خەڕەکەکەی دایکی دەگرت.

ئاقیبەت کیژە پاشا نەخۆش کەوت لە جێیاندا کەوت. ئیدی نەدەهاتە بەر هەیوان و سەیری کوڕە کەچەڵەی نەدەکرد.

پادشا گشت حەکیم و لوقمانانی هێنایە سەری. کەسیان نەیان توانی کیژەی بکەنە خەو.

هەموو حەکایەت بێژان لە شوێنی وادا دەڵێن " کیژی پادشا گریێی دڵی بۆ کەس نەکردەوە". لە ترساندا یان لە شەرمو حەیادا، بەڵام من دەلێم کیژی پاشا ڕازی دڵی خۆی بە پاشا گوت.

پاشا کاتێ کە بیستی کیژەکەی عاشقی کەچەڵەی کۆترباز بووە تووڕە بووو نەڕاندی:- ئەگەر جارێکی دی نێوی ئەم چەپەڵە بە دەمتدا بێت، شار بە دەرت دەکەم. چما قاتی پیاوانە وا ئاشقی ئەم چەپەڵە بوویت؟ دەت دەم بە کوڕی وەزیرو بڕایەوە.

کچە هیچی نەگوت. پاشا چوو لە بارەگای خۆی دانیشت. وەزیری گاز کردە کن خۆیو گوتی:- وەزیر، هەر ئەوڕۆکە دەبێ کۆترەکانی ئەو هەتیوە کەچەڵە سەر بڕیو ئیدی هاتنە سەربانی لێ قەدەغان بکەی.

وەزیر چەند خوڵامێکی زەلامی خۆی نارد بۆ ماڵی کوڕە کەچەڵە. کەچەڵە بێ ئاگا لە هەموو شتێ دانی دەدایە کۆترەکانی. لە پڕ خوڵامانی وەزیر ڕژانە ماڵیانو لە چاو تروکانێکدا کۆترەکانیان سەر بڕیو کەچەڵیان مارهەنجن کردو گەڕانەوە. پایەکی خەڕەکەکەی پیرێژنیشیان شکاند، کاغەزی پەنجەرەکەشیان دڕاند.

کەچەڵە یەك هەفتەی ڕەبەق بۆی کەوتو نەجولا. لە خانوەکەی خۆیاندا کەوتبووو دەیناڵاند. پیرێژن مەڵحەمی لە زامەکانی دەداو تووکی دەکرد. پاش یەك هەفتە کەچەڵە هاتە بن دارەکە تا تۆزێ خۆی بداتە هەواو دڵی بکرێتەوە. بیری لەوە دەکردەوە کۆترەکانی لە کوێ بنێژێ، لە پڕ لە سەرێ ڕا دەنگێکی بەر گوێ کەوت. سەیری کرد جووتە کۆترێك لەسەر دار تووەکە نیشتوونەتەوەو قسان دەکەن.

یەکێك لە کۆترەکان گوتی:- خوشکێ، تۆ ئەم کوڕە دەناسیت؟

ئەوی دی گوتی:- نەء ، خۆشکێ.

کۆتری یەکەم گوتی:- ئەمە ئەو کوڕەیە کە کیژی پادشا ئاشقی بوو و لە حەیبەتاندا نەخۆش کەوتبوو. پاشا فەرمانی بە وەزیر کرد، وەزیر خوڵامەکانی ناردو کۆترەکانی ئەمیان سەربڕیو بە خۆشییان تێرو پڕ دارکاری کردوو بەم ڕۆژەیان گەیاند، هەنووکە لە بیری ئەوەدایە کە کۆترەکانی لە کوێ بنێژێ.

کۆتری دووەم گوتی:- بۆچی دەیان نێژێ؟

کۆتری یەکەم گوتی:- ئەدی تۆ دەلێی چییان لێ بکات؟

کۆتری دووەم گوتی:- کاتێ ئێمە هەڵدەفڕین، چوار گەڵا توو لە ژێر پێماندا هەڵدەوەرێ، ئەگەر ئەو گەڵایانە بداتە بزنەکەیو بەشیری بزنەکەی سەرو ملی کۆترەکان چەور بکات، کۆترەکان زیندوو دەبنەوەو کاری ئەوتۆ دەکەن کە تا ئێستا هیچ کۆترێك نەی کردبێ..

کۆتری یەکەم گوتی:- بریا کوڕەکە گوێی لە قسەکانمان دەبوو!..

کۆترەکان هەڵفڕین. چوار گەڵا لە ژێر پێیاندا هەڵوەری. کوڕە کەچەڵە هەر لە حەوا گەڵاکانی گرتەوەو دانی بە بزنەکەیو گوانەکانی پڕبوون لە شیر. کەچەڵە دەفری هێنا. بزنەکەی دۆشی. بە شیرەکەی سەرو ملی کۆترەکانی چەور کرد. کۆترەکان تۆزێ جوڵانەوەو زیندوو بوونەوەو دەوری کەچەڵەیان دا.

پیرێـژن لـە دەنگـی شـەقەی بـاڵی کۆترەکـان وەدەرکـەوت. کەچـەڵە حـاڵو حەکایەتەکـەی بـۆ گێڕایەوە. پیرێژن گوتی:– رۆڵە گیان واز لە کۆتر بازی بێنە، ئەگەر ئەمجارە بچیتە سەربان پادشا دەتکوژێ.

کەچەڵە گوتی:– دایکە، کۆترەکانی من ئیدی ئەو کۆترانە نین کە دیتبوتن، تەماشاکە...

ئەوجا کەچەڵە ڕووی کردە کۆترەکانو گوتی:– کۆترە جوانـەکانمان، کارێ بکـەن کـە دڵـم شـاد بکەنو دایکم رازی بکەن.

کۆترەکان ئەڵقەیان بەستو چپە چپێکیان کردو لە پڕ لە شەقەی باڵیان داو چوون بە حەوادا. کەچەڵەو دایکی واقیان وڕما. ماوەیەك بوری، چ هەوالێك لە کۆترەکانەوە نەبوو. پیرێژن گوتی: – ئەمەش وەفای کۆترە جوانەکانت!...

هێشتا پیرێژن قسەکانی تەواو نەکردبوو کە کۆترەکان لە ئاسمان ڕا دەرکەوتن. سەر کڵاوێکی لبادیان دەگەڵ خۆدا هێنابوو. سەرکڵاوەکەیان دایە کوڕە کەچەڵە. پیرێژن گـوتی:– چ دیارییـەکی بەنرخیان بۆت هێناوە. ئادەی بزانە بە سەرت دەکات یان نا.

کەچەڵە سەر کڵاوە لبادەکەی لەسەر کردو گوتی: دایکە، لێم دێت؟

پیرێژن بە سەرسامی گوتی:– ئەوە لە کوێی، کوڕۆ؟

کەچەڵە گوتی:– هەر لێرەم، دایکە.

پیرێژن گوتی:– سەر کڵاوەکەم وێدە بزانم.

کەچەڵە سـەر کڵاوەکـەی داکەنـدو دایـە دایکـی. پیرێـژن سـەر کڵاوەکـەی لەسـەر کـرد. کەچـەڵە هاواری کرد:– کێوە چوویت، دایکە ؟

پیرێژن وەڵامی نەدایـەوە، کەچەڵە مـاتو سەرسام سـەیری دەوروبـەری دەکرد. لـە پـڕ گـوێی لـە دەنگـی خەڕەکەکـەی دایکـی بـوو. بـەغار وەژوور کـەوت. سـەیری کـرد خەڕەکەکـە خـۆ بـە خـۆ دەسوڕێو خوری دەڕێسـێ. ئێسـتا سـڕی سـەر کـڵاوە لبادەکـەی بـۆ دەرکـەوت. گـوتی:– دایکـە، لـەوەی پتر ئەزیـەتم مـەدە، سـەر کڵاوەکـەم وێـدەوە بـا بـڕۆم بڕێـك خـواردن پەیدا بکـەم. خـەریکە لـە برسان دەمرم.

پیرێژن گوتی:– سوێند بخۆ کە دەست بۆ ماڵی حەرام نەبەی، تا سەر کڵاوەکەت وێدەم.

کەچەڵە گوتی:– سوێند دەخۆم کە دەست بۆ شتانێ نەبەم کە بۆ من حەرامن.

پیرێژن سەر کڵاوەکەی دایەوە کەچەڵەو، کوڕە کەچەڵە لە سەری ناو وەدەرکەوت.

ماڵی حاجی عەلی کارخانەداری کوتاڵ سازی چەند گەڕەکێك لـەولاتر بـوو. چـەند کارخانەیـەکی هـەبوو، سـەدان کرێکـارو خـوڵامو نۆکـەرو قـەرەواشو کارەکـەری هـەبوو. کەچـەڵە بـە دەم ڕێـوە بەخۆی دەگوت:

– ئێ کەچەڵە گیان، بیری لێ بکەوە بزانە ماڵی حاجی بۆ تۆ حەڵاڵە یان نـا. حـاجی عـەلی سامانو پوڵ لە کوێ دێنێ؟ لە کارخانـەکانی؟ بەخۆی کار دەکات نـەء . دەسـت بـە هیچـەوە نـادات. تـەنیا قازانجی کارخانـەکان وەردەگرێو خۆش ڕادەبوێرێ. ئەدی کێ رەنج دەدات؟ کەچـەڵ گیـان بـاش مێشکت بخـە کـار. شـتێکت لێ دەپرسـم، راسـتم پـێ بڵـێ، ئەگـەر خـەڵکی کـار نەکـەن کارخانـەکان

چییان لێدێت؟ وەڵام:– دەخەون. پرسیار:– ئەوساکەش کارخانەکان قازانجیان دەبێ؟ وەڵام: – هەڵبەتە نەء . ئەنجام:– کەواتە کەچەڵ گیان، بەم پرسیارو وەڵامانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کرێکاران کاردەکەن و هەموو قازانجەکەی حاجی عەلی دەیبات و تۆزێکی بە کرێکاران دەدات. کەواتە سەروەت و سامانی حاجی عەلی هی خۆی نییە، بۆ من حەلاڵە.

کەچەڵە بە خەیاڵی ئاسودەوە خۆی بە ماڵی حاجی عەلیدا کرد. چەند خولام و کارەکەرێك لە حەوشەکەی دەرێ ڕا لە هاتووچۆدا بوون. کەچەڵە بە نێویانا ڕەت بوو، شتاقیان پێی نەحەسییان.

حاجی عەلی لە حەوشەی ناوەوە لەگەڵ چەند ژنێکیا لەسەر تەختێك و لە ڕۆخی حەوزەکەدا دانیشتبوو وعەسرە بەرکوڵی دەخوارد. نان و چاو هەنگوین و قەیماغیان دەخوارد. کەچەڵە دەمی ئاوی کرد.چووە پێشێ و بابۆڵەیەکی بۆ خۆی هەڵگرت. حاجی عەلی کە تەمەشای کرد بینی نیوەی هەنگوین و قەیماغەکە نەماوە. کەوتە وێرد خوێندن و بسم اللە و تەزبێحات. کەچەڵە چایەکەی حاجی عەلی هەڵگرت و هەڵی قوورِاند. ئەمجارەیان ژنەکان و حاجی عەلی لە ترساندا قیژاندیان و هەموو شتەکانیان بەجێ هێشت و غاریان دا بۆ ناو ژوورەکان. کەچەڵە هەموو هەنگوین و قەیماغەکەی خوارد، چەند چایەکی بەسەرا کردو چوو تا ژوورەکان بگەڕێ. ژوورەکان ئەوەندە شتی گران قیمەت و بە بەهایان تێدا بوو، کەچەڵە تەواو حەپەسا بوو.

مۆمدانی زێڕو زیو، پەردەی زێرکفت. قاڵی و قاڵیچەی بێ حیساب، دەفرو ئامانی زیوو و بلوورو گەلێك شتی دی. کەچەڵە هەرچی بەگەن دەکردو لە بەرکیدا جێی دەبۆوە هەڵی دەگرت.

ئەنجام کلیلی قاسەکەی حاجی عەلی دۆزییەوە. شەوێ کە هەموویان خەوتبوون، قاسەی کردەوە، تا توانی پارەی هەڵگرت و وەدەرکەوت. ماڵی چەند پارەدارێکی تریشی بڕی و لە نیوە شەو بەدواوە بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. تۆزێك پارەی بۆ خۆی هەڵگرت و ئەوەکەی تری لە ڕێگادا بەسەر ماڵە هەژارەکاندا بەشییەوە.

لە دەرکی ماڵەکانی دەدا، خاوەن ماڵ دەهاتە بەر دەرکە، کەچەڵە دەیگوت:– ئەم تۆزە زێڕو دوو هەزار تمەنە بۆ منداڵەکانت خەرج بکە. بەشی خۆتە. لای کەس قسان مەکە.

کە خاوەن ماڵ دەهات دەرکە بکاتەوەو بزانێ کێیەو دەنگ لە کوێوە دێت، دەی بینی چنگێ زێڕو دنیایە پارە ڕژاوەتە بەر پێی و چ کەسێك لەو ناوە نییە.

کەچەڵە درەنگانێ گەییەوە ماڵێ. پیرێژن هێشتا نەخەوتبوو. دڵ پەشێوی کەچەڵە هێشتا بە دیار خەڕەکەکەوە بوو. خەو چاوەکانی قورس کردبوون.

کۆترەکان لە نێو هێلانەکەیان لێرەو لەوێ سەریان خستبووە بن باڵیان و خەوتبوون. کەچەڵە بەبێ خشپە وەژوورکەوت لە تەنیشت دایکییەوە ڕۆنیشت و لە پڕ سەر کڵاوەی داکەند. پیرێژن هەرکە چاوی بە کوڕەکەی کەوت شاد بوو. گوتی:– بۆ وا دواکەوتووی ڕۆڵە. تا ئەم درەنگە شەوە لە کوێ بووی؟

کەچەڵە گوتی:– لە ماڵی حاجی عەلی کوتاڵ ساز بووم، ماڵی ئەو خەڵکەم لێی دەستاندەوە.

پیرێـژن ئاشــی ســاواری بـۆ کەچـەڵە هێنـا. کەچـەڵە گـوتی:- هێنـدەم هـەنگوین و قـەیماغ خواردەوە، ئەگەر تا یەك هەفتەی دی هیچ نەخۆم برسیم نابێتەوە.

پیرێژن بە تەنیٚ شیوی خواردو هەندێك شیری بەسەردا کردو هەستان و نووستن.

کەچەڵە بەر لەوەی بنویٚ هەرچی ساوارێکیان هەبوو ڕشتییە بەر کۆترەکان. بەیانی زوو سەر کڵاوەکەی لەسەر کردو چووە سەربان و کەوتە کۆتر هەڵفڕاندن و فیکە کێشان. دارێکی درێژی بە دەستەوە گرتبوو و پارچە پەڕۆیەکی بەسەرەکەیەوە بەستبوو.

کیـژی پاشـا، نـەخۆش و بـیٚ تاقـەت لـە پشـت پەنجەرەکـەوە ڕاکشـا بـوو، چـاوی بـڕی بـووە سەربانەکەی ماڵ کەچەڵە، لە پڕ چاوی بە کۆترەکانی کەچەڵە کەوت کە خەریکی هەڵفڕین بوون. دەنگی فیکە کێشانی کەچەڵە دەهات و بە خۆی لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوو. تەنیا دارەکەی دیار بوو. لە حەوادا دەجوڵا و کۆترەکانی دەفڕاند.

نۆکـەرانی وەزیـر بـە وەزیریـان گـوت، وەزیـر خەبـەری دایـە پادشـا کـە کەچـەڵە دەسـتی بـە کۆتربازی کردۆتـەوەو لەوەیە حاڵی کیژەکە خراتر ببیٚ. پاشا وەزیـری نـارد کـە بچـیٚ کۆترەکـان بگریٚ و سەریان ببڕیٚ.

لەم لاوە کیژی پادشا نیگەرانی کەچەڵە بوو، کەنیزەکە رازگرەکەی خۆی نارد بۆ کن پیرێـژن تـا خەبەریٚ بنێریٚ و بە پیرێژن بڵیٚ کیژی پادشا عاشقی کەچەڵەیە و تەگبیرێکی بۆ بکات.

لەم لاشەوە حاجی عەلی و دەوڵەمەندانی دی بە هەڵەداوان رژانە کۆشکی پادشاوە کە: ماڵمان وێران بوو، ژیانمان بە باچوو. ئەدی تۆ پادشای چیت؟ پادشایەتیت بۆ کەیە؟ قۆشـەنت بنێـرە سەر دزان و، ماڵ و سامانەکەمان بۆ وەربگرەوە....

با ئەمانە لێر ەدا بەجیٚ بهێڵین و بزانین لە ماڵی کەچەڵە چ باسە.

کەچـەڵە سـەرکڵاو لەسـەر، لەسـەر بـان کـۆترانی هەڵدەفڕاند. پیرێـژن عـەبا بەسـەر، لـە ژووریٚ را خوریـانی دەڕسـت. بزنەکـە لـە حەوشـەیدا دەسـوڕایەوەو ئـەو گـەڵا تووانـەی دەخـوارد کـە بایەکـە دەیخستن.

پیرێژن کتوپڕ سەری هەڵبڕی و سەیری کرد بزنەکەی چاوی بڕیوەتە چاوانی. پیرێـژنیش چاوی بڕییە چاوانی بزنە. دەتگـوت بزنـە دەڵـیٚ:- کەچـەڵەو کۆترەکـان لـە خەتـەردان. ڕاکـە گـەڵا تـووم بـۆ بێنە تا بیخۆم و پێت بڵێم چ کاریٚ بکەی.

پیرێـژن ماتـەڵ نـەبوو. هەسـتا دارێکـی درێـژی هـەڵگرت و گـەڵا تووی هەڵوەرانـد. بزنـە هـەر خواردی و خواردی تا تەنگەی تەواو هەستا.ئەوجا چاوی بڕینـە دوڕ چاوانی پیرێژن. وەك بڵێـی گـوتی:- زۆر مـەمنون پیرێـژن. نووکـە تـۆ وەژوورکـەوە. مـن بـە خـۆم دەچـمە سـەربان و هاریکـاری کەچەڵە و کۆترەکان دەکەم.

پیرێـژن ئیـدی هیچـی نـەگوت و چووە ژوورەوە. بزنـە لـە قاڵدرمەکانـەوە سـەرکەوتە سـەربان و لـە پاڵ گەڵەکەدا وەستاو هەمدیس دەستی بە خواردن کرد.

زۆری پیٚ نەچوو کە چەند خوڵامێکی وەزیر رژانە حەوشەوە.

داری کۆتر هەڵفڕاندنەکە هەر ئەملاو ئەولای دەکرد. هەر کەسێ دەیویست سەرکەوێتە سەربان، دارەکەی وێ دەکەوت و دەکەوتە خوارەوە، ئەنجام هەموویان گەڕانەوە کن وەزیر.

کیژی پادشا لە پشت پەنجەرەکەوە هەموو شتێکی دەبینی و کەمێ حاڵی باش بوو بوو. ئەمە بۆ ئەو دڵخۆشکەرە بوو.

پادشاو حاجی عەلی کارخانەدارو دەوڵەمەندەکانی دی ڕۆنیشتبوون و قسانیان دەکرد و تیا مابوون کە کام دزی جەربەزە بە تاقە شەوێك ئەم هەموو ماڵەی بڕیوەو ئەو هەموو سەروەت و سامانەی لەگەڵ خۆدا بردووە. لەم کاتەدا وەزیر وەژوورکەوت و گوتی:- پادشا شتێکی عەجایەب رووی داوە. کەچەڵە بەخۆی دیار نییە، بەڵام داری کۆتر هەڵفڕاندنەکەی لە سەربان کۆتر دەفڕێنێ و نایەڵێ چ کەسێك توخنی کۆترەکان بکەوێ.

پادشا گوتی:- کەچەڵە بگرن و بۆمی بێنن.

وەزیر گوتی:- پاشا، عەرزم کردیت کە کەچەڵە لە هیچ کونێکەوە دیار نییە، دایکی بە تەنێ لە کوختەکەدایەو چ خەبەرێکی لە کەچەڵەوە نییە.

حاجی عەلی گوتی:- پادشا، هەرچییەك هەیە، لە ژێر سەری کەچەڵەدایە. بە نیشانەکانیا وا دەزانم هەر کەچەڵە ماڵەکانی هەموومانی بڕیوە.

ئەوجا باسی ون بوونی کتوپڕی هەنگوین و قەیماغ و چایەکەی کرد. یەکێکی دی لە دەوڵەمەندەکان گوتی:- بە بەرچاوی خۆمەوە، ملە لیرەکەی ژنەکەم بە گەردنییەوە نەما. دەتگوت بوو بە هەڵم و چوو بە ئاسمانا.

یەکێکی دی گوتی:- منیش بینیم کە ئاوێنە چوارچێوە زێڕەکەمان لە تاقەکە بەرزبووەوەو ڕۆیی. تا ویستم بکەومە خۆ سەیرم کرد ئاوێنە نەما. حاجی عەلی ڕاست دەکات، هەموو ئەم کارانە لە ژێر سەری کەچەڵەدایە.

پادشا تووڕەبوو فەرمانی دا کە قۆشەن ئامادەبێت و بڕۆن ماڵی کەچەڵە ئابڵوقە بدەن و بە زیندوویەتی یا بە مردوویەتی بیهێنن.

ڕێك لەم کاتەدا کیژە پادشا و قەرەواشەکەی پێکەوە دانیشتبوون و دوو بە دوو داخاوتن. قەرەواشەکە کە تازە لە کن پیرێژن هاتبووەوە دەیگوت:- خانم، دایکی کەچەڵە دەیگوت:- کەچەڵە زیندووەو حاڵی زۆر باشە. ئەو شۆ دەی نێرم و دێتە کن کیژە پادشا و بەخۆی قسانی لەگەڵ دەکات..

کیژی پادشا بە سەرسامیەوە گوتی:- کەچەڵە دێتە کن من؟ چتۆ دەکارێ بە نێو ئەم هەموو قۆشەن و لە شکرەدا ڕەت بێ و بێت؟ بریا بتوانێ بێت!...

کەنیزەکەکە "قەرەواش" گوتی:- خانم، کەچەڵان هەزارو یەك فەند دەزانن. شەوێ چاوەڕوانی دەبین و هەر دێت .

لەم کاتەدا لە پەنجەرەکەوە تەماشایان کرد، سەیریان کرد قۆشەن چەشنی ئەنگوستیلە دەوری ماڵی کەچەڵەیان گرتووە. کیژی پادشا گوتی:- ئەگەر هەزار ڕۆحی هەبێ شتاقیان دەرباز نابێ. ژارۆ کەچەڵەی من!..

هەنووکــە ئیــدی کۆترەکــان لــە ســەربان نیشــتبوونەوەو دانیــان دەخــوارد. داری کــۆتر هەڵفڕاندنەکە ڕاست ڕاوەستابوو. بزنەکە لێکدا لێکدا گەڵاو گوڵی دەخوارد و هەڵماتی کوڵکو سەر شکێنی لە پاشەڵڕا دادەنا.

قۆشەن حازرو ئامادە وەستابوو. سەر لەشکر بە دەنگی بەرز دەیگوت:- ئەهای کەچەڵە، ئەگەر هەزار ڕۆحت هەبن، شتاقیان بەسەلامەتی دەرناچن. خەیاڵت خاوە.. تا زووە تەسلیم بە، دەنا پارچە پارچە دەکرێی..

پیرێژن لە ژورێ ڕا لە ترساندا هەڵدەلەرزی. خەڕەکەکەی وەستابوو. لە کونی میچەکەوە هەڵی روانی، بەڵام هیچی نەبینی.

لەم کاتەدا کەچەڵە بە کۆترەکانی دەگوت:- کۆترە نازدارەکانم چما نابینن بزنە ڕەش چ دەکات ؟ هەڵمات بۆ ئەنگۆ دروست دەکات. کارێ بکەن دڵم شاد بکەنو دایکم رازی بکەن..

کۆترەکان ئەڵقەیان بەست، چپەچپێکیان کردو هەڵفڕینو لە چاو ون بوون.

سەر لەشکر دیسان گوتی:- ئەهای کەچەڵە بۆ ئاخر جار پێت دەڵێم ئەمرت پێ دەکەم، دەست لە کەڵەك هەڵگری. تۆ دەرەقەتی ئێمە نایەیت. ئاقیبەت دەگیرێیو ئەوساکە پەشیمانی دادت نادات. لە هەر شوێنێکی وەرە تەسلیم بە!..

کەچەڵە هاواری کرد:- جەنابی سەر لەشکر، زۆر ببوورە کە ماتەڵم کردن. خەریك بوو دۆخینەکەم دەبەست، هەر ئێستا دەگەمە خزمەتتان. تۆ جگەرەیەك داگیرسێنە وا هاتم.

سەر لەشکر زۆر خۆشحاڵ بوو کە بەبێ گۆبەند کەچەڵەی گرتووە. جگەرەیەکی داگیرساندو گوتی:- عەجەب فێڵێکە!.. دەنگت لە چ گۆڕێکەوە دی؟

کەچەڵە گوتی:- لە گۆڕی بابو داکتەوە!..

سەر لەشکر تووڕە بووو هاواری کرد:- ناکەس بەچە؟ پێت وایە من کێم وا ڕادەبوێری؟..

لەم کاتەدا سەدان کۆتر لە چوار نکالی حەوادا پەیدابوون. کۆترەکانی کەچەڵە لە ناوەندیانا بوون. بزنەکە خێرا خێرا دەلەوەڕیو هەڵماتی لە پاشێ ڕا دەردەدا.

کەچەڵە هەڵماتێکی هەڵگرتو هاواری کرد:- جەنابی سەر لەشکر بنۆڕە بزانە من لە کوێم.

هەڵماتەکەی بەرەو سەر لەشکر هاوێشت. سەر لەشکر سەری بەرز کردبۆوە، جگەرەکەی بەلا لێویەوە گرتبوو، خەریك بوو سەیری حەوای دەکرد، هەڵماتەکە ڕێك لە نێوان هەردوو برۆی داو هاواری لێ هەستا. قۆشەنەکە لە جێی خۆی جما، بەڵام کۆترەکان بواریان نەدان، هەڵمات بارانیان کردن. هەڵماتەکانیان بە دەنووك هەڵدەگرتو بەرز دەبوونەوەو لە ئاستی لەشکرەکەدا بەریان دەدانەوە.

هەڵماتەکان بەسەر سەری هەر کەسێ دەکەوتن دەیان شکاند.

قۆشەنەکە شەوێ کشانەوە. کەچەڵە بزنو کۆترەکانی هێنایە خوارەوە. کۆترەکانی دیش رۆشتن.

پیرێژن بەو پارەیەی کە کەچەڵە وێی دابوو، شیوێکی بەڕاستی شیوی دروست کردبوو. وەکو چەند شەوە شیوە درۆزنە نەبوو: پاروە نانێکی وشك یان تۆزێ ساوار یا نانی تەڕکراو. گەنمی بۆ کۆترەکانیش کڕی بوو. بزنەکەش وێنجەو جۆی خوارد.

پاش شیو خواردن پیرێژن بە کەچەڵەی گوت:- هەنووکە سەر کڵاوەکەت لەسەرکەو هەستە بچۆ بۆ کن کیژە پادشای. من قەولم داوە کە تۆ بۆ کنی بنێرم.

کەچەڵە گوتی:- دایکە، ئاخر ئێمە لە کوێ و کچە پادشا لە کوێ! پیرێژن گوتی:- تۆ هەستە بچۆ بزانە چ دەڵێ..

کەچەڵە سەر کڵاوەکەی لەسەر کردو ڕۆیی. بە نێو قۆشەن و لەشکراندا تێ پەڕی و خۆی بە ژووری کچە پاشادا کرد. کیژە پادشا لەگەڵ کەنیزەکەکەیدا شیوی دەخوارد. حاڵی باش بوو بۆوە.

بە کەنیزەکەکەی گوت:- ئەگەر کەچەڵە بزانێ چەندم خۆش دەوێ یەك دەققە ماتەڵ نەدەبوو، بەڵام دەترسم بکەوێتە دەستی نۆبەدارەکان و بکوژرێ. دڵم دەترسێ.

کەنیزەکەکە گوتی:- بەڵێ خانم، منیش دەترسم، پادشا ئەمری کردووە کە ژمارەی نۆبەدارەکان بکرێ بە دوو هێندەی شەوانی دی. کوڕی وەزیریان کردوە بە مەسئولیان.

کەچەڵە هات لە تەنیشت کیژی پادشاوە ڕۆنیشت و دەستی بە نان خواردن کرد. شیوی پڵاوو مریشك بوو لەگەڵ چەندین جۆری مرەباو چێشتی دی دا.

خانم و کەنیزەکەکە لە پڕ بینیان کەلایەکی دەورێیەکە خەریکە خێرا خێرا بە تاڵ دەبێ و ڕانە مریشکێکیش هەڵگیراو ون بوو.

کەنیزەکەکە گوتی:- خانم، تۆ هەر چییەك دەڵێی بیڵێ. من دڵنیام کە کەچەڵە لە ژوورەوەیە. ئەم کارە کاری ئەوە. ئەدی پێم نەگوتیت کەچەڵان هەزارو یەك فەندیان هەیە!...

کیژە پادشا شاد بوو، گوتی:- کەچەڵە گیان، ئەگەر لە ژوورەوەی خۆت نیشان بدە. دڵم بۆت نەماوە.

کەچەڵە چ قسەیەکی نەکرد. کەنیزەکەکە گوتی:- خانم، لەوەیە لەبەر من خۆی نیشان نەدات. من دەچم تاقیبی نۆبەدارەکان دەکەم. وەختێ کەنیزەکەکە ڕۆیی، کەچەڵە کڵاوەکەی لەسەری داکەند.

کیژی پادشا لە پڕ بینی کەچەڵە لە تەنیشت ئەوەوە دانیشتووە. خۆشحاڵ بوو گوتی:- کەچەڵە، چما نازانی من شێت و شەیدای تۆم، وەرە هەڵمگرەو گیانم ڕزگار بکە. پادشا دەیەوێ بمدات بە کوڕی وەزیر.

کەچەڵە گوتی:- ئاخر خانم، تۆ بابایەکی شازادەیت، چۆن دەکاریت لەو کوختە دوو کەلاوییەی ئێمەدا هەڵبکەیت؟

کیژی پادشا گوتی:- من ئەگەر لەگەڵ تۆ دابم تەحەمولی هەموو شتێ دەکەم. کەچەڵە گوتی:- من و دایکم بە تۆبزی خۆمان پێ بەخێو دەکرێ، چتۆ دەتوانین تۆ بەخێو بکەین؟ بە خۆتیش شازادەیت و چ کارو کەسبێ نازانی.

کیژی پادشا گوتی:- کارێك فێر دەبم.

کەچەڵە گوتی:- چ کارێك؟!

کیژە گوتی:- هەر کارێ تۆ بڵێی...

کەچەڵە گوتی:- هەنووکە باشە. بە دایکم دەڵێم فێری خوری رستنت بکات. تۆ چەند رۆژێ سەبر کە، من بەخۆم دێم و ئاگادارت دەکەمەوە کە کەی لێرە برۆین.

با کەچەڵەو کیژە پاشا لێرەدا خەریکی قسان بن و بچین بەلای کوڕی وەزیرەوە کە ئاشقی کیژە پاشا بوو، بوو بوو بە سەرۆکی نۆبەداران. کەچەڵە وەختێ هاتبوو بۆ لای کیژە پادشا، سەیری کردبوو کوڕی وەزیر لەسەر کورسییەك ملی لاربۆتەوەو خەوتووە. هاتبوو بە سەریا، شمشێرو ڕمەکەی هەڵگرتبوو و لەگەڵ خۆیدا هێنا بووی. کوڕی وەزیر کە لە خەو ڕابوو و چەك و ئەسڵەحەکەی نەبینی، زانی کەچەڵە هاتووەو کار لە کار ترازاوە. یەکسەر هەموو نۆبەدارەکانی بۆ حەرەمسەرای کچە پادشا ناردبوو. نۆبەداران کەنیزەکەیان لەبەر دەرکە بینی. یەکێکیان بە تۆبزی دەرگای کردەوەو سەیری کرد کوڕە کەچەڵەو کیژی پادشا سەرگەرمی قسانن. خێرا دەرگای گرت و هاواری کرد:- کەچەڵە لێرەیە. خێراکەن وەرن!... کەچەڵە لێرەیە.

کوڕی وەزیرو ئەوانی دی بە هەڵەداوان هاتن، پادشا لەم هەراو هۆریایە خەبەری بۆوە، لە بارەگای خۆیدا دانیشت و ئەمری کرد کەچەڵەی بە زیندوویێتی و یا مردوویێتی بۆ بێنن.

کوڕی وەزیرو چەند نۆبەدارێکی دی خۆیان بە ژووری کچە پادشادا کرد. کیژی پادشا لەسەر سیسەمەکەی راشکا بوو و چیرۆکی دەخوێندەوە. چ خەبەرێك لە کەچەڵەوە نەبوو. کوڕی وەزیر کە ئاشقی کیژە پادشا بوو پرسی:- شازادە خانم تۆ نەت بینی ئەم کەچەڵە کێوە چوو؟ نۆبەدارەکە دەڵێ دەقیقەیەك لەمەو پێش لێرە بوو.

کیژە بە توندییەوە گوتی:- باوکم تەواو بێ غیرەت بووە، ڕێی ئەنگۆ دەدا بەم شەوە بێنە حەرامسەرای کیژە نەخۆشەکەیەوەو تۆش بێ شەرمانە ئەم قسەیە بەرووی مندا دەدەی. خێرا هەرۆ دەرێ!

کوڕی وەزیر بە ئەدەب و نەزاکەتەوە گوتی:- شازادە خانم، ئەمری خودی پادشایە کە هەموو پەناو پاسارەکان بگەڕێین. من مامورم و چ گازاندەیەکم لەسەر نییە. ئەوجا هەموو کون و کەلەبەرێکی ژوورەکە گەڕان. هیچیان نەدۆزییەوە جگە لە شمشێرو ڕمەکەی کوڕی وەزیر نەبێ کە کەچەڵە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی و لەژێر سیسەمەکەدا تاقاتی کردبوو. کوڕی وەزیر گوتی: شازادە خانم، ئەمانە هی منن. کەچەڵە لێی دزیوم. ئەگەر خۆی لێرە نییە، ئەدی ئەمانە لێرە چ دەکەن من ئەمە بە پادشا دەڵێم.

لەم کاتەدا کەچەڵە لە تەنیشت کیژی پادشاوە وەستابوو، بەچپە پێی دەگوت:- تۆ مەترسە، خۆت لە چ شتێك مەکە ساحێب، بەم زووانە دێم بە دواتا.

ئەوجا بە نێو نۆبەدارەکاندا رۆیی و گەییە بەردەرکە "٣-٤" کەس لەبەر دەرگا وەستابوون و رەت بوون مەحاڵ بوو. ویستی بیکات بە قرەقرِوقەرەباڵغی و هەڵێ، کە لەپڕ پێی لە شتێك هەڵنووتا و سەر کڵاوەکەی کەوت.

کەچەڵە هەر چەندە زۆری گوت کە سەر کڵاوەکەم بدەوە، ئاخر جوان نییە بەسەری کۆت بچمە کن پادشا، کوڕی وەزیر قەبوڵی نەکرد.

پادشا بە تووڕەیی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتبوو چاوەڕێی دەکرد. کاتێ کە کەچەڵە گەییە نزیکی پاشا، پاشا هاواری کرد: حەرامزادە، هەر غەڵەتێکت کردووە بە جێی خۆی، ماڵی خەڵکیت بڕیوە، قۆشەنەکەت مەحوکردەوە، بەڵام بە چ غیرەتێ وەژووری کیژی من کەوتی؟ هەر ئێستا ئەمر دەکەم وەزیرەکەم بێ و قورقوشمی تواوەت بە گەرودا بکەن.

کەچەڵە گوتی:- پادشا هەر ئەمرێ بکەی قاییلم. بەڵام جارێ ئەمرکە با دەستم بکەنەوەو سەر کڵاوەکەم بدەنەوە چونکە بێ ئەدەبییە لەبەردەم پاشادا دەست لەسەر سینگ نەبم‌و بەسەری کۆت بوەستم.

پادشا ئەمری کرد دەستی بکەنەوەو کڵاوەکەی بدەنەوە.

کوڕی وەزیر ویستی کڵاوەکەی نەداتەوە، بەڵام زاتی نەکرد قسەی پادشا لە عاردی بدات. کڵاوەکەی دایەوەو دەستی کردنەوە.

کەچەڵە کڵاوەکەی کردە سەری‌و دیار نەما . پادشا لە جێی خۆی ڕاپەڕی‌و هاواری کرد: ئەوە کێوە چوویت هەتیو؟ بۆ چاو شارکێمان دەگەڵ دەکەی؟

کوڕی وەزیر بە ترسەوە گوتی:- قوربان بۆ هیچ شوێنی نەچووە، لە ژێر کڵاوەکەدا خۆی شاردۆتەوە. ئەمرکە با دەرگاکان قایم کەن دەنا هەر ئێستا دەڕوات.

کەچەڵە تا کەوتە خۆی بۆ ئەوەی هەڵێ. سەیری کرد بە تەواوی کەوتۆتە تەڵەوە. نۆبەدارەکان بە جۆرێ دەوری ژووری پاشایان دابوو تەنانەت مشکیش نەیدەتوانی کونێ بدۆزێتەوەو لێوەی بڕوات.

پادشا کە بۆی دەرکەوت کەچەڵە نایەتە گرتن داوای جەلادی کرد. جەلاد هات.. پادشا ئەمری کرد:- جەلاد، لەملی ئەو هەتیوە حەرامزادەیەی وەزیر بدە!..

کوڕی وەزیر پەشۆکاو کەوتە پاڕانەوە. پادشا گوتی:- هەی بیژی حەرامزادە تۆ کە دەتزانی سەر کڵاوەکەی کەچەڵە چتۆ سەر کڵاوێکە بۆ بە منت نەگوت؟ جەلاد ڕەحمی پێمەکەو لە ملی بدە!

بەم جۆرە کوڕی وەزیر لە نیوەشەو بە دواوە کوژرا.

هەنووکە بابێینەوە بۆ لای کیژی پادشا. وەختێ بینی کەچەڵە تێکەوتووەو کوڕی وەزیر کوژراوە، بە کەنیزەکەی گوت: دەزانی ئەگەر وەزیر بێت ئێمەش تێوە دەگلێین؟ کەواتە بۆ دەستەو ئەژنۆ دانیشین؟ هەستە بچین بۆ لای دایکی کەچەڵە. بەڵکو تەگبیرێ بکەین. کەچەڵەی بەلەنگاز خەریکە تیا دەچێ.

نۆبەدارەکان هێندە سەریان قاڵ بوو، ئاگایان لە ڕۆشتنی ئەمان نەبوو. پیرێژن بە تەنێ لە ژوورەوە دانیشتبوو‌و خوری دەڕست. بزنەکەو کۆترەکان خەوتبوون.

کیژی پادشا بۆ پیرێژنی گێڕایەوە کە کەچەڵە چۆن گیرۆدەبووەو هەنووکە دەبێ تەگبیرێ بکەن.

پیرێژنەکە بیرێکی کردەوە. چوو بزنەکەی هەستان، کۆترەکانی خەبەر کردەوەو گوتی:- ئەهای بزنە زرینگە ریشنەکەم، ئەهای کۆترە نازدارەکانی کەچەڵەی دڵم، کوڕەکەم لە ماڵی پادشادا گیری خواردووە. کارێ بکەن دڵی کەچەڵەم خۆش بکەن‌و من ڕازی بکەن. ئەمەش کیژی پادشایەو دەیەوێ ببێ بە بووکم، لەخەم بی خەلەسێنن!..

بزنەکە خواردنی ویست. پیرێژن‌و کچەکان گەڵاو گۆتی دار تووەکەیان بۆ هێنا. کۆترەکان چوون دۆستەکانی خۆیان هێنا. بزنە دەستی بە خواردن‌و هەڵمات دروست کردن کرد،.. پیرێژن تەنووری داخست، ساجی خستە سەری تا گەنم بۆ کۆترەکان بکاتە برێشکە.

کۆترەکان گەنمیان دەخواردو هەڵماتەکانیان هەڵدەگرت‌و هەڵدەفرین‌و هەڵماتەکانیان بەسەر قۆشەن‌و نۆبەداراندا هەڵدەڕشت. بەو تاریکەشەوە کەس چی لە دەست نەدەهات.

هەنووکە وەزیریش ئاگادار بووبۆوەو هاتبوو. بە پادشای گوت:- پاشا ئەگەر کار وا بڕوات تا یەك دوو سەعاتی دی کۆترەکان هەرچی دارو دیوار هەیە بە سەرمانا دەیڕوخێنن. چاکتر وایە کەچەڵە بەرەڵڵا بکەین‌و دانیشین بیرێکی دروستی لێ بکەینەوە.

پادشا قسەی وەزیری بەگەن کرد، ئەمری کرد، دەرگاکانیان کردەوەو خۆیشی بە دەنگی بەرز گوتی:- ئەهای کەچەڵە بڕۆ گۆڕت لێرە گومکە!.. ڕۆژێ دێ چارت بکەم.

چەند دەققەیەك بەبێ دەنگی تێپەڕی. کەچەڵە لە نێو حەوشەوە هاواری کرد. قوربان بەم بۆنەیەوە دەبێ ئەوەتان عەرز بکەم کە لە هیچ شوێنێ بەم چەشنە ڕەفتار لەگەڵ خوازبێنیکەردا ناکەن..

پادشا گوتی:- ئەحمەق، تۆ لە کوێ‌و کیژی پادشا لە کوێ؟

کەچەڵە گوتی:- پادشا، کیژەکەتم بدەیە تا بە کۆترەکان بڵێم وازبێنن‌و من‌و کیژەکەت دڵدارو دڵخوازین.

پادشا گوتی:- من ئیدی کیژی وا بێ حەیام ناوێ. هەر ئێستا دەری دەکەم...

پاشا چەند نۆکەرێکی نارد کە کیژەکەی دەربکەن، نۆکەرەکان گەڕانەوەو گوتیان:- پادشا کیژەکەت بەخۆی ڕۆییوە.

کەچەڵە چیدی نەگوت‌و ئیشارەتێکی بۆ کۆترەکان کردو ڕۆیی بۆ ماڵی خۆی. دایکی‌و کیژە پاشاو کەنیزەکەی شیری گەرمیان دەخوارد.

* * *

کەچەڵە بەو تۆزە زێڕو زیوەی کیژی پادشا لەگەڵ خۆی هێنا بووی‌و بەو پارەیەی کە خۆی‌و دایکی‌و کیژی پادشا بە دەستیان دێنا، ماڵ‌و حاڵێکی باشی پێکەوەنا، بەڵام هێشتا چیلکەو داری دێنا، کۆتربازی دەکردو بزنەکەی لە ژێر دارتووەکەدا دەبەستەوە، دایکی‌و ژنەکەشی خوریان دەڕست و ژیانی خۆیان دابین دەکرد.

کەنیزەکەشیان ئازاد کردبوو و بۆ خۆی مێردی کردبوو. ئەویش بوو بە خاوەن ماڵ‌و حاڵی خۆی.

حاجی عەلی کارخانەدارو ئەوانی دی هێشتا هەر دەهاتنە کن پاشاو شکایەتیان لە دەستی کەچەڵە دەکرد، بە تایبەتی کەچەڵە جار جارێ دەستی بۆماڵیان دەبرد. هەڵبەتە هیچ کاتێ هیچی بۆ خۆی هەڵنەدەگرت.

پاشاو وەزیر هەموو رۆژێ دادەنیشتن و نەخشەیان بۆ کەچەڵەو کۆترەکانی دەکێشا، پاشا کوڕە بچووکی وەزیری کردبوو بە سەرۆکی نۆبەداران و دەمی وەزیری بەستبوو تا چ شتێك دەربارەی کوژرانی کوڕە گەورەکەی نەڵێ...

** *

هەموو حەکایەت بێژان دەڵێن کە "چیرۆکەکەی ئێمە لێرەدا تەواو بوو".

بەڵام من دڵنیام کە چیرۆکەکەی ئێمە هێشتا تەواو نەبووە، رۆژێ دێ درێژە بەم چیرۆکە دەدەین....

(١٩٦٦=١٣٤٥)

## کوڕیژگەی چەوەنەر فرۆش

چەند ساڵێ لەمەوبەر لە گوندێکدا مامۆستا بووم. قوتابخانەکەمان تاقە یەك ژوور بوو. یەك دەرکەو یەك پەنجەرەی هەبوو کە بە دیوی دەرێ ڕا دەکرانەوە. قوتابخانەکە بە ئەندازەی سەد شەقاوێك لە گوندەوە دوور بوو و سی و دوو (٣٢) قوتابیم هەبوو، پازدەیان پۆلی یەك بوون هەشتیان پۆلی دوو بوون. شەشیان پۆلی سێ بوون. سێیان پۆلی چوار بوون. لە ئاخرو ئۆخری پایزێ ڕا منیان بۆ وێندەرێ نەقڵ کردبوو. قوتابییەکان ٢-٣ مانگان بوو بێ مامۆستا بوون. منداڵەکان کە چاویان بە من کەوت لە خۆشییاندا کەوتنە قریوە قریوو دەنگە دەنگ. تا ٤-٥ ڕۆژان قوتابخانەکە بێ سەروبەر بوو. ئەنجام توانیمان قوتابییەکان لە دەشت و دەرو لە کارخانەکانی مافورچنی و لێرەو لەوێوە خڕ بکەمەوەو بیانهێنمەوە بۆ قوتابخانە، بەشی زۆری منداڵەکان کە کاریان چنگ نەدەکەوت دەچوونە کن حاجی قولی فەرش چن و لە کارخانەکەی وێدا کاریان دەکرد. هەرە ئازاکەیان ڕۆژانەی "١٠- ١٥" ریاڵ بوو. حاجی قولی لە شارەوە هاتبوو، کەوتبووە سەر فێڵەکەی، کرێکارانی شار کرێی پێشوەختیان وەردەگرت و ڕۆژانەشیان لە چوار تومەن کەمتر نەبوو، بەڵام لە گوندا باڵاترین ڕۆژانە "٢٠- ٣٥" ریاڵ بوو.

دە ڕۆژێك بوو هاتبوومە ئەم گوندەی. بەفر کەوت. زەوی بەستی. درزی دەرگاو پەنجەرەکەمان بە کاغەزی سپی گرت تا سەرما نەیەتە ژوورەوە، ڕۆژێك ئیملام بە پۆلی سێ و چوار دەکرد، پۆلی یەك و دوو لە دەرێ بوون. دنیا هەتاو بوو، (بەفر) خاو بوو بۆوە.

لە پەنجەرەکەوە نۆڕیمە دەرێ، دیتم منداڵەکان سەگێکی بەرەڵایان دابووە ناو، لێکدا لێکدا تۆپەڵە بەفریان پێدا دەکێشا، هاوینان بە خڕکە بەردو کەستەکان، زستانان بە تۆپەڵە بەفران دەکەوتنە دووی کسۆکان.

پاش تۆزێ دەنگێکی ناسك لە پشتی دەرکەی ڕا بەرز بۆوە:- ئای چەوەنەر، چەوەنەرم هێناوە منداڵینە... چەوەنەری گەرم و شیرینم هێناوە!....

لە چاودێری پۆلەکەم پرسی:- کازم، ئەمە کێیە؟

کازم گوتی:- خۆمانەیە مامۆستا.... تاری وردییە. مامۆستا.. زستانان چەوەنەر دەفرۆشێت. حەزدەکەی با پێی بێژم وەژوور کەوێ.

دەرکەم وەکرد. تاری وردی بە خۆو مەنجەڵە چەوەنەرەوە وەژوورکەوت! کۆنە ملی پێچێکی لەسەرو ملییەوە هاڵاندبوو. تاکێ لە پێڵاوەکانی لاستیك و ئەوی تریان پێڵاوێکی پیاوانەی ئاسایی بوو. چاکەتێکی پیاوانەی لەبەر کردبوو تا سەر ئەژنۆی هاتبوو. دەستەکانی لە قۆڵی چاکەتەکەی ڕا ون بوو بوون. سەری کەپووی لە سەرماندا سوور هەڵگەڕابوو. بە سیمادا هەر "١٠-١٢" ساڵان دەبووو پاش سڵاوکردن، مەنجەڵە چەوەنەرەکەی لە عاردی دانا و گوتی:- قوربان ڕوخسەت دەفەرموون کەمێك دەستم گەرم بکەمەوە؟!

منداڵەکان هێنایانە کەنار سۆپاکە. کورسییەکەی خۆم داێی. دانەنیشت، گوتی:- نا، قوربان. لە عاردی دادەنیشم.

منداڵەکانی دیکەش بە دەم بانگو های چەوەنەر، های چەوەنەری تاری وردییەوە وەژوورکەوتبوون. پۆلەکە جەنجاڵ بوو بوو، هەموویانم لە شوێنی خۆیان دانیشاند.

تاری وردی پاش بڕێك گەرم بۆوە گوتی:- حەز لە چەوەنەر ناکەی مامۆستا؟ بێ وەی چاوەڕوانی وەڵامی من بێ. چووە سەر مەنجەڵە چەوەنەرەکە، پارچە پەرۆکێکی چڵکنو پینە پیناوی لەسەر مەنجەڵەکە لادا، هەڵمێکی ئاسایی لە چەوەنەرەکەوە بڵند بوو، کێردێکی دەسك شاخ لەسەر چەوەنەرەکان بوو، تاری وردی چەوەنەرێکی هەڵبژاردو دایە دەستمو گوتی:- خۆت پاکی بکەی چاکترە، لەوەیە دەستی من... چ بکەین ئیدی ئێمە دێهاتین.. شارمان نەدیتوە... عادەت نازانین...

چەشنی پیاوێکی دنیا دیدە داخاوت، چەوەنەرەکەم لە نێو لەپمدا گوشی، پێستە چڵکنەکەی داماڵاو سورێکی ئاڵی جوان وەدیارکەوت، قەپێکم لێی دا، گەلەك شیرین بوو.

ئەورۆژ، لەو سەری پۆلەکەوە هەڵیدایێ:- مامۆستا، چەوەنەری کەس وەکو ئی تاری وردی شیرینو بەتام نیە..

کازم گوتی: مامۆستا، خوشکەکەی لێی دەنێ، ئەمیش دەیفرۆشێت. ئاخر دایکی نەساغە.. ڕوانیمە تاری وردی. بزەیەکی شیرین لێوەکانی ڕووناك کردبۆوە، مل پێچەکەی کردبۆوە. قژەکەی گوێچەکانی داپۆشی بوو. وەکو پیاوێکی گەورە گوتی:- هەر کەسەو کەسب و کارێکی هەیە. مامۆستا.. ئێمە ئەم کارەمان هەڵبژاردووە.

گوتم:- دایکت چ خێرێتێ، تاری وردی؟

گوتی:- لاقی ناجوڵێن. کوێخا دەڵێ ئیفلیج بووە. من بە باشی نازانم چییەتی مامۆستا.

گوتم:- ئەدی بابت..

خێرا قسەکەی بڕیمو گوتی:- مردووە.

یەکێك لە قوتابییەکان گوتی:- مامۆستا پێیان دەگوت عەسکەر قاچاخچی.

تاری وردی گوتی:- ئەسپ سوارێکی چاك بوو. ڕۆژێ لەسەر چیاکانەوە پێکراو مرد. ئەمنەکان لێیاندا. بەسەر ئەسپەکەیەوە لێیان دا.

بڕێکی دی قسانمان کرد، بایی چەند قرانێ چەوەنەری بە منداڵەکان فرۆشتو ڕۆیی. پارەی لە من وەرنەگرت، گوتی:- ئەم چەلەیان میوانی منی، چەلێکی دی پارەت لێ وەردەگرم. خەیاڵ نەکەی دێهاتیم.. بایی ئەوە وێڵو ماریفەتمان هەیە مامۆستا.

تاری وردی بە نێو بەفران کەوت، دەنگیمان لە دوورێ ڕا دەبیست:- وەرە بۆ چەوەنەر!.. چەوەنەری گەرمو شیرین!...

دوو کسۆکان لە دەورو بەریا گەمەیان دەکردو کلکە سووتەیان بوو.

منداڵەکان زۆریان لەمەڕ تاری وردی بۆ گێڕامەوە. خوشکەکەی نێوی سولماز بوو. ٢-٣ ساڵان لەم هەراشتر بوو، تا بابیان مابوو خاوەن خانووو ژیانو گوزەرانێکی باش بوون، پاش

فەوتانی بابی ئیدی ئەمانیش لێیان قەوما. هەوەڵجار خوشکەکەی و پاشان براکەی چوونە کن حاجی قولی فەرش چن. دوایش لەگەڵ حاجی وەشەڕێ هاتن و قاوی دان.

رەزا قولی گوتی:- مامۆستا، حاجی قولی بێ شەرەف خوشکەکەی ئەزیەت دەدا، بە چاوی خەیانەتەوە سەیری دەکرد.

ئەبول فەزل گوتی:- ما.. مامۆستا.. تاری وردی ویستی مامۆستا... حاجی قولی بە کەلگیت بکوژێ.. ما..

* * *

تاری وردی گشت رۆژێ یەك دوو جاران سەری قوتابخانەکەی دەدا، هەندێ جار پاش تەواو کردنی چەوەنەرەکەی دەهات، لە پۆلدا دادەنیشت و گوێی لە دەرس دەگرت.

رۆژێ پێم گوت:- ئەرێ تاری وردی، بیستوومە لەگەڵ حاجی قولیدا بەشەڕ چوویت، بۆم ناگێڕیتەوە چۆن بوو؟

تاری وردی گوتی:- ئەوە کۆن بووە مامۆستا، حەزناکەم سەرت بیەشێنم.

گوتم:- نا من حەزدەکەم لە دەمی خۆتی ببیستم. لە نووکەوە بۆم بگێڕەوە.

ئەوجا تاری وردی کەوتە قسان: ببوورە مامۆستا! من و خوشکەکەم هەر لە منداڵییەوە لە کن حاجی قولی کارمان دەکرد، خوشکەکەم بەر لە من چوو بووە کنی، من لە ژێر دەستی خوشکەکەم کارم دەکرد. خوشکەکەم دوو تمەنانی وەردەگرت و منیش کەمۆکەك لەو کەمتر. ئەمە ٢-٣ ساڵ لەمەو بەر بوو. دایکم نەخۆش بوو، کاری پێنەدەکرا. بەڵانەکی لە جێدا نەوکەوتبوو. ٣٠-٤٠ منداڵی دیش لە کارخەنەکەدا کاریان دەکرد، هەنووکەش کاردەکەن. ٥-٦ وەستامان هەبوون. من و خوشکەکەم بەیانی زوو دەڕۆیشتین و نیوەڕوانێ دەگەڕاینەوە. خوشکەکەم لە کارخانەدا عەبای بەسەری دا دەدا، بەڵانەکی وەنەبێ خۆشی بشارێتەوە، وەستاکان لە جێی بابمان بوون، منداڵەکانیش نەفام بوون،و حاجی قولیش ئیدی ئاغا بوو، مامۆستا، بەو دواییە حاجی قولی بێ شەرەف دەهات بە دیارمانەوە دەوەستا، خراپ سەیری خوشکەکەمی دەکرد، بڕێ جاریش دەستی بەسەر ئەو یا مندا دەهێنا و هەر لە خۆوە بزەی دەهاتێ و رەت دەبوو، منیش خوا نەکا دڵی لێ پیس بکەم! لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "چ قەیدییە ئاغامانەو دەیەوێ خۆشەویستی و میهرەبانی خۆی بنوێنێ، قەدەرێکی پێ چوو، رۆژێکی پێنج شەممە کە هەفتانەمان وەردەگرت، تمەنێکی زیادی بە سەڵمازێ داو گوتی:- داکتان نەخۆشە، ئەمە بۆ ئەو خەرج بکەن و بە رووی سەڵمازەوە پێکەنی. دۆغریت دەوێ مەن پێم خۆش نەبوو. خوشکەکەم وەك بڵێی بترسێ چ قسەیەکی نەکرد. مامۆستا، دوو بە دوو هاتینەوە بۆ کن دایکمان. کە دایکم بەمەی زانی کەمێك راماو گوتی:- جارێکی دی پارەی زیادە وەرنەگرن.

لە سبەیەوە سەیرم کرد وەستاکان و منداڵە پارچەڵەکان لە بەینی خۆیاندا چپەچپێ دەکەن و بە گوێی یەکدا دەچپێنن و پێدەچوو نەیانەوێ و من و خوشکەکەم حاڵی ببین.

ماموٚستا، پێنج شەممەی ئاینده پاش هەموو کرێکارەکان چووین بۆ وەرگرتنی هەفتانەکەمان. حاجی خۆی گوتبووی وەختێ بچین کە سەری چۆڵ بێ. ماموٚستا تمەن و نیوێکی زیادی داینێ و گوتی:– سبحەی دێم بۆ ماڵتان، چەند قسەیەکم دەگەڵ دایکتان هەن.

ئەوجا بەڕووی خوشکەکەما پێکەنی، ئەلهەقی پێی قەڵس بووم. خوشکەکەم ڕەنگی تێك چوو، سەری داخست. ببورە ماموٚستا بە خۆت گوتت لە نووکەوە بۆت بگێڕمەوە. تمەن و نیوەکەم لەبەردەم حاجی داناو گوتم:– حاجی ئاغا ئێمە پوڵی زیادەمان ناوێن، دایکمان پێی ناخۆشە.

حاجی پێکەنی و گوتی:– گەوج مەبە گیانەکەم، ئەمە بۆ تۆو دایکت نییە تا حەزێ نەکەن!

ئەوجا ویستی تمەن و نیوەکە بە توٚبزی لە دەستی سەڵمازێ نێ.

سەڵماز پاشەو پاش کشایەوەو غاری داو وەدەرکەوت. هەر پڕم دایە پیرە کەلگیت و سرەواندمە حاجی. کەلگیت بەر دەموچاوی حاجی کەوت و خوێنی پێدا هاتە خوارێ. حاجی وەکو گا بۆڕاندی و هاواری کرد بمگەنێ. من بەغار لەوێ وەدەرکەوتم و ئیدی نەمزانی چی بوو و چی نەبوو. هاتمەوە ماڵێ، سەڵماز لە پاڵ دایکمدا کزکۆڵەی کردبوو و دەگریا.

ماموٚستا، بۆ شەوێ کوێخا هات. حاجی قولی شکایەتی لێکردبووم و گوتبووی: دەمەوێ ببم بە خزمیان، ئەگینا کوڕەکەیانم دەدایە دەست ئەمنان و داریان بە ڕۆحیا دەدا. کوێخا گوتی:– جا حاجی منی ناردووەتە خوازبێنی، قاییلن یا نا؟!

ماموٚستا، ژن و منداڵی حاجی هەنووکە لە شارن. لە چوار گوندی دیدا ژنی بە سیغەی هەبوون، ببورە ماموٚستا، دوور لە ڕووت هەر دەڵێی بەرازی تەپیوە، قەڵەو و پانکۆڵە بەراز، ڕدێنی ماش و برنج، ددانەکانی تاقمن، یەك دووانێکی زێڕن، تەسبێحێکی درێژی بە دەستەوەیە، وەلحاصڵ حاشا حازری پیرەبەرازێکی گەنیوە لەو گۆڕەی.

دایکم بە کوێخای گوت:– بەو خوایەی سەد کیژانم هەبن، شتاقیان بەو گۆڵە پیرەی نادەم. ئێمە ئەوی دیتومانە بەسمانە، کوێخا تۆ بە خۆت چاك دەزانی ئەم جۆرە مرۆڤانە بە ڕاستی نایەنە پێشەوەو ناشیانەوێ ببن بە خزمی ئێمەی دێهاتی..

ماموٚستا، کوێخا گوتی:– ڕاست دەکەی، حاجی قولی سیغەی دەوێ، بەڵام ئەگەر قایل نەبی منداڵەکانت لە کارخانەی دەردەکات. ئەمە جگە لە پەت پەتی ئەمن و مەمن!.. حسێبێکی ئەمەش بکە ئاخر!

سەڵماز لە پشت دایکمەوە کروشکەی کردبوو. بە دەم هەنسك هەڵدانەوە دەیگوت:– من ئیدی ناچمەوە بۆ کارخانەی.. دەمکوژێت.. لێی دەترسم..

بەیانی سەڵماز نەچۆوە بۆ سەر ئیش. هەر من چووم. حاجی قولی لەبەر دەرکەی وەستابوو و تەزبێحاتی دەکرد. ماموٚستا ترسام، نزیکی نەکەوتمەوە. حاجی قولی دەموچاوی بە سارغییەك بەستبوو، گوتی:– برۆ ژوورێ کوڕە، قەیدی نییە، هەقم بەسەرتەوە نییە.

بە ترسەوە لێی نزیك بوومەوە. کە ویستم لە دەرکەکە تێپەڕم، توند مەچەکی گرتم، بردمییە حەوشەی کارخانەکەوە، بە شاپ و شەقەزللان کەوتە وێزەم، بگرە کوێت نایەشێ! ئان ئاخری خۆم لە دەستی دەرهێنا، هەڕام کرد، کەلگێتەکەی دوێنێم هەڵگرت.

به ڕاستی هەنجنهەنجی کردبووم. هاوارم کرد:– هەی قورمساغی بێ شەڕەف، هەنووکە پێت نیشان دەدەم لە کێ دەدەی! ئەمن کوڕی عەسکەر قاچاخچیم ئەگەر نازانی!

تاری وردی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:– مامۆستا، دەمویست هەر لەوێندەرێ بیکوژم. ئیدی کرێکارەکان لێم خڕبوونەوەو بردیانمەوە بۆ ماڵێ. لە داخانا بە هەر چوار پەلان هەڵدەپەڕیم و جوێنم دەداو خوێن لە دەمو چاوم دەچۆڕا... ئاخری ژێر بوومەوە.

بزنێکمان هەبوو، منو سەڵماز بە "٢٠" تمەنمان کڕی بوومان. ئیدی بزنەمان فرۆشتەوە، وەلحاصڵ بەو پارەیە ١–٢ مانگمان قەتاند. ئەنجام خوشکەکەم چووە کن پیرێژنێکی نان کەرو منیش هەر کارێکم بۆ ڕێکەوتبا ملم پێوە دەنا.

گوتم:– تاری وردی، ئەدی خوشکەکەت بۆ مێرد ناکا؟

گوتی: – دەزگیرانی کوڕی پیرێژنە نانکەرەکەیە. منو سەڵماز دەمانەوێ جیازی سەڵمازی ئامادە بکەین تا شایی بکەن.

* * *

ئەم هاوینە بۆ گەڕان و تەبدیل هەوا چووبوومە هەمان گوندی، لە دەوروبەری گوندا تاری وردیم بینی. چل پەنجا سەر پەزی پێ بوو.

وتم:– تاری وردی، جیازی خوشکەکەت تەواو بوو؟

گوتی:– بەڵێ، گوێزراشەوە.. هەنووکە دەمەوێ بۆ شاییەکەی خۆم پوڵ خڕ بکەمەوە. ئاخر لەو دەمەوە کە خوشکەکەم ڕۆییوە، دایکم بە تەنێیە. خۆ یەکێکی دەوێ دەرو ژووری پێ بکات و –بێ ئەدەبی نەبێ لە رووتا مامۆستا– ببێ بە هاودەمی..

## ئەفسانەی خۆشەویستی

پێشکەکەشە بە سوهەیلا، کە منداڵانی خۆشدەوێن

"١"

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو ئەم پاشایە کیژۆڵەیەکی ٦-٧ساڵانی هەبوو. ئەم کیژۆڵەیە کەنیزەك و کارەکەری زۆری هەبوون، خزمەتکارێکیشی هەبوو بە نێوی قوجەلی کە بڕێك لە خۆی گەورەتر بوو. قوجەلی بەردەوام لە خزمەتی ئەم کیژۆڵەیەدا بوو، ئەگەر لە کاتی نان خواردندا دەستەسڕەکەی بکەوتایە، ئەوا قوجەلی بە گورجی هەڵیدەگرتەوەو دەیدایەوە دەستی، ئەگەر تۆپەکەی بە دەم یاریکردنەوە دوور کەوتاباوە ئەوا قۆجەلی بەغار بۆی دەهێنایەوە.

بڕێ جار کیژی پاشا لە ملیۆنان وازیو کەرەستەی یاریکردن وەڕز دەبوو، کەڵکەڵەی هەلوکێنی دەکەوتە سەر، دارو هەلوکەکەی کیژی پاشا زێڕو زیوو بوون.

کە یەکەمجار کیژە ئەڵهای گەمەی هەلوکێنی کرد، پاشا گشت زێڕنگەرانی شاری کۆکردەوەو دەستوری دا کە لە زەرفی سەعاتێکدا دارو هەلوکێکی زێڕو زیو بۆ کیژەکەی ئامادە بکەن. ئەم دارو هەلوکە پارەیەکی گەلەك مشەی تێچوو. جگە لەوەی زەرەنگەرێکی بەلەنگازیش بوو بە قوربانی ئەو کارەو هاتە کوشتن. چونکە گوتبووی کاری هەیەو ناتوانێ بێت، خەریك بوو گوارەی بۆ کیژە نۆبەرەکەی خۆی چێدەکرد.

هەر کاتێ کیژە پاشا هەوەسی هەلوکێنی کردبا، قۆجەلی کەمێك لە دووری دەوەستاو چاوەڕێی دەکرد. کچە هەلوکە زیوەکەی لە عاردی دادەناو بەدارە ئاڵتونەکەی لێی دەداو هەلوك دەچوو بە حەوادا. کاری قۆجەلی ئەوەبوو هەلوکەکەی بۆ بێنێتەوە. هەلوك دەهێنرایەوە، ئەمجارە کچە پاشا قایمتر لێی دەداو هەلوك پتر دەڕۆیی. قۆجەلی دیسان بۆی دەهێنایەوە. کە کیژێ ماندوو دەبوو، قۆجەلی بەلەز دەچوو بە شوێن کارەکەرەکاندا، ئەوانیش دەهاتن، کچۆڵەیان دەنێو کەژاوەی دەناو بۆ کۆشکی پاشایان دەبردەوە. ئەوجا قۆجەلی بە شوێن خەزنەداری تایبەتیی کەرەستەی یارییەکانی کیژێ دا دەچوو تا بێت دارو هەلوکی کیژێ بەرێتەوە جێی خۆیان و لە پاڵ ملیۆنان کەرەستی گەمەی تری کیژێ دا دایان بنێ، پاشان دەچوو بە شوێن خەزنەداری تایبەتی جل و بەرگدا تا جل و بەرگی نان خواردن بۆ شازادە خانم بێنێ و جلو بەرگی یاریکردنەکەی بەرێتەوە شوێن خۆی.

ئەوجا دەچوو بۆ کن ئاشپەزی تایبەتی شازادە خانم تا خواردنی پاش گەمەی هەلوکێنی بۆ بێنێت. شازادە خانم پاش هەر جۆرە یارییەك جۆرە خواردنێکی دانسقەو تایبەتی دەخوارد.

قۆجەلی هەمیشە بە دووی ئەم جۆرە کارەوە بوو. کە شازادە خانم دەنووست. قۆجەلی لەبەر دەرگاوە دەنووست تا کەنیزەك و کارەکەرو نۆکەران و خولامان بزانن شازادە خانم خەوتووەو چ نەپرسن و نەڵێن.

شازاده خانم هەر فرمانێکی هەبا، قۆجەلی هێندە بە دڵو بە گیان بۆی ئەنجام دەدا کە شازادە خانم هەرگیز دەستی لە روویدا بەرز نەکردبۆوە. قۆجەلی شەیدای کیژە پاشای بوو، بە نیازی پاکو دڵی بێگەردەوە خۆشی ویستو بەلای خۆیەوە چ نەنگییەك لەو کارەیدا نەبوو، هەر بەم پێودانگە ڕۆژێك ڕازی دڵی خۆی بۆ کیژە هەڵڕشت.

ئەو ڕۆژە کیژە خانم لە باخیدا پەپولەی دەگرت. قوجەلیش لە بن درەختێکا وەستابوو، و تەماشای دەکرد. کە پەپولەیەك دەفڕیو دەچووە سەر درەختێك ،دەبوا قۆجەلی سەر بکەوێتە سەر درەختەکەو پەپولەکە هەڵفڕێنێ. جارێ کیژەکە پەپولەیەکی درشتی بینی، قۆجەلی گاز کردو گوتی:- قوجەلی، تۆ بیگرە، من لێی دەترسم.

قۆجەلی خێرا رایکرد، پەپولەکەی گرتو خستییە سەبەتە تۆڕییەکەوە. کە سەری هەڵبڕی بینی کیژە بەرانبەری وەستاوە، ڕێكو ڕەوان گوتی:- شازادە خانم، من تۆم خۆش گەرەکە. تکا دەکەم کە هەردووکمان گەورە بووین، شووم پێبکە.

بەڵام هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە کیژە شا، زللەیەکی بە بنا گوێیدا کێشاو هاواری بەسەردا کرد:- هەی خولامی بەد فەڕ، تۆ کەنگێ ڕایەی ئەوەت هەن منت خۆش بوێ؟ چما نازانیت من کیژە پاشامەو تۆ خولامی منی؟ تۆ شایانی دەرگاوانی سەگەکەی منیش نیت، سەگی پیس، گوم بە لەبەر چاوم، هەڕۆ کارەکەرەکانم گاز بکە با بێن بم بەنەوەو تۆش دەربکەن، نامەوێ، ئەو چاوە پیسانەت ببینم.

قۆجەلی خێرا چوو بە شوێن کارەکەرەکاندا، کارەکەرەکان بە کەژاوەوە هاتن، سەیریان کرد کیژە پاشا بوراوتەوە، هەموو داباریینە سەر قۆجەلی:- کوڕە ماڵ خرا ئەوە چت لە کیژە پاشای کردووە!. قوجەلی گوتی: بەوەندە سوێندو قورئانەی من هیچم لێ نەکردووە، بەخۆی تووڕەبووو لەمنی داو بورایەوە!

بەڵام کێ باوەڕی دەکرد. گوڵاو وشەربەتیان هێنا، کیژە بە هۆش هاتەوە. خستیانە سەر کەژاوەو بۆ کۆشکیان بردەوە. کیژە پاشا فەرمانی دا:- بە بابم بڵێن گوێی ئەم خولامە نمەك حەرامە بگرێو وەکو کسۆکان وەدەری نێ. نامەوێ چاوە پیسەکانی ببینم.

پاشا فەرمانی دا، هەر ئەو دەققەیە قۆجەلیان وەکو سەگ دەرکرد، کیژی پاشا چەند ڕۆژێك نەخۆش کەوت، هەموو ڕۆژێ چەند لوقمانێ ئێشکیان دەگرت. تا ئەنجام بە خۆی گوتی ئیدی چاك بۆتەوەو لوقمانەکانیان ئیزن دا.

"٢"

رۆژگار تێ دەپەڕین، کیژە ڕۆژ بە رۆژو ساڵ بە ساڵ پتر هەواو فیزی پەیدا دەکرد، کەسی بە سەگیش نەدەزانی. کە گەییە ١٧-١٨ ساڵان فەرمانی دا کە کەس بۆی نییە سەیری بکاتو لەشو لاری جوانو پاكو تەمیزی بە نیگا پیس بکات. خۆ ئەگەر یەکێك لە کارەکەر یا خولامەکان بە نەزانستە تەماشای کردبا ئەوا ئیدی وای بە حاڵی! تێرو پڕیان تێ هەڵدەداو فزەشی کردبا ئەوا دەخرایە بەردەم ئەو گورگە برسییانەی کە شازادە خانم بۆ سەرگەرمیو ڕابواردنی خۆی لە

باخەكەدا ڕای گرتبوون. پاشا سەبارەت بەم كارانەی گەلێكی خۆش دەویست و هەمیشە پێی دەگوت:

– كیژم تۆ دەتەوێ شوێن پێی من هەڵبگری، خۆشم دەوێی.

شازادە خانم وای لێهاتبوو هەمیشە بە تەنێ دەباخەكەدا دەسوڕایەوە، قسانی دەگەڵ كەسدا نەدەكرد، دەیگوت كەس ڕایەی ئەوەی نییە لەگەڵ مندا باخێوێ. دوو ئەستێڵی گەورەیان دەنێو باخەكەدا چێ كردبوو، یەكێكیان هەمیشە تەژی شیری تازە بوو و ئەوی دییان پڕبوو لە گوڵا و وعەتری گوڵەباخ و یاسەمین. دوو كارەكەری گەردن زراف و چاو بەڵەكیش كارو پیشەیان ئەوەبوو سەری هەموو سەعاتێ، سەر دابخەن و دەستە و نەزەر بوەستن تا شازادە خانم لە ئەستێڵی شیرەكەوە بچێتە ئەستێڵی گوڵاوەكەوە و پاشان بێتە دەرێ و خۆی لە خاولییەكەوە وەرپێچێ. كارەكەرەكان بۆیان نەبوو دەستیان بەر بەدەنی نەرم یا قژی خاوی شازادە خانم بكەوێ، خۆ ئەگەر بە ڕێكەوت سەری قامك یا دەستی یەكێكیان بە بەدەنی ناسكی یا قژی خاوی كەوتبا، ئەوا هەر ئەو ڕۆژە دەدرایە دەست جەلادان تا ئەنگوست یا دەستی بیڕنەوە.

شازادە خانم كاتێ بەخۆی زانی بە تاقی تەنێ ماوەتەوە و كەسی بە دەورەوە نەماوە. نەیدەزانی چۆن كاتی خۆی بەسەر بەرێ. لە پەپولە گرتن و گوڵ چنین و مەلەی نێو ئەستێڵی شیرو گوڵاو، لە كەرەستەی یاری و خواردن و خواردنەوە و لە تەماشای گورگان وەڕەز بوو بوو. زۆربەی كات دەخەوت. هەمیشە قۆجەلی لە خەودا دەبینی. قۆجەلی دەهات دەگەڵ شازادە خانم دا گەمان بكات. كیژێ سەرەتا خۆشحاڵ دەبوو. كوتوپڕ بیری دەكەوتەوە كە كیژە پاشایە و زۆری فەرقە لەگەڵ خەڵكانی دیدا. ئەوسا خۆی بەرز دەگرت و قۆجەلی دەردەكرد. بەڵام قۆجەلی قیر سیچمە بوو و دەست بەردار نەدەبوو. دەیویست دەستی شازادە خانم بگرێ، كیژە خۆی دەدزییەوە. بەڵام ئاخری ملی دەدایە خەت و قۆجەلی دەیتوانی دەستی بگرێ. دوو بە دوو دەكەوتنە هەڵبەزو دابەزو گەمە كردن و پەپولە گرتن. لە گەرمەی وازیدا قۆجەلی دەیگوت:–

شازادە خانم من حەزم لە تۆیە، تكایە ئەگەر هەردووكمان گەورە بووین، مێردم پێ بكە.

شازادە خانم دیسان بیری دەكەوتەوە كە كیژی پاشایە، قۆجەلی دەدایە بەر شەقەزللان و بە سەریا دەیقیژاند. قۆجەلی بە جەلادان دەسپارد و لە پڕ لە هات و هاواری خۆی ڕادەپەڕی.

هەمیشە ئەم خەونەی دەبینی، خەونی بە هیچ هاو وازییەكی ترییەوە نەدەبینی. لەم خەونەشدا قوجەلی هەر منداڵەكەی جاری جاران بوو.

شازادە خانم، خوازبێنی كەری زۆر هەبوون. چەندین شازادە لە وڵاتانی دوورەوە دەهاتنە خوازبێنی، بەڵام ئەو لە نەدیتە ڕەفزی كردبوون كە گوایە: من جگە لە خۆم چ كەسێكی دیم خۆش ناوێ.

"٣"

ڕۆژێ شازادە خانم لە ئەستێڵەكەدا مەلەی دەكرد. كۆترە باریكەیەك هات، لەسەر دار هەناری كەنار ئەستێڵەكە نیشتەوە و گوتی:

– ئەی کیژی جوان، تۆ چ بەدەنێکی ناسكو نەرمو شلت هەیە، من حەزم لە تۆ کردووە، تکایە لەو حەوزە شیرە وەدەرکەوە تا پڕ بە چاوان سەیرت بکەم.

شازادە خانم گوتی:

– ئەی باڵندەی چەپەڵ، ئەمرت پێ دەکەم لەم ناوە نەمێنی. ئەمن کیژە پاشامە. کەس ڕایەی نییە سەیرم بکات. حاڵی بوویت؟

کۆترەکە پێکەنیو گوتی:

– ئەی کیژی دەلال، من دەزانم دەمێکە بێ هاودەمی..

شازادە خانم بەدەم خەیاڵەوە بیری چۆوە کە کیژە پاشایە، کوتوپڕ نەرم بوو گوتی:

– ئەی کۆتری قسە خۆش، تکایە تەماشام مەکە، ئاخر جوان نییە.

کوترەکە گوتی:

– ئەی کچی جوان، ئاخر بە دەستی خۆم نییە، من خۆشم دەوێی.

کچە گوتی:

– ئەی کۆتری قسە خۆش ئاخر من ناتوانم عەشقو خۆشەویستی کۆترێك بەگەن بکەم. ئەگەر راست دەکەیو بە ڕاستی عاشقی لەو پێستەت وەرە دەرێ با منیش تۆ ببینم.

کۆترەکە گوتی:

– ئەی کیژی جوان من دڵنیا نیم کە تۆ عەشقی من پەسند بکەی، بۆیە بارمتەیەکم بدەیە تا دڵنیا بمو لە پێستی خۆم بێمە دەرێ.

کچە گوتی:

– ئەی کۆتری قسە خۆش. چت دەوێ بەخۆت سەرپشك بە.

کۆترەکە گوتی:

– ئەی کیژی ناسك، خەوی خۆتم بدەیە.

کچە گوتی:

– ئەی کۆتری قسە خۆش، ئاخر خەوی من چ کەڵکێکی بۆ تۆ هەیە؟

کۆترەکە گوتی:

– ئەی کیژی جوان، پاشان دەزانیت کە خەونی تۆ چ سوودێکی بۆ من دەبێ!

کچە گوتی:

– ئەی کۆتری قسە خۆش، بڕۆ خەوی من پیرۆزی تۆ بێ.

لەم دەمەدا دەنگی پێی کارەکەرەکانی شازادە خانم هات کە خاولی بە دەستو چاو لە عاردی دەهاتن، کۆترەکە گوتی:

– ئەی کیژی جوان، ئەوا من رۆیشتم، ئەوا ئیدی خەوی تۆ بوو بە موڵکی من. کارەکەرەکانت خەریکە بۆ ئێرە دێن. ئەوا من رۆیشتم، پاشان دێمەوە بۆ کنت، ناویشم نایت "کیژەخان" ئاخر چۆن دەبێ جوانە کیژێکی وەکو تۆ بێ ناوبێ!

لەم دەمەدا شازادە خانم بیری کەوتەوە کە کیژە پاشایە، هاواری کرد:

– ئەی گیانداری چەپەڵ، تۆ بە چ حەقێ دەگەڵ من قسان دەکەی؟ خەوی خۆم بدەوە. ئەگینا جەرگ‌و هەناوت لە گەرووتەوە دەردێنم، تۆ هەقی ئەوەت نییە بەو دەم‌و فلقە بۆگەنەت نێو لە من بنەیت.

کۆترەکە دەمێ بوو هەڵفڕی بووو لەسەر ترۆپکی دار هەنارەکە نەمابوو. شازادە خانم بێهودە تووڕە دەبووو داوای کۆمەکی جەلادەکانی دەکرد.

"٤"

چەند هەفتەیەك بوو، شازادەخانم بۆ ئاهی سوێندش چاوی نەچوو بووە خەو. خەو لە چاوانی تارا بوو، بێ خەوی وای لێکرد بوو، سەرەتا هەموو وایان خەیاڵ دەکرد کە دین (شێت) بووە. لە بێ خەویدا وەکو سەگی هار بە ژوورەکەیدا دەهات‌و دەچوو، چنگی لە دارو دیوار گیر دەکرد. جنێوی بە هەموو کەسێك دەدا، رازی نەدەبوو کەس بچێتە کنی، تەنانەت بابی‌و لقمانەکانیش. شەوو رۆژ هەر بە تەنێ بوو. ئاخری نەخۆش کەوت‌و لەجێدا کەوت. خەوی هەر نەبوو، دەمی چوو بووە کلیلە، نە جوڵەی دەکردو نە قسە. لوقمان لە دوو لوقمان دەهاتنە سەری. کەس نەیتوانی کچە بکاتە خەو.

پاشا فەرمانی دابوو کە کەس بۆی نییە دەستی بەر بەدەنی کیژەکەی بکەوێ! هەر بۆیەش حەکیم‌و لوقمانەکان نەیانەدەتوانی دەردی کچە بدۆزنەوە. رۆژێ حەکیمێکی پیرو نامۆ هات‌و گوتی:– من دەتوانم بێ ئەوەی دەستم بەر بەدەنی بکەوێ دەردەکەوێ بدۆزمەوەو دەرمانیشی بۆ دابنەم! گەر نەمتوانی ئەوا گەردنم شاباشی شیری بڕندەتان بێ.

پاشا گوتی:– بیبەنە کن کیژێ، حەکیمی پیر ماوەیەکی زۆر بە دیار کچەوە ڕۆنیشت‌و تەماشای کرد. ئەوجا گوتی:– تەنیا "ئەفسانەی خۆشەویستی" دەرمانی دەردەکەیەتی. پێویستە حەکایەتخوانێك لە ژوور سەری دانیشت‌و ئەفسانەی خۆشەویستی بۆ بگێڕێتەوە تا چاك ببێتەوەو خەوی لێبکەوێ.

پاشا فەرمانی دا کە جاڕچیان لە هەر چوار لای شارەوە جاڕبدەن کە: هەر کەسێك ئەفسانەی خۆشەویستی دەزانێ بابێ بۆ شازادەخانمی بگێڕێتەوە تا پاشا خەڵاتی بکات‌و سامانێکی زۆری بداتێ.

گەلێك کەس بە تەماحی سامانەوە هاتن کە گوایە "ئەفسانەی خۆشەویستی" دەزانن. کە دەچوونە حەرەمسەرای شازادەخانمەوە ناچار درۆو دەلەسەیان هەڵدەبەست. هەڵبەتە ئەمانە چ کارێکیان لە شازادە خانم نەکرد. پاشا هەر هەموویانی دایە دەست جەلادان. ئیدی کەس نەیوێرا توخنی ئەو ناوە بکەوێ. چەند رۆژێ تێپەڕین دیسان لوقمانە پیرەکە پەیدا بۆوەو بە پاشای گوت:– ئەمە چتۆ شارێکە کە کەسی تێدا نەبێ "ئەفسانەی خۆشەویستی" بزانێ؟ لە فلانە کێودا شوانێکی جەجێڵ هەیە "ئەفسانەی خۆشەویستی" دەزانێ. هەرۆن ئەو بێنن، بەلام پاشا ئەگەر خۆت نەچی بە شوێنیا ئەوا هەرگیز لەو کێوەی نایەتە خوارێ. کابرای لوقمان لێیدا ڕۆیی.

پاشا خۆی‌و چەند خولامێکی بە سواری ئەسپان کەوتنە ڕێ، برۆ برۆ تا گەیینە بناری کێوی، لەوێندەرەوە شوانەیان گازکرد. شوانە هەر لە سەرێ ڕا گوتی:

– ئێوه کێن؟ چتان دەوێ؟ پاشا گوتی:– من پاشام، چما نەت بیستووه کیژەکەم نەخۆش کەوتووه! دەمانەوێ بێیته کنی و...

پاشا بیری چۆوه کە لوقمانەکە چی پێ گوتبوو. شوانەکە بیری خستەوە. (ئەفسانەی خۆشەویستی)؟

پاشا گوتی:– ئەرێ، ئەرێ.. حەکیمەکە گوتی:– کە تۆ دەیزانی. شوانەکە گوتی:– بەڵێ، دەیزانم.

پاشا گوتی:– گەر کیژەکەم چاك بکەیتەوە لە زێڕو زیوو ماڵە دنیایەت دەگرم.

شوانەکە خەریك بوو دەهاتە خوارێ گوتی:– پاشا گەر ناوی ماڵە دنیایەم لێبێنی من نایەم. ئەفسانەی خۆشەویستی تەنیا لە پێناوی خۆشەویستیدا دەگوترێ.

پاشا ئیدی هیچی نەگوت. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد ئەم شوانە وێڵەیە بە دەستی جەلادان بسپێرێ بەڵام... شوانە لە پشتی پاشاوە سوار بوو و کەوتنە ڕێ. وەختێ گەیینە کۆشك، شوانەیان بردە حەرامسەرای شازادەخانم و لە پشت پەردەکەیەوە دایان نیشان و گوتیان: لێرەوە حەکایەتی خۆت بکە، نابێ نامەحرەم کیژە پاشای ببینێ.

شوانە گوتی:– (ئەفسانەی خۆشەویستی) تشتێك نییە هەموو کەس گوێی لێبێ! ئەگەر جگە لە من و کیژێ کەسێکی دی لەم دەوروبەرە بێ، ئەفسانەکە بە تاڵ دەبێ و کاری خۆی ناکات. هەمووتان دوور بکەونەوە.

پاشا ناچار فەرمانی دا حەرامسەرای شازادە خانم چۆڵ بکەن. تەنیا شوانەو شازادەخانم لە کۆشکدا مانەوە. شوانە سووکێ پەردەکەی لاداو بەبێ خشپە چووە ژوورەوە. کیژە ئارام ئارام راکشا بوو، ئاگای لە عەمری دنیا نەبوو. شوانە لەبەر دەرکەی ژووری کیژێدا ڕۆنیشت و بە دەنگی بەرز بەرز گوتی:– ئەی کیژی جوان، کچە خان، دەمەوێ ئەفسانەی خۆشەویستیت بۆ بگێڕمەوە گوێ دەگری.

کچە وەك ئەوەی دەنگێکی ئاشنای بەر گوێ کەوتبێ، سەری هەڵبڕی و چاوی بڕییە شوانەکەو گوتی:– بەڵێ، بڵێ گوێم لێتە!

شوانە کە دەستی بە ئەفسانەی خۆشەویستی کردو گوتی:

– هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو، ئەم پاشایە کیژۆڵەیەکی ٦–٧ ساڵانی هەبوو. ئەم کیژۆڵەیە کەنیزەك و کارەکەری زۆری هەبوون. خولامێکی بڕێ لە خۆی هەراشتری هەبوو نێوی قۆجەلی بوو.

گەر لە کاتی نان خواردندا دەستەسڕی کچۆڵەکە کەوتبا، قۆجەلی خێرا بۆی هەڵدەگرتەوەو دەیدایەوە دەستی. گەر لە کاتی تۆپێندا تۆپەکەی دوورکەوتباوە قۆجەلی بە غارد بۆی دێناوە. کە کەڵکەڵەی هەلوکێنی کەوتبایە سەر... دارو هەلوکەکەی شازادە خانم لە زێڕو زیوو بوون. کە شازادە خانم نووستبا ئەوا قۆجەلی لەبەر دەرکەی ڕادەکشا تا کەنیزەك و کارەکەرو خولامان بزانن شازادە خانم نوستووەو چ نەپرسن و نەڵێن. شازادەخانم هەر فەرمانێکی هەبا، قۆجەلی هێند بەدڵ و بەگیان بۆی جێبەجێ دەکرد کە هەرگیز شازادەخانم دەستی لە رووی هەڵ نەهێنا

باوه! هەر واش بوو. قۆجەلی حەزی لە کیژە پاشای کرد، بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە خۆشی ویست. بە خەیاڵی خۆی چ شوورەییەك لەم کارەیدا نەبوو. ئاخر خۆشەویستی بۆ دەبێ شەرم بێ؟ کە بە دوو قۆڵی بە نێو باخەکەدا دەسوڕانەوە کیژە پاشا پەپولانی دەگرت. قۆجەلی خۆی هێند بە شاد دەزانی مەپرسە! لە تەماشاکردنی شازادەخانم تێر نەدەبوو، هەموو هەویایەکی ئەوە بوو شازادەخانم لوتف بکات و قایل بێ قۆجەلی دەست دە نێو دەستی بخات و دوو بە دوو پیاسە بکەن و پەپولان بگرن. بەڵام کیژە پاشا گەلەك درژ پەسند بوو،کارەکەرو خوڵام و نۆکەرانی بە کسۆکان دەزانی. بەم تەرحە قۆجەلی شادو مەسرور رۆژگاری دەقەتاند. تا رۆژێك هەستی کرد ناتوانێ لەوەی پتر رازی دڵی خۆی لە شازادە خانم وەشێرێ. ئەوە بوو رۆژێك لە کاتی پەپولە گرتندا بوخچەی دڵی بۆ کردەوەو گوتی:- شازادەخانم من عاشقی تۆ بووم، تکات لێدەکەم کە هەردووکمان گەورەبووین مێردم پێبکە.

شازادە خانم بەم قسەیە قەڵس بوو. قۆجەلی بەر شەقەزللان داو وەکو کسۆکان تڕۆی کرد. شازادە خانم قۆجەلی دەرکردو هەرگیز بیری لەوە نەکردەوە کە داخۆ ئەو کوڕە چ بەڵایەکی بەسەرا دێت.

شوانەکە بێدەنگ بوو. کیژە گوتی:- شوانە، بڵێ بزانم پاشان چی ڕووی دا؟

شوانە گوتی:- کیژی جوان پێتوایە چ بەڵایەك بەسەر قۆجەلیدا هات.

کچە گوتی:- من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە قۆجەلی چی بەسەر هاتووە، تۆ دەزانیت؟ وەرە پێشترەوە.... بڵێ.

شوانە هەستا، چوو لە کن کیژە پاشایەوە ڕۆنیشت، دەستی دەنێو دەستانی خۆی خست و بەم جۆرە دەستی بە گێڕانەوەی پاشماوەی "ئەفسانەی خۆشەویستی" کرد:

- بابی قۆجەلی شوانی دەکرد، قۆجەلی دەربەدەر بە پێیان کەوتە ڕێ. دەشت و نواڵانی بڕی، گەییشتەوە کێوان و بابی دۆزییەوە. بابی یەکجار نەساغ بوو، لە گەوڕی پەزەکاندا خەوتبوو.

خوشکەکەی کە لە سونعی خۆیدا بوو پەزەکانی بردبوو بۆ لەوەڕی. بابی بە دیتنی کوڕەکەی گەلێك شاد بوو، گوتی:- قۆجەلی ئەمە تۆی! یا خوڵلا بە خێرێیەوە، بە ڕاستی لە کاتی خۆیدا هاتییەوە، ئەمن پێم بە لێوی قەبرەوەیەو خەریکە دەمرم. خوشکەکەت بە تەنێ هەڵناکات. تەنیایی دەردێکی گرانە.

بابی مرد. کوڕەکەی هەر لەوێندەرێ و لەسەر ترۆپکی چیایدا ناشتی. دەمەو عەسر کە خوشکەکەی هاتەوە. سەیری کرد بابی دیارنییەو براکەی لەوێیە! دوو بە دوو بۆ بابیان گریان، گۆڕەکەیان بە گوڵ و درەختان رازاندەوەو چەند نەمامێکیان لەسەری ناشت. رۆژان بوون بە هەفتە، هەفتە بە مانگان و مانگ بە ساڵان و ساڵان تێپەڕین. قوجەلی و خوشکەکەی بوون بە ١٧-١٨ ساڵان. دوو بە دوو دەشت و دەریان تەی دەکردو پەزەکانیان لە بژوێنترین شوێناندا دەلەوەڕاند. شەویشیان لەگەڵ کسۆکەکانیاندا لە پیرەگەوڕی بەسەر دەبرد.هەموو زستانێك یەك جار سەری شاریان دەدا. مەڕەکانیان دەگەوڕی دەکرد، کاتی بێکاری بوو.

خوشکەکەی قوجەلی یەکجار نازدار بوو، وەکو شنەبای بای بەهار فێنك، وەکو هەتاوی هاوین پرشنگدار، وەکو میوەی پایزان بۆنخۆش، وەکو تریفەی مانگەشەوی زستان دڵگیرو وەکو گوڵاڵەی دەشت و نوالآن سوورو نامۆ بوو، هەر بۆیەش قوجەلی بە لالەی گاز دەکرد.

رۆژێ کە پەزیان هێنایەوە، قوجەلی سەیری کرد بزنێکیان لە پەزی دابڕاوەو دیار نییە. یەکێك لە کسۆکەکانی لەگەڵ خۆدا بردو بە شوێن بزنەکەدا ڕۆیی. چەند کێوێکیان بڕی، سەیریان کرد بزنەکە لەسەر کانییەك خەوتووەو هۆن هۆن دەگریو وەکو بیی نێو ئاو دەلەرزێ. سەگەکە بزنەکەی بەدی کرد، کەوتە حەپە حەپ و گوتی:- بزنە مەگری وا هاتین.

بزنەکە کەیف خۆش بوو و گوتی:- دەترسام بە شوێنما نەیەن و ببم بە خۆراکی گورگ، سوپاستان دەکەم.

دنیا خەریك بوو تاریك دەبوو، قوجەلی سەیری کرد لەوبەری کێوەکەوە حەوت ئەسپی سپی بەرەو سەرێ دێن. بزنەکەی بە سەگەکە سپاردو بە ڕێی خستن و بە خۆشی لە پشت تاوێرەکەوە لێی دانیشت. ئەسپەکان گەییشتنە سەر کانییەکە. هەریەکەیان جەوەندەیەکی بەسەرەوە بوو... جەوەندەکانیان پڕ لە ئاو کرد. ویستیان بگەڕێنەوە.

یەکێك لە ئەسپەکان گوتی:- من چیدی بە تەنێ لەو کۆشکەی هەڵناکەم یا ئەوەتا خۆ دەکوژم یا دەگەڕێمەوە بۆ شاری خۆمان. ئێوە بگەڕێنەوە کن دۆت مامەکان. ئەسپەکانی دی دڵنەوایيان کرد، ئەنجام پێکەوە گەڕانەوە. قوجەلی هەستاو کەوتە شوێن ئەسپەکان. بڕۆ بڕۆ ،چەند چیایەکیان بڕیو گەییشتنە لێرەوارێکی چۆڵ و سامناك، تاقە پەلەوەر یا زیندەوەرێکی تێدا نەبوو. لە پڕ حەوت قەسری رازاوە بە دیارکەوت. ئەسپەکان هەریەکەیان چووە قەسرێکەوە. قوجەلی چاوەڕێی کرد، سەیری کرد "٦" کۆتری سپی وەکو چۆری شیر لە ئاسمانێ را هاتنە خوارێ و هەریەکەیان چووە قەسرێك لە قەسرەکانەوە. قوجەلی هەر چاوەڕوان بوو.

لە پڕ گوێی لە دەنگی گریان بوو. خۆی پێ نەگیراو سەری کێشایە هەموو قەسرەکانەوە. لە هەر قەسرێکدا کیژێکی مانگ ئاساو کوڕێکی رۆژئاسای بەدی کرد، کە بۆ خۆ سەرگەرمی قسەو پێکەنین بوون، بەڵام قەسری حەوتەم تاقە کوڕێکی تێدا بوو، بە پارچە گەچێك لەسەر عاردەکەی وێنەی گوڵاڵەیەکی دەکێشاو هۆن هۆن دەگریا. گریانێك کە بەردی دەتواندەوە.. قوجەلی وەژوور کەوت، سڵاوی کردو گوتی: - ئەی نەوجەوان بەسە مەگری، دڵت کردم بە کەباب!

نەوجەوان سەری هەڵبڕیو گوتی: - تۆ کێی؟ لە کوێندەرێ را هاتووی؟

قوجەلی گوتی: - من شوانی کوێستانانم، بەدەم ناڵەو گریانی تۆوە هاتم.

کوڕەکە گوتی:- بەیانی لەسەر کێوەکە تۆم بینی، چاك بوو هاتیت، وەرە دانیشە دڵم هاودەمێکی گەرەکە.

قوجەلی گوتی: - ئەوە بۆوا بە گەرمی و بە کوڵ دەگرییایت؟

نەوجەوانەکە گوتی:- حەکایەت و سەربهوردی من بڕێك درێژە، ئەگەر حەوسەڵەی گوێ گرتنت هەیە با بۆتی بگێڕمەوە.

– ئێمە حەوت براین، هەموو دوو رۆژە هاتووینە ئەم لێرەوارە. لە شاری خۆماندا ئاسنگەریمان دەکرد، پیرە بابێکمان هەبوو چاکترین شمشێر سازی شارەکە بوو. بە رۆژ ئاسنگەریمان دەکردو شەوانیش بە نهێنی لە ژێر زەمیندا شمشێرمان دروست دەکرد. پاشا چەك و ئەسڵەحەی قەدەغە کردبوو، بەلاّم چونکە خەڵکی شار پێویستیان بە شمشێر هەبوو ناچار بووین ئەم کارە بە شەو ئەنجام بدەین. لە دووکانەکەماندا سندانێکمان هەبوو دە، تۆ بڵێ بیست ئەوەندەی سندانی ئاسایی بوو. بە هەشت کەسەوە بە دەوریا دەسوڕاینەوەو چەکوشمان رادەوەشاند. رۆژێ پیرە باب پێی گوتین:– کوڕینە من پێم بە لێوی قەبرەوەیەو زۆرم نەماوە، بەلاّم ئێوە زۆرتان بە بەرەوەیەو پێویستتان بە هاوڕێ و هاوسەرەو وەختی ژن هێنانتان هاتووە، پێوێستتان بە ژنانێ هەن کە خۆتان ئاسایی قۆڵی لێ هەڵماڵن و چەکوشکاری و شمشێرسازی بکەن. دۆت مامەکانتان ئەم کارەیان لێ دەوەشێتەوەو ئەو ژنانەن کە ئەنگۆ دەتانەوێن! بەلاّم بۆ وەی ئێوەش لێهاتووی خۆتان بسەلمێنن، من و مامی رەحمەتیتان ئەزموونێکمان بۆ داناون. ناونیشانی دۆت مامەکانتان لە نێو ئەم سندانەدایە!

پێویستە شمشێری ئەوەندە تیژو بڕندە سازبکەن کە بە یەك لێدان ئەم سندانە بکات بە دوو لەتەوە، تا ئەدرەسی دۆت مامەکانتان چنگ بکەوێ.

بابمان پاش چەند رۆژێك تۆ خۆش. ئێمەی حەوت برا شانمان لە کار قایم کرد. زۆربەی کات لە ژێرخانەکەدا لەگەڵ پۆڵاو ئاسن و چەکوشو ئەم بابەتە شتانەدا خەریك بووین، بەلاّم هەر شمشێرێکمان دروست دەکرد، کاری لە سندانەکە نەدەکردو دەشکا. پاشان لە شەوێکی تاریك و تۆف و کرێوەی زستاندا شمشێرێکمان چێکرد، سندانەکەمان پێی لەت کرد، قتوویەکی چکۆڵە لە نێو سندانەکەوە بەدەرکەوت، قتووەکە پارچە کاغەزێکی تێدا بوو لەسەری نووسرا بوو "پس مامانی شمشێرساز، قوربانی نوکی تیژی شمشێرتان بین تا زووتر فریامان بکەون درەنگە! دڵتەنگی ئێوەین، بیابانی وشکمان بە گوڵ و درەختان چاندووەو لێرەوارمان دروست کردووە! هەموو شتێك ئامادەیەو چاوەڕێی ئێوەین. هەواڵمان لە یەکەم گولاّڵە سوورەی بەهار بپرسن. دۆت مامێن ئەنگۆ ".

ئەم کاغەزە زۆری نیگەران کردین. ویستمان هەر ئەوشەوە هەستین و بکەوینە ڕێ، بەلاّم نە ناونیشانی وانمان دەزانی و نە دەمانتوانی دەستبەرداری کارەکەمان بین و بڕۆین. جەنگاوەرانی شار هەر ئەوی رۆژەی هەزار دانە شمشێریان لە کنەمە بە ڕادانێ دابوو کە بەر لە تەواو بوونی زستانێ بۆیان تەواو بکەین. ئەزقەزا زستانێ دواکەوت و بەهار دواکەوت و ئێمەش رۆژ بە رۆژ بێ ئۆقرەتر دەبووین.

تازە بەفران چووبۆوە کە لەسەر گردێك تووشی گولاّڵە سورەیەکی خوێن ئاسای گەش بووین، خاڵێکی ڕەشی درشت بوو بوو بە نەخشی سەر سینگی، لە گولاّڵەمان پرسی:

– ئەرێ گولیلکۆ دۆت مامێن مە کیڤەنە؟ ناونیشانی وان نا بێژیتە مە، گولاّڵەکە پشتی ڕاست کردەوەو رووی کردە من:– پس مام، ماچم بکە تا پێت بڵێم.

دانەویمەوەو گوڵاڵە سوورەم ماچ کرد. پێی گوتم:- ئەو ساڵ زستانەکەی سەخت بوو، بەهار دواکەوت. دۆت مامەکان گەلەك نیگەران و بێ قەرارن، گەر زوو فریایان نەکەون لەوەیە خۆ بکوژن. من فێرتان دەکەم چتۆ جارێ بچنە پێستی کۆترەوەو جارێ بچنە پێستی ئەسپەوە تا زووتر بیانگەنێ.

ئەوجا ناوونیشانی دۆت مامەکانی داینێ و فێری کردین چتۆ جارێ بچینە پێستی کۆترەوەو جارێ بچینە پێستی ئەسپەوە. دوا قسەی لەگەڵ مندا کرد:- ئامۆزا زۆرم حەزدەکرد بمچنی و بۆ خۆتم بەری، بەڵام چبکەم زستانی سەخت هەموو گوڵاڵەکانی وشك کردو گەر منیش نەبم ئیدی ئەم هەڵەتانە بێ خودان دەمێننەوەو کەس نابێ کاڵای سووریان بەباڵادا بڕێ. تکات لێدەکەم مەم چنە تا تۆوم هەموو لایەك بگرێتەوەو هەڵەتەکان لە گوڵاڵە پڕبکەم و تارای سووریان بە سەردا بدەم.

لە گوڵاڵەکە جوێ بووینەوە، شمشێرەکانمان دانا، چووینە پێستی کۆترەوە و کەوتینە ڕێ. پاش فڕینێکی زۆر، شەکەت بووین، ئەوجا دابەزین و چووینە پێستی ئەسپەوە، دەریاو بیابان و دەشت و شاخمان بڕی تا دوێنێ گەییشتینە ئەم جەنگەڵە کپ و خامۆشە.

کۆشکەکانمان بینی، چەند قاتێ چوو بوون بە ئاسماندا. دانیشتین، چاوەڕێ بکە تا شەوێ شەش کۆتری سپی لە شەش نکاڵی لێرەوارەکەوە پەیدا بوون، هەرکە چاویان بە ئێمە کەوت کەیف خۆش بوون، هاتنە خوارەوەو لە پێستی کۆتر هاتنە دەرێ و بوون بە شەش کیژی مانگ ئاسایی. گوتیان:- ئامۆزایان بە خێر هاتن!

تەماشایەکی منیان کردو گوتیان:- ئەتۆش بەخێر هاتی ئامۆزای بچوکمان، خوشکی بچووکمان "لالە" گوتی:- نیگەران نەبێ و سەبری هەبێ، ئەو ساڵ زستانەکەی سەخت و درێژ بوو، هەرچی گوڵاڵە هەیە وشکی کردو وەری، ئەگەر گوڵاڵە ئەم کارەی نەکردبا مەحاڵ بوو ئێمە بدۆزنەوە، چونکە ئیدی تۆو نەدەما تا ببێ بە گوڵ و ناونیشانی ئێمە بە ئێوە ڕابگەیەنێ، گەر گوڵاڵەی خوشکمان خوێنی خۆی نەڕشتبا هەنگێ زەوی هەرگیز گوڵاڵەیەکی بەخۆیەوە نەدەبینی و خەڵکیش چیدی گوڵاڵەیان بە چاوان نەدەبینی!.

کە گوێم لەم حەکایەتەی بوو، هەستم کرد خەریکە شێت دەبم. پڕ بە دەم هاوارم کرد:- کەواتە ئەو گوڵاڵەی سەر هەڵەتەکە، گوڵاڵەکەی من بوو؟

خوشکەکان گوتیان:- بەڵێ، ئەو گوڵاڵەیەی سەر گردەکە خوشکە چکۆڵەی ئێمە بوو، نەیدەویست خەڵکی وا تێبگەن کە ئیدی گوڵاڵان لە دەشتان نەماوە! دەیویست هەڵەت و دەشتەکان پڕ لە گوڵاڵە بن، بەڵێ، خۆشەویستی ئەو لە هی هەموومان مەزنتر بوو. خۆی فیدای ئێمەو خاك کرد.

هات بە خەیاڵما بگەڕێمەوەو گوڵاڵەکە بچنم، بەڵام لە ئاستی فیداکارییەکەی گوڵاڵەدا چم لە دەست نەهات. دۆت مامەکانم بردیانمە ژوورەکەی گوڵاڵە، کۆشکی چی؟ چۆڵ و هۆڵ! دوێنێ شەو هەموومان ئا لەم ژوورەدا بووین. دۆت مامەکانم گوتیان:- گوڵاڵە ئێمەی زۆر

خۆشدەویست، زۆری ڕەنج دەکێشا، لە کانیاوی سەر لوتکانەوە ئاوی دێناو درەختی نێو لێڕەوارەکەی ئاو دەدا.

دۆت مامەکانمان گوتیان:- ماوەیەکە ناردوویانە بە دوای گیاندارانی لێڕەوارەکاندا کە بێن بۆ سەر شاییەکانیان و گیاندارەکانیش داوەتەکەیان قەبووڵ کردوون، بەڵام براکانم و کیژە مامەکانم لەبەر خاتری من زەماوەندەکەیان دواخستووەو نەشیان هێشت من بگەڕێمەوە بۆ شار. ئەمشەویش تەنیایی زۆری بۆ هێناوم و دەستم بە گریانێ کرد، ویستم کەمێك باری دڵم سووك بکەم. زۆر سوپاسی تۆش دەکەم کە گوێت بۆ دەردی دڵم ڕادێرا.

***

کە نەوجەوانەکە سەربهوردی خۆی گێڕاوەو تەواو بوو، قوجەلی گوتی:- گریان هەر بۆ تۆ باشە، هەقی خۆتە. منیش سەر وەختێ عاشقی کیژە پاشایەك بووم، بەڵام تڕۆی کردم، منیش چیدی نەچوومەوە بەلایەوە.

نەوجەوانەکە پرسی: - رقت لێی هەستا؟

قوجەلی گوتی:- نەخێر، ئێستاش بیبینمەوە هەر خۆشم دەوێ، هێندە جوانە هاوتای نییە، بەڵام مەخابن بە فیزو دەعییەو هەوایە. تاڵێ لە قژی لالەکەی تۆ بە هەزاری وەکو کیژە پاشای ناگۆڕمەوە.

نەوجەوانەکە پرسی:- کەواتە قوجەلی تۆ بە تەنێ دەژی؟

قوجەلی گوتی:- نەخێر، لەگەڵ گوڵاڵەی خوشکمدا دەژیم.

نەوجەوانە گوتی:- وتت گوڵاڵە؟ ئەو کیژەی پەزی لەگەڵت دەلەوەڕاند؟

قوجەلی گوتی:- بەڵێ هەمان کیژی سووری سرك و نامۆ، ئەوە خوشکمە.

نەوجەوانەکە برێك لە جێی خۆی جوڵاو گوتی:- دەمەوێ شتێك بڵێم، بەڵام دەترسم زویر بی.

قوجەلی گوتی:- دەزانم، خوشکەکەمت دەوێ. باشە هەنووکە دەڕۆین، گەر قایل بوو پیرۆزە! دەشتوانم بە تەنێ پەزەکان بەخودان بکەم.

ئەوجا نەوجەوانەکە، قوجەلی فێرکرد کە چۆن بچێتە پێستی کۆترو ئەسپەوە.

* * *

گوڵاڵە لە بەر زارکی گەوڕەکەدا دانیشتبوو یەك یەك ڕیشی بزنەکانی شانە دەکرد. هەرکاتێ بێ کار بوایە ئەم کارەی دەکرد. بزنەکان دەوریان دابوو گوێیان لە چیرۆکەکەی دەگرت. مەڕەکانیش گوێیان دەگرت، هەندێکیان خەوتبوون و هەندێکیان هێدی هێدی کاوێژیان دەکرد. سەگەکانیش لەبەر زارکی گەوڕەکەدا وەنەوزیان دەدا.

نیوەشەو بوو، هەیڤ بە ئاسمانەوەو لە ئاستی گەوڕەکەدا وەستابوو، بە تریفەی زیوین ناو گەوڕەکەی ڕوناك دەکردەوە. پاش تۆزێك بە گوڵاڵەی گوت:

- گوڵێ هەستە ئاگر داگیرێنەوە، من ناتوانم لەوەی پتر بمێنمەوە، دەڕۆم..

لالە هەستا، لەبەر دەرکی گەوڕەکەدا ئاورێکی کردەوە، مانگیش هێدی هێدی داکشا و ڕۆیی. حەکایەتەکەی گوڵاڵە تازە تەواو بوو بوو، کە جووتە کۆترێك خۆیان بە گەوڕەکەدا کرد، یەکێکیان

سپی دەتگوت چۆڕی شیرە، ئەوی تریان سپی، خاڵێکی ڕەشی درشت بە بەر سنگییەوە بوو، گوڵاڵە گوتی:– بەستەزمانانە، ئەوە ڕێتان وێڵ کردووە؟ وەرن، وەرنە کن من؟

کۆترە سپییەکە سەیرێکی کۆترە خاڵدارەکەی کرد، دەتگوت گوتی:– هەڕۆ پێشێ، مەترسە. کۆترە خاڵدارەکە چوو لەسەر دەستی گوڵاڵە نیشتەوە. گوڵاڵە تەماشایەکی کردو ماچی کرد. کۆترەکەی دیش هاتو لە باوەشی گوڵاڵە نیشتەوە. گوڵاڵە هەردووکیانی داناو گوتی:– لێرەبن با بچم دانتان بۆ بێنم. لالە چووە گەوڕەکەوە، بەردێکی لەسەر کونێك لادا، خۆی بە کونەکەدا کرد، کۆترەکان خێرا لە پێستی خۆیان هاتنە دەرێ.

کسۆکەکان هەرکە قوجەلیان بینی هاتن لەبەر پێیدا وەرکەوتن. لالە بە چنگی پڕ لە گەنمەوە گەڕایەوە، سەیری کرد براکەی لەگەڵ لاوێکی قۆزدا دانیشتووەو کۆترەکان نەماون.

گوتی:– قوجەلی ئەوە کێوە چووی؟ زۆرت پێچوو.

قوجەلی گوتی:– تۆ جارێ وەرە لەگەڵ دۆستە تازەکەی مندا ئاشنا ببە، دوایی پێت دەڵێم.

لالە سەرەتا بێدەنگ بووو ئەوجا گوتی:– کۆترەکانمت نەبینی، کێوە چوون؟

قوجەلی گوتی:– هەرکە ئێمە وە ژوورکەوتین لە شەقەی باڵیان داو چوونە دەرێ. ئەمن دەچم دەیاندۆزمەوە. ناتوانن زۆر لێرە دووربکەونەوە. ئێوە دوو بە دوو دانیشنو قسەی خۆتان بکەن. قوجەلی لە ژوورێ ڕا وەدەرکەوت. ڕوو لە دەشتەکەو لەسەر تاوێرێك ڕۆنیشت. پاش ماوەیەکی کەم دیقەتی دا لالەو کوڕە لاوەکە دەستیان دەنێو دەستی یەکدی ناوەو بۆ ئێرە دێن.

قوجەلی گوتی:– پیرۆزە.

کوڕە لاوە گوتی:– هاوڕێ گەر قایل بیت حەزدەکەم لەگەڵ گوڵاڵەدا بچمەوە بۆ لێڕەواری، با دۆت مامو براکانم نیگەرانم نەبن.

قوجەلی بە بزەوە بە لالەی گوت:–گوڵاڵە، ئەدی کۆترەکانت ناوێ؟

لالە بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە: – بەسە قوجەلی، چاك سەرت خستە سەرم. ئەمشەو بەزمی خۆت کرد.

هەرسێکیان پێکەنین. کوڕە لاوەکە بە قوجەلی گوت:– سبەی عەسر چاوەڕێتین وەرە بۆ لێڕەوار بۆ سەر شاییەکەمان.

ئەوجا چووە پێستی ئەسپێکی سپییەوە، لالەی خستە پاشکۆی خۆیو بەڕێ کەوت. قوجەلی تا بانگی بەیانی هەر لەسەر ئەو تاوێرە دانیشت. ئەوجا هەستا، چوو لە پاڵ پەزەکانەوە لێی خەوت.

* * *

سبەی شەو لێڕەوار یەك پارچە هەراو بەزمی خۆشی بوو. باڵندەو زیندەوەران لە هەر چوار نکالی ئەرزو ئاسمانەوە دەهاتن، لە سەردارو درەختانو زەویدا هێلانەیان دەکرد. حەوت برای ئاسنگەر لەگەڵ ژنە جوانەکانیاندا لە دەوری مێزێکی گەورە ڕۆنیشتبوون. شیوی شەوی زەماوەندی خۆیان دەخوارد. قوجەلیش لەوێ بوو. بڕیاریان دابوو لە نیوە شەو بە دواوە بووكو زاوایان لێڕەوارەکە بە گیانلەبەرەکان بسپێرنو بۆ شار بگەڕێنەوە.

دەیانویست قوجەلیش لەگەڵ خۆدا بەرن، بەڵام قایل نەبوو گوتی:- من دەبێ وریایی پەزەکانم بکەم.

نیوەشەو، حەوت زاوا دەستی یەکیان گرت، چوونە پێستی کۆترەوەو لە شەقەی باڵیان داو رۆیشتن. قوجەلی هەندێك بە لێرەوارەکەدا سوڕایەوەو بەڵام نەیتوانی خەمی تەنیایی لە خۆی بڕەوێنێتەوە. ئەنجام لە ژێر درەختێکا دانیشتو ماوەیەك گریا.

کەمێك باری سەر شانی سووك بوو، ئەوجا هاتەوە بۆ گەوڕەکە، بۆ لای پەزەکانی. شوانە دیسان بێدەنگ بوو. چاوانی بڕیە چاوانی شازادە خانم. دەیویست کاریگەریی قسەکانی لە چاوانی کیژەدا ببینێ. کچە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:- بەردەوام بە. بڵێ بزانم قوجەلی چی بەسەر هات؟

شوانەکە گوتی: -بۆ سبەینێ قوجەلی دیسان کیژە پاشای بیرکەوتەوەو سەیری کرد هێشتا لە کانگای دڵییەوە خۆشی دەوێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: من شوانی کوێستان نەبم ئەگەر نەتوانم رامی بکەمو بیکەم بە بنیادەم! من خۆم دەزانم چ کارێ دەکەم تا کیژی پاشا واز لە ئەتواری ئاژەڵانەی خۆی بێنێ. دەبێ لەو جۆرە ژیانە دووری بخەمەوە.

ئەوساکە چووە پێستی کۆترەوەو چوو بۆ باخی کیژی پاشا. هەر وەستا وەستا تا کیژە پاشا هاتو خۆی بە حەوزە شیرەکەدا کرد.

قوجەلیش هاتو لەسەر کەڵی دار هەناری کەنار حەوزەکە نیشتەوەو گوتی:- ئەی کیژی جوان تۆ چ بەدەنێکی ناسكو نەرم شلت هەیە! من شەیدای تۆ بووم. تکا دەکەم لە حەوزە شیرەکە وەرە دەرێ تا تێر تەماشات بکەم. کیژی پاشا سەرەتا وەکو سەگی هار کەوتە شاڵاوو پەلامار، جوێنی دا، فەرمانی دا، بەڵام دوایی بیری چۆوە کە کچی پاشایەو وەکو هەر کیژێکی پاشی دی نەرم بووو گوتی:- ئەی کۆتری قسە خۆش، تکایە سەیرم مەکە، ئاخر جوان نییە.

قوجەلی گوتی:- ئاخر ناتوانم، بە دەستی خۆم نییەو خۆشم دەوێی.

کچە گوتی:- ئەی کۆتری قسە خۆش، ئاخر من ناتوانم خۆشەویستی کۆترێك بەگەن بکەم. ئەگەر عاشقی ڕاستەقینەیو ڕاست دەکەی لەو پێستەت وەرە دەرێ با منیش تەماشای تۆ بکەم.

قوجەلی لە پێستەکەی نەهاتە دەرێ. کیژی پاشا قایل بوو کە خەوی خۆی بە قوجەلی بدات تا ئەویش لە پێستی کۆتر بێتە دەرێ.

قوجەلی خەوی کیژەی وەرگرت، لە شەقەی باڵی داو ڕۆیی. ئیدی لەو ڕۆژە بە دواوە خەو لە کچە حەرام بوو. ئەوەندە بێ خەوی کێشا تا نەخۆش کەوتو لە جێگادا کەوت. حەکیمانی شا نەیانتوانی دەردەکەی دەرمان بکەن، چونکە پاشا فەرمانی دابوو کە هیچ حەکیمێ بۆی نییە دەستی بەر بەدەنی کچەکەی بکەوێ. ڕۆژێ قوجەلی خۆی کرد بە حەکیمێکی پیری نامۆو چووە کن پاشاو ئەوجا چووە کن کچەکەی پاشا کە بێ ئەوەی دەستی بەر بەدەنی بکەوێ چاکی بکاتەوە. قەدەرێ سەیری کچەکەی کردو ئەوجا گوتی ئەگەر (ئەفسانەی خۆشەویستی) بۆ ئەم کچە بگێڕدرێتەوە چاك دەبێتەوە.

چ كەسێكی شار ئەفسانەی خۆشەویستی نەدەزانی. دیسان قوجەلی لە پێستی ئەو حەكیمە پیرو لاوازەدا هاتە كن پاشاو گوتی:- لە فلانە كێودا شوانە وێڵەیەك هەیەو ئەفسانەی خۆشەویستی دەزانێ‌و ئەگەر پاشا بەخۆی بچێ بە شوێنیا ئەوا دێتە سەر كیژەكەی.

* * *

شوانەكە دیسان بێدەنگ بوو و، لە چاوانی حەیرانی كیژە ڕاما. پێكەنی‌و گوتی:- بەڵێ، ئەی كیژی جوان، ئەی كیژە خان ئەوە دنیایە ڕۆژێك بوو بابت وەكو كسۆكان لە ماڵە خۆی دەری كردم‌و پاشان بەخۆی هات بەسەر دەستم‌و پێم دا كەوت‌و هێنامیە كن تۆ، هەنووكە چ دەڵێی؟

كچە خان نەیتوانی بەری گریان بگرێ، گوتی:- قوجەلی، من ئیدی بۆ هەمیشە ئەوەم لە مێشكی خۆ دەركردووە كە كیژی پاشام. ئێستا دەزانم كە چەندم پێویست بە خۆشەویستی تۆ بووە. لەگەڵ خۆتم بەرە. دەمەوێ وەكو خەڵكی بژیم.

قوجەلی گوتی:- وەكو خەڵكی ژیان، بۆ تۆ كارێكی ئاسان نییە. چونكە تۆ لە نازو نیعمەتدا گەورە بوویت، بەڵام ئەگەر خۆت بتەوێ هەڵبەتە دەتوانی لەگەڵ ژیانی تازەتدا ڕابێی.

كچەخان گوتی:- ئەگەر لەگەڵ تۆو خەڵكی دابم، هەموو كارێكم بەلاوە سانایە. قوجەلی لەگەڵ خۆتم بەرە. كچە خان بەتەنێ جێ مەهێڵە.

قوجەلی فرمێسكەكانی كچە خانی سڕی، سێوێكی لە گیرفانی دەرهێناو گوتی: - ئێستا تۆ ماندوویت، جارێ ئەم سێوە بە دەستی من بخۆو پاشان دێمەوە بە شوێنتا. تۆ ئیدی بۆ هەمیشە منت خۆشدەوێ، دەزانم.

كیژی ڕند سێوەكەی وەرگرت‌و خواردی. بە پشتا ڕاكشا، ئەوسا چاوەكانی هاتنەوەیەك‌و هێدی هێدی چووە باوەشی خەوێكی شیرینەوە.

قوجەلی هەستا، ماچێكی گۆنای كچە خانی كردو ڕۆیی. بە پاشای گوت:- خەوی كیژەكەتم گەڕاندەوە. دەبێ تا سێ ڕۆژان چ كەسێ بە دەوری كۆشكەكەیدا نەچێ، ئەگینا خەوی دەزڕێتەوە.

ڕۆژی چوارەم دەتوانن بچنە كنی.

"٥"

بەیانی ڕۆژی دووەم بەر لە هەتاو كەوتن، قوجەلی لە پێستی كۆتردا هاتە كن كچە خان، لە پێستەكەی هاتە دەرێ‌و گوڵێكی سووری لەبەر كەپوی كچەدا ڕاگرت. كچە چاوانی هەڵێناو بە نازەوە پێكەنی.

قوجەلی گوتی:- باش خەوتی؟

كچە خان گوتی:- خەوێكی خۆشم كرد. هەنووكە دەگەڵ خۆتم دەبەی؟

قوجەلی گوتی:- بەڵێ، هەستە بابچین، لە حەوزەكەدا خۆت بشۆو پاشان بڕۆین.

* * *

تازە هەتاو كەوتبوو كە جوتێ كۆتری سپی لە شەقەی باڵیان داو لە سەر كەڵی دار هەنارەكەی كەنار حەوزەكەوە بەرەو ئاسمانێ بەرز بوونەوە. ( حەمەكەریم عارف-١٩٨٢)

## سەر بهوردی دومرولی سەر شێت

زەمان وعەیامێك لە نێو هۆزی ئۆغوزدا پاڵەوانێك هەبوو بە نێوی دومرولی سەر شێت. هەر بۆیەش سەر شێتیان پێدەگوت، چونکە بە منداڵی نۆ گاکێوی کوشتبوو و کاری گەورە تریشی کردبوو.

هەنووکەش لەسەر چۆمێکی وشك پردێکی دروست کردبوو و هەموو کاروان و رێبوارانی ناچاردەکرد کە بەسەر پردەکەی ویدا بپەڕنەوە. هەر کەسیش بپەڕایەتەوە سێ تمەنانی لێ وەردەگرت، خۆ ئەگەر یەکێك سەرپێچی کردباو بیویستایە لە رێیەکی دییەوە بپەڕێتەوە، تێرو پڕی دارکاری دەکردو لە بری سێ تمەنان، چل تمەنی کاشی لێدەستاندو بەرەڵلای دەکرد.

ئێوە ناپرسن ئەم دومرولە بۆ ئەم کارەی دەکرد؟

ئەو بەخۆی دەیگوت کە: دەمەوێ پاڵەوانێکی بە قوەتم لێپەیدا بێ و لە فەرمانی من دەربچێ و شەڕم لەگەڵدا بکات، تا بیدەم بە عاردیداو شۆرەتی پاڵەوانیم لە سەرانسەری جیهاندا بکەوێتە سەر زاران. دومرول ئەو دلاوەرە بوو.

رۆژێ خێڵێ هاتن و لە نزیکی پردەکەی ئەوەوە هەواریان خست و چادریان هەڵدا. لاوێکیان دەگەڵ بوو کە بە چاکی و پاڵەوانی مەنشوور بوو. رۆژێ کوت و پڕ نەخۆشکەوت و مرد. هاواری ناڵەو زاری بەرز بۆوە. یەکێك دەیگوت: "وای کزەی جەرگم!" و قژی دەرنییەوە. یەکێکی دی دەیگوت: "برا رۆ!" و خاکی بەسەر خۆدا دەکردو هەشی دەپێوا. هەر هەموویان دەگریان، شیوەنیان دەکردو ناوی ئەو کوڕە لاوەیان دەگوتەوە.

لە پڕ دومرولی پاڵەوان لە ڕاوێ گەڕایەوەو گوێی لە دەنگی شین و شەپۆڕ بوو. تووڕە بوو و هاواری کرد: ئەهای، نامەردینە! بۆ دەگرین؟ ئەمە چ شیوەن و تازێیەکە لە کەنار پردەکەی مندا داتان مەزراندووە؟

دەم سپی خێڵەکە هاتنە پێشەوەو گوتیان:- پاڵەوان تووڕە مەبە. ئێمە کوڕە لاوێکی دلاوەرمان هەبوو ئەمڕۆکە مرد. بە جێی هێشتین، بۆ ئەو دەگرین.

دومرولی سەرشێت هەڵیکێشایە شیرو لە نەعرەتەی دا. ئەهای، کێ کوشتی؟ کێ غیرەتی جولاوە کە لە پاڵ پردەکەی مندا پیاو بکوژێ؟

دەم سپی خێڵ گوتیان:- پاڵەوان، کەس نەیکوشت. خوا فەرمانی بە ئیزراعیل داو ئیزراعیل کە باڵی سووری هەن لە پڕ خۆی گەیاندە سەری و گیانی کێشا.

دومرولی سەرشێت بە تووڕەییەوە نەعرەتەی کێشا. ئیزراعیل کێیە؟ من ئیزراعیل و مزراعیل ناناسم، خوایە، بیکە بۆ خاتری خۆت ئیزراعیلم بۆ بنێرە تا بە گژیا بچم و پیاوەتی و کەڵەمێردی خۆ بنوێنم و روحی ئەو لاوە دلاوەرەی لێ بستێنمەوەو تا ئیزراعیل ئیزراعیل بێ ئیدی نامەردانە روحی دلاوەران نەکێشێت.

دومرول ئەو قسانەی کردو بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە. خوا لە قسەکانی دومرول ڕەنجا. بە ئیزراعیلی گوت:- ئەی ئیزراعیل خۆ بینیت ئەم شێتی لە خۆرازیە چ کفرێکی کرد؟ شوکرانەی یەکتایی و دەسەڵاتی من بەجێ نایەنێ و دەیەوێ خۆی لە کاروباری من هەڵقورتێنێ‌و زۆر بە خۆی دەنازێ.

ئیزراعیل گوتی:- خوایە، فەرمان بدە بچم رۆحی خۆی بکێشم‌و تا هۆشی وەبەر بێتەوە و بزانێ مەرگ یانی چی!

خوا گوتی:- ئەی ئیزراعیل هەر ئێستا دابەزەو خۆت بخەرە بەرچاوی ئەو بێ دینە، بێ ترسێنەو رۆحی بکێشەو بۆمی بێنە.

ئیزراعیل گوتی:- هەر ئێستا دەچمە کن دومرول و مۆڕەیەکی وای لێدەکەم لە ترساندا وەکو شۆڕەبییان بلەرزێ‌و ڕەنگی ببێ بە جاوی سپی.

***

دومرولی سەرشێت لە ماڵە خۆیدا ڕۆنیشتبوو، لەگەڵ چل پاڵەوانی هەڵبژاردەدا سەرگەرمی قسان بوو. باسی ڕاوەشێرو پڵینگ‌و پاڵەوانێتی خۆیان دەکرد. کێشکچییان بەر دەرکەکانیان گرتبوو، ئێشکیان دەگرت. لە نکاودا ئیزراعیل لەبەر چاوی دومرول وەدیارکەوت. دەرگاوانان‌و کێشکچیان شتاقیان ئیزراعیلیان نەبینی بوو.

پیرەمێردێکی بەدفەساڵ‌و رەزا قورس‌و بەسام کە شێری بێشان هەتڕەشی لێدەچوو. چاوە پروشەکانی ناخی دڵیان دەسمی.

دومرول هەرکە چاوی پێکەوت، چاوانی کەوتنە رێشکەو پێشکە. دەستە بە هێزەکانی کەوتنە لەرزین‌و دنیای لێبوو بە چەرمی چۆلەکە. هاواری کرد: ئێستا سەیرکە بزانە چی گوت. گوتی: ئەی پیری بەسام، تۆ کێی کە دەرگاوانەکانم نەیان بینیت، کێشکچیەکانم نەیان دیتیت؟ چاوانت خستمە ڕێشکەو پێشکەو دەستەکانت خستمە لەرزین. ئەهای پیری ڕدێن چەرموو بڵێ بزانم تۆ کێی گیانمت خستە لەرزین؟ ئەهای پیری کوت‌و کوێر بڵێ بزانم چ ئیشێکت لێرە هەن؟ ئەگینا بۆت هەڵدەستم‌و بەڵایەکی وات بەسەر دێنم تا دنیا دنیا بێ بە حەکایەتان بیگێڕنەوە. دومرولی سەرشێت ئەوەندە ئاڵۆز بوو کە سمێڵەکانی دەجوو، بە دەست دەسکی شمشێرەکەی دەگوشی. پاڵەوانەکانی هەموو کڕ دانیشتبوون‌و لایان عەیان بوو کە کابرای پیر بە سەلامەتی لە دەستی دومرول دەرناچێت.

کە دومرول لە قسەکانی بۆوە، ئیزراعیل لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:- ئەهای شێتی ماڵ وێران! قینت لە ردێنی سپیم هەستا، ها؟ چاك بزانە گەلێ پاڵەوان ڕدێنیان ڕەش بوو و ڕۆحم کێشان.

ڕقت لە چاوانی کوت‌و کوێرم هەستا، ها؟ دە چاك بزانە گەلەك کیژان‌و نۆبوکان، چاومامزی بوون‌و رۆحم کێشان‌و داك‌و ژنانی زۆرم ڕەشپۆش کردوون.

کەس ورتەی لێوە نەدەهات. دەمی دومرول کەف چەڕی بوو. خوا خوای بوو پیرەمێردەکە زووتر خۆی بناسێنێ تا لێی راپەڕێ‌و بە شمشێران دای قڵەشێ. نەعرەتەی کێشاو گوتی:-

ئەهای پیرە کوێر! نێوی خۆت بڵێ بزانم کێی. ئەگینا بەبێ ناوونیشان دەتکوژم... چیدی خۆم پێ زەوت ناکرێت .

ئیزراعیل گوتی:– هەنووکە بۆ خۆت دەزانی من کێم. ئەی شێتی نەگریس، لە بیرتە بە خۆتەوە دەنازیت و دەتگوت ئەگەر ئیزراعیلی باڵ سوور بدینم دەیکوژم و روحی خەڵکی لێرزگار دەکەم؟.

دومرول گوتی:– ئێستاش دەیڵێمەوە کە ئەگەر ئیزراعیل بکەوێتە دەستم باڵەکانی هەڵدەکێشم و کەللەی دەهاڕم.

ئیزراعیل گوتی:– ئەی شێتی کەللە ڕەق. هەنووکە هاتووم ڕوحی خۆت بکێشم!... تەسلیم دەبیت یان قسەو باسێکت هەن؟

دومرول هەرکە ئەمەی ژنەوت ڕاپەڕی و لە نەعرەتەی دا. ئەهای تۆ ئیزراعیلی باڵ سووری؟

ئیزراعیل گوتی:– بەڵێ، منم.

دومرول گوتی:– ئەدی باڵەکانت کوان، هەی نەگبەت!

ئیزراعیل گوتی:– من هەزار شێوەم هەن!.

دومرول گوتی:– تۆ رۆحی ئەم هەموو دلاوەرو نۆ بووکانە دەکێشی هەی نامەرد؟

ئیزراعیل گوتی:– ڕاستت کرد. هەنووکەش نۆرەی تۆیە!

دومرول نەڕاندی:– هەی نەگریس، من ئاسمانت بۆ دەگەڕام کەچی لەسەر عاردی بە دەستم کەوتی. هەنووکە پێت نیشان دەدەم کە چتۆ رۆح دەکێشن.

دومرول ئەمەی گوت و فەرمانی بە کێشکچیان و دەرگاوانان دا:– دەرگاوانان، کێشکچیان، دەرکەکان داخەن، چاك وریا بن کە ئەم بەدفەڕە هەڵنەیەت!

ئەوسا شمشێرەکەی دەرهێناو بەرزی کردەوەو پەلاماری ئیزراعیلی دا. ئیزراعیل بوو بە کۆترو لە دەلاقەیەکی بچووکەوە فڕکەی کردو لە چاو ون بوو. دومرول دەستەکانی بە یەکدا دان و قاقا پێکەنی و بە پاڵەوانەکانی گوت:– خۆ بە چاوی خۆتان دیتتان ئیزراعیل چۆن لە زەبری شمشێرەکەم ترساو هەڵهات! ئەوەندە ترسا ئەو دەرگا زلەی نەبینی وەکو مشکان خۆی دەکونان خزاند. بەڵام من دەست بەرداری نابم. ڕابن پاڵەوانەکانم! دووی دەکەوین و سوێند دەخۆم تا نەیکەم بە خۆراکی شەهێنەکەم نایەڵم بهێورێ.

چل و یەك پاڵەوان ڕابوون. سواری ئەسپ بوون و کەوتنە ڕێ.

دومرولی سەرشێت شەهێنەکەی خستبووە سەر باسکی و، ئەسپی بە دووی ئیزراعیلدا تاو دەدا. لە هەر شوێنێ کۆترێکی دیت ڕاوی کرد، بەڵام ئیزراعیلی نەدۆزییەوەو نە دۆزییەوە. لە گەڕانەوەدا تاك کەوتەوە لە ڕێگایەکەوە دەهات مەگەر هەر ئیزراعیل پێی بزانێ. گەییە کەنار کەندێك لە پڕ ئیزراعیل لەبەر چاوی ئەسپەکەی دومرول بە دیارکەوت. ئەسپەکە بە تاو دەهات، لە پڕ ڕەوییەوەو دومرولی هەڵداو خستییە قوڵایی کەندەکەوە. سەروقژی ڕەشی دومرول چەمییەوەو خوار بوو. ئیزراعیل دەمو دەست هاتو چۆکی لەسەر سینگی سپی دومرول داداو گوتی:– ئەهای دومرولی سەرشێت، هەنووکە چ دەڵێی؟ ئەوەتا خەریکە گیانت دەکێشم، بۆ نەعرەتە لێنادەیت و پاڵەوانێتی نانوێنی؟

دومرول کەوتە خنکە خنك. گوتی:- ئیزراعیل نەمدەزانی بە ڕێگری گیانان دەکێشیت و لە پشتەوە خەنجەر دەوەشێنیٚ... ئەهای!.

ئیزراعیل گوتی:- قسەی بەلاش مەکە. ئەگەر قسەیەکی ماقوڵت هەن بیکە. تۆ وا لە سەرە مەرگدایت.

دومرولی پاڵەوانی بە توانا، دلاوەری مێرخاس و کەڵەمێرد، گیرۆدەی نامەردێك بوو بوو کە هەزار شێوەی هەیە، بە ڕێگری گیانان دەکێشێت و لە پشتەوە خەنجەران دەوەشێنیٚ. دومرول، ئەو پاڵەوانە مەردە هەنووکە حاڵی پەرێشان بوو، دڵی تەپە تەپی دەکردو نەیدەویست بمریٚ. دەیویست مەرگ هەر نەبیٚ، ژیان هەبیٚ و ژیان سەرانسەری هەر شادی بیٚ و شادی بۆ هەموو لایەك بیٚ و ئەو شادی بۆ خەڵکانی دی دابینبکات، وەکو چۆن پێشتر بۆ هۆزەکەی خۆی تێکۆشا بوو و شادی و بەختەوەری لەسەر زەمینی خۆیدا بەرپا کردبوو. ئەنجام گوتی:- ئیزراعیل یەك تۆزم مۆڵەت بدە. گویٚ بگرە بزانە چ دەڵێم. لە وڵاتی شیرینی ئێمەدا چیای گەورەو بەرز هەن، کە بەفر لوتکەکانی داپۆشیون، هێندە بەرزن کە تەنانەت تیری پاڵەوانێکی وەکو منیش نایانگەنیٚ. لە بناری ئەم چیایانەدا باخاتی پڕ درەختمان هەن. و ئەو باخانە پڕن لە مێو، ئەو مێوانە تریٚ ڕەشکە دەگرن، جا چەند شیرین و پاك و تەمیز! ترێکان دەگوشین و ئاوەکەی دە کوپەڵە دەکەین و چاوەڕیٚ دەکەین تا دەبن بە شەراب و ئەوسا لەو شەرابە دەخۆینەوەو مەست دەبین و ترسمان لە دڵا نامێنیٚ و نەعرەتەی وا دەکێشین کە شێری بێشان دەلەرزێنیٚ. منیش لەوی شەرابەم خواردەوەو ئاگام لەخۆ نەماو نەمزانی چیم وت کە خوا ڕەنجا. ئەگینا پاڵەوانێتی لە ڕێی دەرنەکردووم. لە ژیان تێر نەبووم و ڕقم لە مەرگەو نامەویٚ بمرم، دەمەویٚ بژیم، پیاوەتی بکەم، چاکە بکەم، ئەهای ئیزراعیل!... مەدەد!... گیانم مەکێشە!... واز لە من بێنە بڕۆ گیانی وان کەسانە بکێشە کە خراپە دەکەن و بەختەوەری خۆیان لەسەر حیسابی کلۆڵی خەڵکانی دی بینا دەکەن و نانیان لە برسی کردنی خەڵکانی دیدا بە دەست دێنن! بڕۆ!...

ئیزراعیل گوتی:- قسەی بێهودە مەکە هەی بەدفەڕ! تکاو پاڕانەوەکەشت بۆنی کوفری لیٚ دێت. یەکێکیان ئەوەیە کە لە من دەپاڕێیتەوە. لە من مەپاڕێوە، من بە خۆیشم خەڵقەنەیەکی بیٚ دەسەلاتم.

دومرول گوتی:- کەواتە خوا گیانی من دەکێشێت؟

ئیزراعیل گوتی:- دروستە. چ پێوەندیەکی بەمنەوە نییە.

دومرول گوتی:- ئەدی تۆ چ بەلایەکی ناگەهانی کەوا خۆت تێکەلاو دەکەی؟ گوم بە لەبەر چاوم تا من بە خۆم کاری خۆم بکەم.

ئیزراعیل لەسەر سینگی دومرول هەستا. بەلام پێی لەسەر سینگە سپییەکەی فشار دەداو هەناسەی دومرولی تەنگ دەکرد، پێی ئیزراعیل هەستی بە گەرمی و لێدانی دڵی دومرول دەکرد.

دومرولی سەرشێت لاقە شکاوەکەی درێژ کردو خوێنەکەی سەر تەوێڵی سڕی و گوتی: - خوایە، نازانم کێیی؟ چیت، لەکوێیی. بیٚ ئاقلانی زۆر لە ئاسمانان بۆت دەگەڕێن. لەسەر زەوی بۆت

دەگەڕێن، بەڵام نازانن کە تۆ لە نێو دڵی مرۆڤان دایت. خودایە، ئەگەر گیانیشم دەکێشی بە خۆت بیکێشەو مەیدە دەست ئەم ئیزراعیلە نامەردە!....

ئیزراعیل گوتی:– کلۆڵی نەگبەت وێردو لالانەوەکەشت بۆنی کفری لێدێت، رزگار بوونت نییە!....

خوا قسەی دومرولی لە گیان خۆش بوو و فەرمانی بە ئیزراعیل دا:– ئەهای ئیزراعیل، ئەم کارە بۆ تۆ نەهاتووە. بە دومرول بڵێ گیانێکی دی بدۆزێتەوەو بمداتێ و تۆ واز لەو بێنە.

ئیزراعیل گوتی:– خوایە، دەست هەڵگرتن لەم ئینسانە روو قایمە سەرکێشە، کارێکی چاك نییە.

خوا گوتی:– ئیزراعیل، تۆ چیدی تێکەڵ بە کاری من مەبە.

ئیزراعیل پێی لەسەر سینگی دومرول هەڵگرت و گوتی:– هەستە. ئەگەر بتوانی گیانی کەسێکی دی پەیدا بکەیت و لەبری گیانی خۆت بمدەیتێ هەقم بەسەر تۆوە نابێ.

دومرولی پاڵەوان تەکانێکی دا، هەستاو لەسەر لاقە شکاوەکەی وەستاو گوتی:– دیتت ئیزراعیل چۆن لە دەستت رزگار بووم؟ وەرە با بڕۆین بۆ کن پیرە بابەکەم. زۆری خۆش دەوێم. گیانی خۆی بۆ من لەبەر چاو نییە.

دومرولی سەرشێت پێشکەوت و ئیزراعیل بە دوایا، هاتنە کن پیرە بابەکەی دومرول. بابی نێوی "دوخا قوجا" بوو. کە چاوی بە سەروچاوی لە خوێنا شەلاڵی دومرول کەوت هاواری کرد گوتی:– رۆڵەکەم ئەمە چییە؟ ئەسپەکەت لە کوێندەرێیە؟ ئەمە کێیە کەوا مۆڕەم لێدەکات.

دومرول دانەوییەوە. دەستی پیرە بابی ڕاموسی و گوتی:– بابە سەیرکە چم بەسەر هاتووە. کفرم کردو خوا زویر بوو، فەرمانی دایە ئیزراعیل کە لە ئاسمانێ ڕا بێتە خوارێ و گیانم بکێشێت. ئیزراعیل پێی خستە سەر سینگی سپیم، خستمیە خنکە خنك، ویستی رۆحم بکێشێت. هەنووکە بابە تۆ رۆحی خۆت دەدەیە ئیزراعیل تا دەست لە من هەڵگرێ یا دەتەوێ لە پرسەکەمدا جلی ڕەش بپۆشیت و "کوڕەکەم ڕۆ! و ڕۆڵە رۆم" بۆ بکەی؟ کامیانت دەوێ بابە؟ زوو وەڵاممان بدەوە چونکە وەختمان کەمە. دوخا قوجا کڕبوو لە فکران ڕاچوو. چل پاڵەوانەکەی دومرول لە ڕاوێ هاتنەوە، لە ڕێگادا ئەسپە ڕەواوەکەی ئەویان بینی بوو کە بە تەنێ دێ و دومرولی بە سەرەوە نییە.. هەموو نیگەرانی ئەو بوو بوون. هەنووکە بە چاوی خۆ دەیان بینی کە پاڵەوانی بریندار لەبەردەم بابیدا وەستاوە.

بابی ئەنجام هاتە قسان و گوتی:– دومرول، ئەی جگەر گۆشەم، کوڕەکەم، ئەی ئەو پاڵەوانەی بە منداڵی نۆ گاکێویت کوشت، تۆ کۆڵەکەی ماڵ و ژیانمی! تۆ نەوگوڵی کیژان و بووکانی منی! من نایەڵم تۆ بمری. ئەو کێوە سەرکەشانەی بەرانبەرمان ئی منن، ئەگەر ئیزراعیل دەیەوێت بڵێ پێشکێشی بن. من کانیاوی ساردو سازگارم هەن، ئەسپانی گەردن کەشم هەن، قەتاری وشترانم هەن، پەچەو تەویلەی پڕ پەزانم هەن، ئەگەر بە ئیزراعیل لازمن بڵێ موبارەکی بن، هەرچەندی زێڕو زیوو خشڵی پێدەوێ دەیدەم، بەڵام کوڕم، ژیان شیرینەو گیان ئازیزە، ناتوانم چاوپۆشیان لێبکەم.

دومرول گوتی:– بابە هەموو سەروەت و سامانەکە بۆ خۆت من گیانم دەوێ. دەیدەی یان نا؟

دوخا گوتی:– کوڕم، تۆ لە من عەزیزترو دڵسۆزترت هەن، دایکت هەیە. هەرڕۆ کن ئەو.

ئیزراعیل کەوتبووە خۆ کە گیانی دومرول بکێشێت. دومرولی گوتی: دەستت، هەی نامەرد! دەچینە کن دایکم.

چوونە کن پیرە داکەکەی دومرول. دومرول دەستی دایکی راموسی و گوتی: دایکە، تۆ ناڵێی بۆ وام بەسەر هاتووە، بۆ زامدار بووم و چم بەسەر هاتووە؟

دایکی بە پەکو پۆوە گوتی: ئەیەڕۆ رۆڵە، ئەوە چت لێ قەوماوە؟

دومرول گوتی:– دایکە، ئیزراعیلی باڵی سوور لە ئاسمانێ را هاتە خوارێ و چۆکی خستە سەر سینگم و دەستی خستە بینم و ویستی رۆحم بکێشێت. داوای رۆحی بابم کرد تا ئیزراعیل واز لە من بێنێ کەچی نەیدامێ. هەنووکە دایکە داوا لە تۆ دەکەم، رۆحت بە من دەبەخشیت یا دەتەوێ لە پرسەکەم دا دانیشیت "رۆڵە رۆم...!" بۆ بکەی؟... چ دەڵێی دایکە؟

دایکی لە فکران راچوو، ئەوجا سەر هەڵبڕی و گوتی:– کوڕەکەم، روناکی چاوانم ئەی ئەو کەسەی نۆ مانگان بە پێستی سك هەڵم گرتیت، ئەی ئەو کەسەی شیری سپیم دەرخوارد دایت، بریا لە قولەو قەڵاتانی عاسی گیرت دەخواردو دەهاتم زێڕو زیوم هەڵدەرشت و رزگارم دەکردیت، بەڵام چیبکەم لە شوێنێکی تووش دا گیرت خواردووەو پێی هاتنم نییە، کوڕم ژیان شیرینەو گیان ئازیزە، ناتوانم دەست بەرداری ژیانم ببم. چ چارەیەکم نییە.

دایکی دومرولیش گیانی خۆی نەدا. دومرول دڵی تەنگ بوو.

ئیزراعیل هاتە پێشەوە تا گیانی بکێشێت. دومرول ئالۆزاو لە نەعرەتەی دا. دەست راگرە. نامەرد مروەتت بێ و تۆزێکم مۆڵەت بدە!...

ئیزراعیل بەتەوسەوە پێکەنی. پاڵەوان تازە چت دەوێ؟ بە خۆت دیت کە چ کەسێك بەزەیی پێتا نەهات و گیانی خۆی نەدا. تا زووتر مل بدەیتە خەت قازانجی خۆتە.

دومرول گوتی: حەز دەکەی عەزرەتم لە دڵا وەمێنێ؟

ئیزراعیل گوتی:– عەزرەتی کێ؟

دومرول گوتی: من ژنم هەیە، دوو کوڕم هەن، ئەمانەتن. با بچین بە هاوسەرەکەمیان بسپێرم. ئەوسا چت دەوێ لێمی بکە.

دومرول پێشکەوت و چوو بۆ کن ژنەکەی. ژنەکەی دومرول جووتە منداڵەکەی خستبوونە باوەشی و شیری دەدانێ و دەی لاواندن، منداڵەکان دەستیان بە مەمکی دایکیاندا دەداو بە مشەمش شیریان دەخوارد و چاوەکانیان دەبریسکانەوە.

دومرول وەژوور کەوت. ژنەکەی هەر کە دومرولی بینی، کوڕەکانی داناو هاواری کردو باوەشی بەسەرو ملی دا کردو گوتی: ئەی دومرول، ئەی پشت و پەنا و پاڵەوانانی من، ئەمە چییە؟ تۆیە کە هەرگیز پەژارەت نەدەناسی، تۆیە کە تێشکانت بە بیردا نەهاتووە، هەنووکە بۆ چ پەرێشانیت؟... تەماشای کوڕەکانت بکە.

دومـرول تەماشـایەکی جووتـە کوڕەکـەی کـرد. منداڵـەکان لەسـەر کـەوڵی ئاسـك تلیـان دەداو چنگیان لە یەکدی دەداو گڕوگاڵیان دەکردو چاوەکانیان لە شادی دا دەبریسکانەوە.

دومـرول کـەمێك سـەیری کـردن. ئـەوجا بـە ژنەکـەی گـوت:– ئـەی هاوسـەری شـیرینم، دایکـی منداڵەکانم، دەزانی ئەوڕۆکە ئیزراعیلی باڵ سوور لـە ئاسمانێ را هاتـە خواریێو نامەردانـە چۆکی خستە سەر سینگمو ویستی گیانم بکێشێت. چوومە کن پیرە بابەکەم گیانی خۆی نەدا. چوومە کن پیرە دایکم. ئەویش گیانی خۆی نەدا. گوتیان ژیان شیرینەو رۆح ئازیزە، ناتوانین دەست بەرداریان بین ئێستاش ژنەکەم، ئەی دایکی منداڵەکانم، هاتووم تا منداڵەکانم بە تۆ بسپێرم. شاخە بەرزەکانم بە هاوینە هەوارت بن! کانیاوە ساردو سازگارەکانم نۆشی گیانت بن! ئەسپی گەردن کەشی زۆرم لە تەویلەدا هەن، با کەژاوەت بن! خانوو و کۆشکانم بە ساباتت بن! قەتاری وشترانم با بار کێشت بن! پەزی زۆرم حەڵاڵت بن! ئافرەت، ئەی دایکی جگەرگۆشەکانم، پاش من هەر پیاوێکت پەسەند کرد شووی پێ بکە. بەڵام دڵی منداڵەکانم مەشکێنە. بە تۆیان دەسپێرمو دەڕۆم.

ئیزراعیل هاتە پێشەوە. دومرول رەق راوەستا. لە پڕ ژنەکەی دومرول هەستاو لەن نێوان ئیزراعیل و شووکەیدا وەستاو هاواری کرد:– ئەی ئیزراعیل دەست راگرە! مادامەکی من هەم نایەڵم مێردەکە، پشتو پەناو پاڵەوانەکەم بەریێو لاوی و پاڵەوانێتی کوڕەکانی نەبینێ.

ئەوسا رووی کردە شووەکەیو گوتی: ئەی دومرول، شووەکەم، بابی پاڵەوانی کوڕەکانم، ئەمە چ قسەیەك بوو کە کردت؟... ئەی ئەو کەسەی هەر کە چاوم کردەوە ناسیتم، ئەی ئەو کەسەی دڵم داویتێو خۆشم ویستووی، ئەی ئەو کەسەی بە دڵی پڕ لە خۆشەویستییەوە بووم بە ژنتو پێت شاد بووم، بەختەوەرت کردم، پاش تۆ چی لە شاخانی سەر بەرزت بکەم؟ بین بە گۆڕم ئەگەر پێیان تێ بنەم. پاش تۆ چی لە کانیاوی ساردو سازگارت بکەم؟ ببی بە خوێناوم گەر دڵۆپێکی لێ بخۆمەوە. پاش تۆ چ لە زێڕو زیوو خشڵان بکەم؟ تەنیا بەن کەڵکی کفن کڕین دێت. دوای تۆ چ لە ئەسپانی گەردن کەشت بکەم؟ ببێ بە تابووتی گەر پێ لە ئاوزەنگیان بخەم...

پاش تۆ چ لە مێرد بکەم؟ مار پێوەم دا گەر شوو بکەمەوە. ئەی پیاو ئەی بابی کوڕەکانم، گیان چ بایەخێکی هەیە کە بابو دایکت نەیان دایتێ؟... بە شایەتی ئاسمان، بە شایەدی زەوی، بە شایەدی خوا، بە شایەدی پاڵەوانانو ژنانو پیاوانی هۆزەکە، وا من بە حوسنو رەزای خۆم گیانم بە تۆ بەخشی!.

ژنەکە، مێردەکەی ماچ کرد، ماچ کردو هاتە بەردەم ئیزراعیل و رەق راوەستا. ئیزراعیل ویستی رۆحی ژنەکە بکێشێت.

ئەمجارە دومرول راپەڕیو لە نەعرەتەی دا. ئەی ئیزراعیلی نامەرد تۆ بۆ ئەوەندە بە پەلەی، بۆ دەتەوێ زوو ڕەشپۆشمان بکەی؟.... دەستت راگرە، هێشتا قسانم ماون.

ئیزراعیل، دومرولی ئەوەندە بە تووڕەیی بینی کە زاتی نەکرد دەست لە ژنەکەی بدات، هەنگاوێك دوور کەوتەوەو وەستا.

دومرولی پاڵەوانی گەورەو ئازا توانای دیتنی مەرگی ژنەکەی نەبوو دەمی کردەوەو بە دەنگی بەرز گوتی:- خودایە، نازانم کێی چیت و لە کوێ دایت!... بێ ئاقلانی زۆر لە ئاسمانان را بۆ تۆ دەگەڕێن، لەسەر زەوی تاقیبت دەکەن، بەڵام ئاگایان لەوە نییە کە تۆ لە نێو دڵی مرۆڤاندایت و جێی تۆ کانگای دڵە. خودایە کۆشك و کاروانسەرا لەسەر ڕێ و بانان دروست دەکەم، برسیان تێر دەکەم، رووت و ڕەجاڵان پۆشتە دەکەمەوە، بەختەوەری بۆ هەمووان دابین دەکەم. من ژنەکەم خۆش دەوێ، ئەگەر دەتەوێ گیانی هەردووکمان بکێشەو ئەگەر ناتەوێ واز لە هەردووکمان بێنە!....

خوا کەیفی بە قسەکانی دومرول هات و فەرمانی بە ئیزراعیل دا:- ئەی ئیزراعیل، ئەم دوو هاوسەرە سەدو چل ساڵی دی دەژین، تۆ بڕۆ گیانی داك و بابی دومرول بکێشەو بگەڕێوە.

ئیزراعیل هەستا، چوو گیانی داك و بابی دومرولی کێشاو گەڕایەوە.

دومرول، ژنەکەی و هەردوو منداڵەکەی لە ئامێز گرتن و ماچ بارانی کردن، هەموویان پێکدی شادو شوکر بوونەوەو گۆرانی پاڵەوانێتی و سروودی شادیان دەگوت و هەڵهەڵەیان لێداو ژن و پیاو هەڵپەڕین و جرید بازییان کرد. لەم کاتەدا "دەدە قورقود" دەمڕاست و ردێن سپی هۆزی ئۆغوز هات و بەشداری شادییەکەیانی کردو حاڵ و حەکایەتەکەی دومرول و هاوسەرەکەی کرد بە چیرۆك و، گۆرانییەکی بە ناوی ئەوانەوە دانا تا پاڵەوانان بیخوێننەوەو بیزانن و دەرس و پەندی لێوەرگرن.

١٩٨٢/ حەمەکەریم عاف

**یوڵدزو قەلان**

پێشکەشە بە: کازم و روح ئەنگیز،منداڵدۆستان، تا منداڵانی چاکمان بۆ پەروەردە بکەن، بەو ئومێدەی لە گەورەییدا ژیانیان لە ئێمە باشتر بێ.

**چەند وشەیەك لە یوڵدزەوە**

منداڵینە سڵاوتان لێ بێ!

من ناوم یوڵدزە. بە کوردی دەکاتە ئەستێرە، ئەمساڵ بووم بە دە ساڵان. ئەم چیرۆکەی دەی خوێنیتەوە بەشێکە لەسەر بهوردی من "ئاغای بیهرەنگ" سەروەختێ لە گوندەکەی ئێمەدا مامۆستا بوو. ماڵی لە حەوشەی ئێمەدا بوو. رۆژێك من سەربهوردی خۆم بۆی گێرایەوە. ئاغای بیهرەنگ زۆری پێخۆش بووو گوتی:- ئەگەر قەبوڵ بکەی، سەربهوردی تۆو قەلان دەکەم بە چیرۆك و لە کتێبدا بڵاوی دەکەمەوە. منیش بە چەند مەرجێك قبوڵم کرد. یەکەم: چیرۆکەکەی من تەنیا بۆ منداڵان بنووسێت، چونکە بنیادەمە گەورەکان حەواسیان ئەوەندە پەرت و بڵاوە کە لە چیرۆکەکەی من تێناگەن و لەزەتی لێ وەرناگرن و نابینن. دووەم: چیرۆکەکەی من بۆ منداڵانێ بنووسێت کە یا هەژارن یا زۆر بەناز پەروەردە نەکراون. کەواتە ئەم منداڵانە هەقی خوێندنەوەی چیرۆکەکانی منیان نییە.

١- ئەو منداڵانەی خولام و نۆکەران بۆ قوتابخانەیان دێنن.

٢- ئەو منداڵانەی بە ترومبێلی گران بایی بۆ قوتابخانە دێن.

ئاغای بیهرەنگ دەیگوت لە شارە گەورەکاندا منداڵانی دەوڵەمەند وا دەکەن و زۆریش بە خۆوە دەنازن.

با ئەمەشتان پێ بڵێم کە من تا حەوت ساڵی لەلای باوەژن بووم. ئەم چیرۆکەش هی ئەو دەمانەیە. دایکی خۆم لە گوند بوو. بابم تەڵاقی دابوو، ناردبویەوە بۆ لای بابی، لە گوند و ژنێکی دی هێنابوو. بابم لە دایەرەیەکدا کاری دەکرد. ئەو دەمانە ئێمە لە شارێکی بچووکدا دەژیاین، یەك شەقامی تێدابوو. پاش چەند ساڵێك چووم بۆ گوند.

بە هەرحاڵ ئاغای بیهرەنگ قەولی داوە کە پاش ئەمە، چیرۆکی بووکە شووشە گەورەکەی من بنووسێت. هیوادارم زۆر شتان لەسەربهوردی منەوە فێر بن.

دۆستتان/یوڵدز

## پەیدابوونی دایکە قەلێ

یوڵدز بە تاقی تەنیا لە ژووەرەوە دانیشتبووو تەماشای دەرێی دەکرد باوەژنەکەی چوو بووە حەمام. دەرگاکەی داخستبوو. بە یوڵدزی گوت بوو کە لە جێی خۆی نەجوڵێ. ئەگینا بێتەوە چاوی دەردێنێ، یوڵدز لە ژوورەوە دانیشتبوو تەماشای دەکرد. بیری کردەوە. وەکو بنیادەمی گەورە لە فکران ڕاچوو بوو. لە جێی خۆی نەدەجولا. زۆر لە باوەژنەکەی دەترسا. بیری لەلای بووکە شووشە گەورروەکەی بوو. تازە بووکە شووشەکەی گوم کردبوو. ئەوەندە پەست بوو مەپرسە. چەند جارێك قامكەكانی ژماردن. ئەوجا بە ئەسپایی هاتە بەر پەنجەرەکە. بێ تاقەت بوو بوو. لە پڕ دیتی قەلێك لە کەنار حەوزەکە نیشتۆتەوەو ئاو دەخواتەوە. یوڵدز تەنیایی خۆی فەرامۆش کردو دڵی کرایەوە.

قەلەکە سەری هەڵبڕی. چاوی بە یوڵدز کەوت. ویستی هەڵفڕێ. کە دیتی یوڵدز هەقی نییە بە سەرییەوە، نەڕۆیی. تۆزێ دەنووکی کردەوە. یوڵدز وایزانی دەیەوێ پێبکەنێ. شادبوو. پێی گوت:– کاکە قەل، ئاوی حەوزەکە پیسە، ئەگەر بیخۆیتەوە نەخۆش دەکەوی.

قەلە دیسان پێکەنی. ئەوجا هەڵقونایەوەو هاتە پێشەوە، گوتی:– نە گیانەکەم، بۆ ئێمەی قەلان چ فەرقێك ناکات. لەمەش پیستر دەخۆینەوەو هیچمان لێنایەت. چیدیش بە من مەڵێ "کاکە قەل" .من ژنم. چوار منداڵم هەیە. پێم بڵێ "دایکە قەلێ".

یوڵدز نەیزانی قەلەکە بەچدا ژنە. ئەوەندە میهرەبان بوو کە یوڵدز پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بیگرێو ماچی بکات. ڕاستە کە قەلەکە جوان نەبوو، بگرە ناشیرینیش بوو، بەڵام دڵێکی میهرەبانی هەبوو. ئەگەر تۆزێکی دی دەهاتە پێشەوە، یوڵدز دەیگرت و ماچی دەکرد.

دایکە قەلێ هاتە پێشترەوەو گوتی:– تۆ ناوت چییە؟

یوڵدز، ناوی خۆی پێگوت. ئەوجا دایکە قەلێ پرسی:– چ دەکەی لەو ژوورە؟

یوڵدز گوتی:– هیچ. باوەژنەکەم لێرەی داناوم و چووە بۆ حەمام. گوتی:– لەجێی خۆم نەجوڵێم. دایکە قەلێ گوتی:– تۆ کە وەکو بنیادەمی گەورە بیر دەکەیتەوە، بۆ بۆ خۆت وازی ناکەیت؟

یوڵدز بووکە شووشە گەورەکەی بیرکەوتەوە، ئاهێکی هەڵکێشا. ئەوجا پەنجەرەکەی کردەوە تا دەنگی بگاتە دەرێ، گوتی:– ئاخر دایکە قەلێ، هیچ نییە وازی پێبکەم. بووکە شووشەیەکی گەورەم هەبوو ماوەیەکە گوم بووە. بووکە شووشەکە قسانیشی دەکرد.

دایکە قەلێ بە نووکی باڵەکانی فرمێسکی چاوانی سڕی هەڵقونایەوەو لەبەر پەنجەرەکەدا نیشتەوە، یۆڵدز هەوەڵجار ترساو کشایەوە.پاشان زۆر شاد بوو و هاتە پێشەوە. دایکە قەلێ گوتی:– هاوڕێو هاو وازیت نین؟

یوڵدز گوتی:– "یەشار" هەیە، بەڵام زۆر کەم دەی بینم. دەچێتە قوتابخانە.

دایکە قەلێ گوتی:– وەرە پێکەوە یاری بکەین.

یوڵدز دایکە قەلێی گرت و کردییە باوەشی. سەری ماچ کرد. چاوی ماچ کرد. پەڕەکانی زبر بوون. دایکە قەلێ قاچەکانی کۆکردبووەوە تا جلەکانی یوڵدز پیس نەبن. یوڵدز دەنووکیشی ماچ کرد. دەنووکی بۆنی سابوونی لێدەهات. گوتی:– دایکە قەلێ، تۆ زۆرت حەز لە سابوونە؟

دایکە قەلێ گوتی:– دەمرم بۆ سابوون!

یوڵدز گوتی:– باوەژنەکەم پێی ناخۆشە. ئەگینا سەلکێك سابوونم بۆ دەهێنای تا بیخۆی.

دایکە قەلێ گوتی:– بە دزییەوە بیهێنە. باوەژنەکەت نازانێ.

یوڵدز گوتی:– باشە تۆ پێی ناڵێی؟

دایکە قەلێ گوتی:– من؟ دوو زمانی ناکەم.

یوڵدز گوتی:– ئاخر باوەژنەکەم دەڵێ: تۆ هەر کارێ بکەی. قەلێ دێت و پێم دەڵێ!

دایکە قەلێ لە ناخی دڵەوە پێکەنی و گوتی:– درۆ دەکات گیانەکەم. بەم سەرە ڕەشەم. من دوو زمانی ناکەم. بە بیانووی ئاو خواردنەوە دێمە سەر حەوزەکە، پاشان سابوون و ماسی دەدزم و دەڕۆم.

یوڵدز گوتی:– دایکە قەلێ دزی بۆ؟ ئاخر گوناحە.

دایکە قەلێ گوتی:– منداڵ مەبە گیانەکەم. گوناحی چییە؟ ئەمە گوناحە دزی نەکەم و خۆم و منداڵەکانم لە برساندا بمرین. ئەمە گوناحە گیانەکەم. ئەمە گوناحە کە نەتوانم سکی خۆ تێر بکەم. ئەمە گوناحە سابوونان لەو گۆڕەی بکەون و من برسیم بێ. من ئەوەندەم تەمەن کردووە کە ئەم شتانە بزانم. تۆش ئەمە بزانە کە بەو پەندو ئامۆژگارییە وشك و پوچەڵانە بەری دزی ناگیرێ. تا ئەو دەمەی هەر کەسەو بۆ خۆی بێ، دزی هەر دەمێنێ.

یوڵدز ویستی بچێت قاڵبێك سابوون بە دزییەوە بۆ دایکە قەلێ بێنێ. باوەژنەکەی خواردنی دەخستە یەغدانەوەو دەرکی یەغدانەکەی قفڵ دەدا، بەڵام سابوونی نەدەشاردەوە. دایکە قەلێی لەبەر پەنجەرەکەدا جێهێشت و بە خۆی ڕۆیی بۆ گەنجینەکە. سەلکێ سابوونی مەراغەی هەڵگرت و هێنای.

منداڵەکان، ڕۆژی ڕەش نەبینن! یوڵدز سەیری کرد دایکە قەلێ ڕۆییوەو باوەژن خەریکە بەرەو پەنجەرەکە دێ. بوخچەی حەمام لە ژێر باخەڵی بوو. دەموچاوی وەکو چەوەنەر سوور بوو. یوڵدز خراپ توش بوو بوو. باوەژن لە پەنجەرەکەوە سەری کێشایە ژوورەوەو هاواری کرد. یوڵدز، دیسان چی بووە ماڵەکە ژێرو ژوور دەکەی؟ ئەدی پێم نەگوتبووی لە جێی خۆت نەجوڵێی. ها؟

یوڵدز هیچی نەگوت. باوەژن چوو قفڵی دەرگاکە بکاتەوەو بێتە ژوورەوە. یوڵدز خێرا سابوونەکەی لە ژێر کراسەکەیدا شاردەوەو لە سووچێکا کزکۆڵەی کرد. باوەژن هاتە ژوورەوەو گوتی:– پێت نەوتم بە دوای چیدا دەگەڕایت؟

یوڵدز بە ساکارییەوە گوتی:– باجی... لێم مەدە! بە دوای بووکە گەورەکەمدا دەگەڕام.

باوەژن زۆری قین لە بووکە شووشەکەی یوڵدز بوو. گوێی یوڵدزی گرت و بایداو گوتی:– سەد کەڕەتم گوت بیری بووکە شووشەکەت لەسەر دەربکە! تێدەگەی؟

پاشان باوەژن چووە گەنجینەکەوە تا چای بۆ خۆی دەم بدا. یوڵدز بە بیانووی میزکردنەوە چووە نێو حەوشە. سەیری ئەملاو ئەولای کرد، سەیری کرد دایکە قەلێ لەسەر سووانەکە نیشتۆتەوەو چاوەکانی نیگەرانن. سابوونەکەی بردو لە ژێر گوڵو گەڵادا شاردییەوە. چاوێکی لە دایکە قەلێ داگرت کە بێت سابوونەکەی بەرێ. دایکە قەلێ زۆر بە هێوری هاتە خوارێو خۆی کرد بە بن گوڵو گەڵاکاندا. یوڵدز لێی پرسی:– دایکە قەلێ، یەکێك لە بێچووەکانت ناهێنی لەگەڵ منا وازی بکات ؟

دایکە قەلێ بە چپەوە گوتی:– پاش فراڤین چاوەنۆڕم بە. ئەگەر مێردەکەم رازی بێ، بێچویەکت بۆ دێنم. ئەوجا سابوونەکەی هەڵگرت، لە شەقەی باڵی داو ڕۆیی.

یوڵدز چاوانی بڕی بووە ئاسمان. کە قەلەکە دوور کەوتەوە، یوڵدز لە خۆشیاندا کەوتە هەڵبەزو دابەز. دەتگوت بووکە شووشەکەی دۆزی بۆوە. لە پڕ باوەژن قیڕاندی بەسەریا:– چەتیوە، ئەوە بۆ وا کەوتویتە سەما؟ وەرە ژوورەوە گەرما دەتبا. من تاقەتی ئەوەم نییە پەرستاریت بکەم.

دەمی فراڤین بوو. یوڵدز لە ژوورەوە دانیشت. پاش چەند دەققەیەك بابی لە دایەرە هاتەوە... ڕووی گرژ کردبوو، وەڵامی سەلامەکەی یوڵدزی نەدایەوە. بێوەی دەستەکانی بشوات، لەسەر سفرەکە دانیشت و دەستی بە نان خواردن کرد. پێدەچوو دیسان سەرۆکی دایەرەکەی تووڕەی کردبێ.

کەمی مابوو بۆنی پەتاتەی سوورەوە کراو یوڵدز ببورێنێتەوە. تەمەشای بابی دەکردو تفەکەی دەمی قووت دەدا. نەیدەتوانی شتێك هەڵگرێو بیخوات. باوەژن هەمیشە دەیگوت:– منداڵ نابێ خۆی بۆ خۆی خواردن هەڵگرێ. دەبێ گەوران خواردنی بۆ لە ئامانێکی بکەن و ئەوجا بیخوا.

( با کاك قەل بناسین )

مانگی نۆ بوو. نیوە ڕۆژەیان دەخوارد، بابەو باوەژن خەویان دەهات، دەخەوتن، یوڵدزیش ناچار بوو بخەوێ. ئەگینا بابە هاواری بەسەردا دەکردو دەیگوت:– منداڵ دەبێ فراڤین بخوات و بخەوێ . یوڵدز نەیدەزانی بۆ دەبێ هەر بخەوێ. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:– ئەمڕۆکە ئیدی ناتوانم بخەوم. دایکە قەلێ دێت ئەگەر من نەبینێ، بێچوەکەی دەباتەوە. لە پاینی ژوورەکەوە ڕاکشا، بە درۆ خۆی کردە خەوتوو. کاتێ بابەو باوەژن خەویان لێکەوت، هێدی هێدی چووە نێو حەوشەکەو لە ژێر دار تووەکەدا دانیشت. سێ جاران پەنجەکانی ژماردبوون کە قەلێ گەییە جێ. سەرەتا لەسەر سوانەی سەربانەکە نیشتەوە تەماشای یوڵدزی کرد. یوڵدز ئیشارەتی بۆ کرد کە دەتوانێ بێتە خوارێ. دایە قەلێ هاتە خوارێو لە تەنیشت ئەوەوە نیشتەوە. قەلۆچکەیەکی ناسکی لەگەڵ خۆدا هێنابوو. گوتی:– دەترسام خەوتبێتی.

یوڵدز گوتی:– هەموو ڕۆژێ دەنووستم. ئەمڕۆکە بابەو باوەژنم کردنە خەوو خۆم نەنووستم.

دایە قەلێ گوتی:– ئافەرین، کارێکی چاکت کرد. وەخت زۆرە بۆ خەوتن. ئەگەر بە ڕۆژەوە بنووی، ئەدی شەوانە چی دەکەی؟

یوڵدز گوتی:– ئەمە بە باوەژن بڵێ. بێچوە قەلەکەت بۆ هێنام؟

– چەند ناسکە؟

دایە قەلێ بێچوەکەی دایە دەست یولدز. زۆر جوان بوو. لە پڕ یولدز هەناسەیەکی هەلکێشا.

دایە قەلێ گوتی:- بۆ هەناسەت هەلکێشا ؟

یولدز گوتی:- بووکە شووشەکەم بیرکەوتەوە. بریا لێرەبا، بەسێ قۆلی گەمانمان دەکرد.

دایە قەلێ گوتی:- چت غەم نەبێ. کیژە گەورەی یەکێك لە نەوەکانم چەند رۆژێکی دی هێلکە دەکات و بێچوو هەلدێنێ. یەکێك لەوانەت بۆ دێنم و ئەوسا بۆ خۆتان دەبن بە سییان.

یولدز گوتی:- ئەدی تۆ خۆت بێچووی دیت نییە؟

دایە قەلێ گوتی:- با. هەمە ، سێ دانەی دیم هەن.

یولدز گوتی:- کەواتە هی خۆتم بۆ بێنە.

دایە قەلێ گوتی:- ئاخر خۆم بە تەنیا دەمێنمەوە. باوکە قەل قەبوولْ ناکات. ئەمەش کە بۆم هێناوی هێشتا زمانی نەپژاوە. دەڕوات. ناتوانێ بفڕێ. بە هەفتەیەکی دی زمانی دەپژێ. بە دوو هەفتەی دی بالْ دەگرێ. وریابە تا ئاخری دوو هەفتەکە فێری فڕین ببێ. ئەگینا، ئیدی قەت ناتوانێ بفڕێ، بیرت نەچێ.

یولدز گوتی:- ئەگەر فێر نەبێ چییە؟

دایە قەلێ گوتی:- دەمرێ، دەزانی خواردنی چی بدەیتی؟

یولدز گوتی:- نەء ، نازانم.

دایە قەلێ گوتی:- هەموو رۆژێ پارچەیەك سابونی بدەیە. تۆزێ گۆشت و شت. ئەگەر کرا جار جارە ماسییەکی چکۆلەشی بدەیێ، حەوزەکە پڕە لە ماسی. کرمیش دەخوات، پەنیرش دەخوات.

یولدز گوتی:- زۆر چاکە

دایە قەلێ گوتی:- باوەژن قایل دەبێ رای بگری؟

یولدز گوتی:- نەء ، باوەژن چاوی بەرایی نادات ئەم شتانە ببینێ. دەبێ بیشارمەوە.

بێچووە قەلەکە لە باوەشی یولدزا وریـنجە وریـنجی بـوو. دەنـووکی دەکـردەوە. بە ئەسـپایی دەنووکی لە دەستی یولدز دەداو بەری دەدا. چاوە چکۆلەکانی دەبریسکانەوە. لاقەکانی باریك و ناسك بوو. رێك وەکو قامکە تووتەی یولدز بوو. پەڕەکانی چەند نەرم بوو! وەکو پەڕی دایکی زێڕ نەبوو. لە دایکیشی جوانتر بوو.

دایە قەلێ گوتی:- ئێ، لە کوێ دەیشاریتەوە؟

یولدز بیری لەمە نەکرد بۆوە، لە فکران ڕاچوو، کوێی هەیە؟ هیچ شوێنێ. گوتی:- لە نێو گولەکاندا دەیشارمەوە.

دایە قەلێ گوتی:- نابێ باوەژنەکەت دەی بینی. ئەمە جگە لەوەی کاتێ کە گولەکان ئاو بدات، بێچوەکەم تەڕ دەبێ و سەرمای دەبێ.

یولدز گوتی:- ئەدی لە کوێ بیشارمەوە؟

دایە قەلێ تەماشایەکی ئەم لاو ئەولای کردو گوتی:- ژێر قالدرمەکە چاترە. قالدرمەکە دەچووە سەر هەورە بانەکە. لە شارە چکۆلەو گوندەکاندا لەم جۆرە قالدرمانە زۆرن. ژێر قالدرمەکە کولانە مریشك بوو.

بێچـوه قەلەکـەیان خسـتە ئـەوێوەو دەرکـەیان لێداخسـت تـا پشـیلە نـەیخوات، وبـاوەژن پـێ نەحەسێ، کـونێکی چـکۆلە لـە ژێـر دەرکـەی کولانەکـە هـەبوو، بێچـووە قەلەکـە دەیتـوانی لـەوێوە هەناسە وەربگرێ.

یولدز گوتی:– دایکە قەلێ، ئەمە ناوی چییە؟

دایە قەلێ گوتی:– پێی بلێ "کاکە قەل"

یولدز گوتی:– چما کوڕە؟

دایە قەلێ گوتی:– بەلێ.

یولدز گوتی:– بە چیا دیارە کە کوڕە؟ خۆ قەلان هەموو وەکو یەکن.

دایـە قەلێ گـوتی:– ئێـوە وا بیردەکەنـەوە. تـۆزێ وردبیتـەوە کـوڕو کچ لێکـدی جـودا دەکەیتـەوە. سەرو سیمایان دیارە.

تـۆزێکی دی قسـانیان کـردو لێکـدی جـودا بوونـەوە. یولـدز چـووە ژوورەوەو راکشـا. چـاوەکانی لێـك نـان. کـە بـاوەژن رابـوو، سـەیری کـرد یولـدز هێشـتا خـەوتووە. بـەلام یولـدز لـە راسـتیا نەخەوتبوو. خەوی نەدەهات. بیری لـەلای کاکە قـەل بوو. لە ژێرەوە سـەیری باوەژنی دەکردو لە دلی خۆیدا پێدەکەنی.

## ( جالجالۆکانی بەلەزەت )

چەند رۆژێ تێپەڕین. یولدز بە کەیف و بە دەماخ بوو بوو. بابەو باوەژن سەریان سووڕ مابوو. شەوێك باوەژن بە بابەی گوت:– نازانم ئەم مندالە چییەتی. دایمە پێدەکەنێ. سەما دەکات. دەبێ بچمە بنج و بناوانی ئەم کارەی.

یولدز گوێی لەم قسانە بوو، لەبەر خۆیەوە گـوتی: دەبێ وریاتر بم. رۆژی ٢–٣جار سـەری کاکـە قەلی دەدا. جار جارێ مال چۆل دەبوو کاکە قەلی لە کولانە دەهێنایە دەرێ، گەمـەیان دەکرد. یولـدز فێـرە زمـانی دەکـرد. دایـە قـەلیش جـار جـارێ دەهـات و شـتێکی بـۆ بێچـوەکەی دەهێنـا، پارچـە گۆشتێ، سابونێ و.. جارێکیان دوو جالجالۆکەی هێنا بوو، جالجالۆکەکان لە دەنووکی دایـە قەلێ گیر بوو بوون و لەقە فرتێیان دەکرد و نەیاندەتوانی دەربازبن.

جا قاچیان چەند درێژ بوون! یولدز لێیـان دەترسا. دایکـە قەلێ گـوتی:– مەترسە گیانـە، تەماشا بزانە بێچوەکەم چۆنیان دەخوات.

لـە ڕاسـتیا کاکـە قـەل بـە تاسـوقەوە قـووتی دان. ئـەوجا چـەند جارێـك دەنـووکی بـە عەردەکـە سڕییەوەو گوتی:– دایکە گیان، هی تریشم بۆ بێنە، زۆر بە لەزەت بوون.

دایکی گوتی:– زۆر چاکە.

یولدز گوتی:– لە ئاشخانەکەماندا زۆری تێدایە بۆت دێنم.

کاکە قەل دەمی لستەوەو سوپاسی یولدزی کرد.

لـەو رۆژە بـە دواوە یولـدز لێـرەو لـەوێ دەگـەڕا، جالجالۆکـەی راو دەکـرد، دەی خسـتە گیرفـانی کراسـەکەی، دوگمەکەشـی دادەخسـت تـا نـەڕۆن، پاشـان فرسـەتی دەهێنـاو دەیـدان بـە کاکـە قـەل.

هەڵبەتە ئەمانە بۆ ئەو بە خواردن نەدەهاتنە ژماردن. ئەمانە لە بری شەکرۆکەو نوقڵو ئەم جۆرە شتانە بوون. دایکە قەڵ گوتبووی ئەگەر گیانلەبەر خواردن نەخوات دەمرێ. ژیانی ئەو بە خواردنەوە بەندە.

ڕۆژێك لە كاتی نیوەڕۆژەدا. باوەژن سەیری كرد چەند جاڵجاڵۆكەیەكی دەستو پێ شكاو بەسەر سفرەكەدا دەڕۆن. یوڵدز زانی كە لە گیرفانی خۆی دەرچوون. دڵی كەوتە تەپە تەپ. هەوەڵجار ویستی كۆیان بكاتەوەو بیانخاتەوە گیرفانی. پاشان بیری كردەوە كە خۆی لێیان نەكا بە ساحێب چاكترە. باوەژن قاچی گرتنو توڕی دانە دەرێو ئەم بەڵایە بە خێرو سەلامەت تێپەڕی.

پاش نیوەڕۆژە یوڵدز چوو بەلای كاكە قەلەوە تا پاشماوەی جاڵجاڵۆكەكانی بداتێ. یەك دووانێك لە جاڵجاڵۆكەكانی پێشووشی لە پەناو پاساری حەوشەكەدا دۆزی بۆوە. یەكێكیانی بەسەری دوو قامكان گرتو خستییە دەمی كاك قەلەوە.. ئەمە لە دایكە قەلێوە فێر بوو بوو كە چۆن بە دەنوك خواردنی دەكرد بە دەم بێچووەكەوە.

كاكە قەل دەیویست جاڵجاڵۆكەكە بگرێ، لە پڕ حەپەساو سەری هێنایە داوەو گوتی:- ناخۆم یوڵدز گیان.

یوڵدز گوتی:- ئاخر بۆ قەلە چكۆڵەكەی من؟

كاكە قەل گوتی:- تۆ سەیری نینۆكەكانت بكە بزانە چەند بێ سەروبەرن؟

یوڵدز گوتی:- بێ سەرو بەر یانی چی؟

لكاكە قە گوتی:- درێژ، پیس، ڕەش! ببورە یوڵدز خانم، بەڵام من ناتوانم خواردنێ بخۆم كە.. تێدەگەی یوڵدز خانم؟

یوڵدز گوتی:- تێگەییشتم. زۆر سوپاست دەكەم كە بەرەو ڕوو ئەمەت پێگوتم. باوەڕ بكە منیش لەمە بەدواوە ناتوانم بەم نینۆكە پیسانەوە خواردن بخۆم.

### ( شەڕو فەرتەنە لەسەر ماسیو
### حوكمی ئیعدامی دایە قەڵ )

چەند وردە ماسییەكی سوور لە نێو حەزەكەدا بوون. ڕۆژی شەشەم یان حەوتەم بوو كە یوڵدز یەكێكیانی بە كاسە گرتو دایە كاكە قەلو قووتی دا. یەكەم ماسی بوو كە دەیخوارد. لە دایكی بیستبوو كە ماسی یەكجار بە تامە، بەڵام تامی نەكردبوو. دایكی ئەو وەك باوەژنەكەی یوڵدز نەبوو، زۆر شتی دەزانی. دەیزانی چ شتێك بۆ بێچوەكەی چاكەو چ شتێك خراپە. ئەگەر كاكە قەل داوای شتێكی خراپی لێبكردایە. هاواری بەسەردا نەدەكرد. دەیگوت:- ڕۆڵە گیان، ئەمەت بۆ ناهێنم، چونكە فلان زیانی هەیە، چونكە ئەگەر فلان شت بخۆی ناتوانی باش بقیڕێنی، چونكە دەنگت دەگیرێ، چونكە... هۆی هەموو شتێكی پێدەگوت، بەڵام باوەژن وا نەبوو. هەمیشە بە گرژیو مۆنییەوە دەیگوت: یوڵدز، فلان كار مەكە، فیسار شت مەخۆ، بۆ فلان شوێن مەچۆ، وا مەكە، ڕاست دانیشە، بە دەنگی بەرز قسان مەكە، بۆ چپە چپ دەكەیو لەم جۆرە قسانە. باوەژن

هەرگیز نەیدەگوت کە بۆ نموونە بۆ نابێ بە دەنگی بەرز قسان بکات، بۆ نیوەڕوان دەبێ بخەوێ. یوڵدز هەوەڵجار وایدەزانی کە هەموو ژنان دەبێ وەکو باوەژن بن. پاشان کە دایە قەلێی ناسی و بوون بە دۆست. ئەو بیرکردنەوەیەشی گۆڕا.

باوەژن، سبەینێ کە زانی یەکێك لە ماسییەکان دیار نییە. هات و هاواری گەییە ئاسمان. لەسەر نیوەڕۆژە بەمێردەکەی گوت: کاری قەلەکەیە، ئەو قەلەی هەموو جار دێتە سەر حەوزەکەو سابوون دەدزێ و زۆر بێ چاوو ڕووە. ئەگەر بیگرم، دار دەدەم بە ڕۆحیا، ئیعدامی دەکەم.

کوڵێ جنێوی ناشیرینیشی بە قەلەکەدا. یوڵدز هیچ دەنگی نەکرد. ئەگەر قسەی بکردایە، باوەژن هەستی دەکرد کە ئەو دەستی لەگەڵ دایە قەلێدا تێکەڵاوە. بە تایبەتی دوێنێ خەریك بوو لە قەراخ حەوزەکەدا بچێ بەسەری دا.

بابە گوتی:– قەلە ڕەش حەیوانێکی پیسە. دزە. لە هەموو ژیانما قەلە ڕەشێکی ڕێك و پێکم نەدیتووە. وریابە، ئەگینا ماسی لە حەوزەکەدا ناهێڵێ.

باوەژن گوتی:– وایە دەبێ وریابم، بە تایبەتی هەنووکە چەشە بووە، حەزدەکات قڕ بڕیان بکات.

یوڵدز لە دڵی خۆیدا بە گەوجێتی باوەژن پێکەنی.

**( دایە قەلێ زۆر شتان دەزانێ و**
**لە مەرگ ناترسێ )**

نیوەڕوانێك دایە قەلێ هات. هەموو خەوتبوون. دوو بەدوو لە سێبەری دار تووەکەدا دانیشتن. یوڵدز هەموو شتەکانی بۆی گێڕایەوە.

دایە قەلێ گوتی:– هەر بیری لێمەکەوە، ئەگەر باوەژن بیەوێ من بگرێ چاوانی دەردێنم.

ئەوجا کاکە قەلیان لە کولانە دەرهێنا. کاکە قەل زمانی ڕژا بوو. هەڵبەتە وەکو یوڵدزو دایە قەلێ نا. بەڵام لە چاو خۆیا باش قسەی دەکرد. تۆزێ بە نێو گوڵەکاندا سووڕایەوە، بای باڵی داو ئەوجا هات لە تەنیشت دایکییەوە هەڵنیشت. دایە قەلێ فێری کرد کە چۆن بە دەنووك ئەسپێ بگرێ و بیکوژێ.

دایە قەلێ جێ زامێ بە ژێر باڵی چەپییەوە بوو. ئەوەی بە یوڵدزو بێچووەکەی نیشان داو گوتی: – ئەم شوێن برینە هی پەنجا ساڵ لەمەوبەرە، چووبووم بۆ سابوون دزین، کابرای سابوونچی قەڵەنگێکی تێسرەواندوم زامداری کردم. پێنج ساڵی ڕەبەقی پێچوو تا زامەکەم ساڕێژ بۆوە. میوەی کێوم پەیدا کردو خواردم، تا چاك بوومەوە.

یوڵدز سەری لە خوێندەواری و زانستی دایە قەلێ سوور دەما. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد کە دایکێکی وەکو ئەوی هەبایە. دایکی خۆی بە بیر نەدەهات. تەنیا جارێك باوەژن پێی گووتبوو کە دایکی هەیە.

ڕۆژێك بابە و باوەژن شەڕیان دەبێ. باوەژن گوتبووی:– کچەکەش بەرە کن دایکی و با بڕوات بۆ لادێ. من چیتر کارەکەری ئەوم پێناکرێ. ئەوڕۆو سبەی بە خۆیشم دەبم بە خاوەن منداڵ.

راستییەکەی سکی باوەژن بەرز بوو بووەو لەسەر رۆژو ساتی خۆی بوو. یەك،دوو جاریش مامی یوڵدز باسی دایکی کردبوو. مامی جار جارێ لە گوندەوە دەهات و سەرێکی ئەوانی دەدا. یوڵدز هەر ئەوەندەی دەزانی کە دایکی لە گوندا دەژیو ئەوی خوشدەوێ. چ شتێکی دی لەمەڕ ئەو نەدەزانی.

ئەو رۆژە دایە قەڵێ یوڵدزی ماچ کرد، بێچوەکەی خۆی ماچ کرد و چوو لەسەر سووانەی سەربانەکە نیشتەوە تا بڕوات بۆ شاری قەلان. یوڵدز گوتی:- سڵاوم بگەیەنە بێچوەکانی دی و بابە قەل.

ئەوجا بیری کەوتەوە کە دیارییەك، شتێ بۆ بێچووەکان بنێرێ. مەمکە مژەیەکی لە گیرفاندا بوو. باوەژن بۆی کڕی بوو. مەمکە مژەکەی دەرهێنا، لە قاڵدرمەکانەوە چووە سەربان، مەمکە مژەکەی دایە دایکە قەڵێ تا بیدات بە منداڵەکانی. ئەوسا دایە قەڵێ هەڵفڕیو چوو لەسەر دار چنارێك نیشتەوە. رووی کردە یوڵدز، قارە قارێکی کرد، هەڵفڕیو ڕۆیی تا لە چاو ون بوو.

**(دیدارێکی کورتی یەشار)**

یوڵدز لە سەربان راوەستا بوو، لە خۆڕا تەماشای دووری دەکرد. لە پڕ بیری کەوتەوە کە بەبێ پرسی باوەژن هاتۆتە سەربان. کەمێك ترسا. تەماشایەکی ناو حەوشەکانی ئەو دەوروبەرەی کرد. ئێرە ماڵی یەشار بوو. لە پڕ یەشار هێواش هێواش هاتە دەرێ، چوو لەبەردەم کولانە چۆڵەکەی سەگەکەدا دانیشت. یەشار دوو، سێ ساڵ لە یوڵدز گەورەتر بوو. کوڕێکی زرینگ و میهرەبان بوو. یوڵدز هەر چییەکی کرد کە یەشار ببینێ، سەری نەگرت. نەشی دەتوانی دەنگی بەرز بکاتەوە. خەریك بوو نا ئومێد دەبوو کە لە پڕ یەشار سەری هەڵبڕیو ئەوی بینی. یەکەمجار سەرسام بوو پاشان بە خۆشحاڵییەوە هاتە بن دیوارەکەو گوتی:- ئەوە چ دەکەی لێرە یوڵدز؟

یوڵدز گوتی:- دڵم تەنگ بوو بوو، گوتم بچمە سەربان و تەماشای ئەملا و ئەولا بکەم.

یەشار گوتی:- باوەژنەکەت لە کوێیە؟

یوڵدز هەموو شتێکی بیر چووبوو. هەرکە ئەو قسەیەی گوێ لێبوو بیری کەوتەوە کە کاکە قەڵی لە نێو حەوشەدا بەجێ هێشتووەو لەوەیە باوەژن خەبەری ببێتەوەو ئەوساکە.. وای، چ دەقەومێ! خێرا لە یەشار جودا بۆوەو چووە خوارێ. کاکە قەڵی هێنا و تەپاندییە ناو کولانەکەوە. خەریك بوو دەرکی کولانەکەی دەگرت لە پڕ دەنگی باوەژن بەرز بۆوە: یوڵدز، ئەوە چوویتە کام گۆڕەوە؟ بۆ جواب نادەیتەوە؟

دڵی یوڵدز داخورپا. یەکەمجار نەیتوانی هیچ بڵێ. پاشان کەمێ هێور بۆوەو گوتی:- لێرەم باجی میزێ دەکەم.

باوەژن چیدی نەگوت و، بەڵاکە بە خێرو سەلامەت تێپەڕی.

(ئیعدامی دایکە قەڵێ)

بەیانی زوو یوڵدز لە خەو هەستا. دایکە قەڵێ کەوتبووە قارە قارو یارمەتی دەویست. وەکو ئەوەبوو بیانەوێ یەکێك بکوژن و هاوار بکات.

یوڵدز خێرا غاری دایە نێو حەوشە. سەیری کرد باوەژن لە ژێر دار تووەکەدا وەستاوە، دایکە قەلێی بە دار تووەکەوە هەڵواسیوە، قەلەکە دەی قیڕاندو باوەژن بە دار لێی دەداو جنێوی دەدا.

دەموچاوی باوەژن زامدار بوو بووو خوێنی لێدەچۆڕا. قەلەکە باڵە فڕەی دەکردو دەی قیڕاند. بە قاچەکانیا هەڵواسرابوو.

یوڵدز بە خۆشی نەیزانی کەی خۆی گەیاندە باوەژن. باوەشی بە قاچەکانیا کردو دەستی بە گاز گرتنیان کرد. باوەژن هاواری کرد. ئا...خ!و یوڵدزی لە خۆی دوور خستەوە. شەپەزللەیەکی توندی لە بنا گوێی قایم کرد، یوڵدز کەوت، سەری کەوت بە بەردێکا، بورایەوەو ئیدی ئاگای لە دنیا نەما.

**( خەونی پەرێشانی یوڵدز )**

یوڵدز دەمەو نیوەڕۆ چاوانی هەڵێنا. چەند کەسێك لە دراوسێکانیان لەوێ بوون. باوەژن بە دیار سەرییەوە رۆنیشتبوو. بە کەوچکان دەرمانی دەکردە دەمی یوڵدزەوە. چاوێکی و نێوچەوانی بە دەستە سرێکی سپی بەستبوو. چاوەکانی یوڵدز رێشکەو پێشکەیان دەکرد ..ئەوجا یەك یەك خەڵکەکەی ناسینەوە. یەشاری بینی کە لە تەنیشت دایکییەوە دانیشتبوو، زەق زەق تەماشای ئەوی دەکرد.

باوەژن کە بینی یوڵدز چاوانی هەڵێنان، بە خۆشییەوە گوتی:– زۆر شوکور! چاوانی کردنەوە. ئیدی نامرێ. یوڵدز!.. قسان بکە!..

یوڵدز، نەیتوانی قسان بکات. سەری بەرەو باوەژن وەرگێڕا. لە پڕ دەنگی قاڕە قاڕی دایکە قەلێ لە هەموو لایەکەوە بەرز بۆوە. یوڵدز وەکو شێتان چنگی نایە قژی باوەژن‌و کەوتە هاوارو فیزاح، بەڵام ژانە سەرێکی وای گرت کە ناچار دەستەکانی هاتنە خوارەوەو دەنگی بڕا. ئەوسا بە دەم هەنسك هەڵدانەوە گوتی:– دایکە قەلێ.. کوا.. کوا؟.. دایکە قەلێ.. کوا؟.. بێچوە قەلەکە چی لێهات.. دایکە!... دایکە!..

یەشار بەر لە هەمووان غاری دایە کنی. هەرکەسەو قسەیەکی دەکردو دەیویست ژیری بکاتەوە، بەڵام یوڵدز بە کوڵ دەگریا. باوەژن دڵسۆزی دەنواند. هێدی هێدی قسانی دەکرد. دەیگوت: – مەگری یوڵدز گیان، دەرمانەکەت بخۆ زوو چاك دەبیتەوە.

ئاخری یوڵدز لە گریان ماندوو بوو و خەوی لێکەوت. لە خەویا دایکە قەلێ بە دارتووەکەوە هەڵواسراوەو خەریکە دەخنکێ. دەڵێت یوڵدز، من رۆییشتم تۆ قسەکانم فەرامۆش مەکە. مەترسە! یوڵدز بەرەو دارتووەکە غاری دا. لە پڕ باوەژن لە پشت دار تووەکەوە هاتە دەرێ، ویستی لەقەی پێدا بماڵێ. یوڵدز قیژاندی‌و بە ترسەوە لە خەو ڕاپەڕی‌و سەلای گریانی بەرز بۆوە. ئەمجارەیان تەنیا بابەو باوەژن لە ژوورەکەدا بوون. دیسان خەوی لێکەوتەوە. پاش تۆزێکی دی هەمان خەونی دیەوە. قیژاندی‌و لە خەو راپەڕی. تاکو شەوێ بەم چەشنە بەردەوام رادەپەڕی و دەخەوتەوە. لە پڕ چاوی هەڵێنا، سەیری کرد شەوە، دکتۆر خەریکە دەرمانی دەکات. پاشان گوێی لێ بوو دکتۆرەکە بە بابی دەڵێ:– زامەکەی گرینگ نییە. زوو چاك

دەبێتەوە، بەڵام منداڵەکە زۆر ترساوە. رادەچڵەکیٰ، لە شتێك ترساوە. هەنووکە شرینقەیەکی لیٰ دەدەم ئارام دەبیٰ و خەوی لیٰ دەکەویٰ.

یوڵدز گوتی:- برسیمە.

باوەژن شیری بۆ هێنا. یوڵدز شیرەکەی خوارد. دکتۆر شرینقەیەکی لێدا، جانتاکەی هەڵگرت و رۆیی.

یوڵدز تەماشای بن میچەکەی دەکردو هیچی نەدەگوت. دەیویست گوێی لە قسەکانی بابەو باوەژن ببیٰ. بەڵام شتێکی وای گویٰ لیٰ نەبوو. زوو خەوی لیٰ کەوت.

**(دەردە دڵی کاکە قەل و**

**چۆنێتی گرفتار بوونی دایکە قەلیٰ)**

سبەی بەیانی، یوڵدز کاکە قەلی بیرکەوتەوە. دەستی لەرزی، چایەکەی بە لێفەکەیدا رشت. باوەژن مۆڕەیەکی کرد، بەڵام هیچی نەگوت. بابە بەسەر پێوە بوو، پانتۆڵەکەی لە پیٰ دەکرد تا بۆ دایەرە بڕوات. یوڵدز دەیویست هەستیٰ و بچیٰ بۆ کن بێچووە قەلەکە. بەڵام کارێکی ئاقڵانە نەبوو. نەیدەزانی کاکە قەل چی بەسەر هاتووە. نەیدەزانی دایە قەلیٰ چۆن گرفتاری دەستی باوەژن بووە، بە تایبەتی بەو بەیانییە. باوەژن دەستەسڕەکەی سەرچاوی کردبۆوە. جێی دەنووکی دایکە قەلیٰ بەسەر بڕۆو نێو چەوانییەوە دیار بوو.

کە بابە رۆیی، باوەژن گوتی:- من دەچمە کن دایکی یەشار، زوو دەگەڕێمەوە. دەمێکە نەچوومەتە حەمام. ئەمجارە ناتوانم تۆ لەگەڵ خۆدا بەرم. دەمەویٰ بزانم دایکی یەشار لەگەڵمدا دیٰ بۆ حەمام.

باوەژن بەڕاستی میهرەبان بوو بوو. قەت بەم جۆرە لەگەڵ یوڵدزا قسەی نەدەکرد، بەڵام یوڵدز نەیدەویست قسان لەگەڵ ئەودا بکات. ڕقی لیٰ بوو. لە پڕ شتێکی بە بیردا هات و گوتی:- باجی، هەنووکە تۆ دەچی بۆ حەمام، بە یەشاریش بڵیٰ بیٰ بۆ ئێرە. بە تەنیا بێتاقەت دەبم.

باوەژن کەمیٰ ڕووی گرژ کردو گوتی:- یەشار دەچیٰ بۆ قوتابخانە

یوڵدز هیچی نەگوت، باوەژن رۆیی. یوڵدز هەستاو چوو بۆ کن کاکە قەل. کاکە قەلی بەستەزمان لە نێو کولانەکەدا کزکۆڵەی کردبوو و دەگریا. هەرکە یوڵدزی بینی، گوتی:- ئۆو، ئاخری هاتیت!

یوڵدز گوتی: بمبوورە کە نەهاتم بە سۆراختەوە.

کاکە قەل گوتی:- ئێستا شتێکم بۆ بێنە تا بیخۆم. دوایی قسان دەکەین. زۆرم برسییە، زۆرم تینووە.

یوڵدز رۆیی و ئاوو خواردنی هێنا. کاکە قەل چەند پارووییەکی خواردو گوتی:- من پێم وابوو تۆش بە دوای دایکمدا رۆیشتوویت.

یوڵدز گوتی:- دایکت کێوە چووە؟

کاکە قەل گوتی:- بۆ هیچ شوێنیٰ، باوەژنەکەت ئەوەندەی لێدا تا مرد، پاشان فڕێی دایە سەر زبڵدانێك.

یوڵدز جڵەوی گریانەکەی خۆی گرت و گوتی:– چ ئاخرو ئاقیبەتێ! هەنووکە کسۆکان پارچە پارچەیان کردووەو خواردوویانە.

کاکە قەل گوتی:– مەحاڵە، ئاخر ئێمەی قەلان گۆشتمان تاڵە. کسۆکان ناوێرن توخنمان بکەون. جەستەی ئێمە هەر بە دەقی خۆیەوە دەمێنێتەوە تا دەڕزێ و پەرت و بڵاودەبێتەوە. هەنووکە دایکم لەسەر زبڵدانێ یا لە شوێنێکی دیدا کەوتووەو خەریکە دەگەنێ و دەڕزێ.

یوڵدز جڵەوی خۆی پێنەگیراو لە سەڵای گریانی دا. کاکە قەلیش گریا. ئەنجام یوڵدز گوتی: – هەنووکە باوەژن دێتەوەو دەمان بینێ، من دەڕۆم. پاش ئەوە باوەژن ڕۆیی بۆ حەمام، دێمەوە بۆ لات.

ئەوجا دەرکی کولانەکەی داخست، چوو خۆی خستە ژێر لێفەکەیەوەو ڕاکشا. باوەژن هاتەوە بوخچەکەی هەڵگرت و ڕۆیی. یوڵدز بە خەیاڵی ئاسوودەوە هاتە کن کاکە قەل. هەتاو تەواو بەرز بوو بۆوە. کاکە قەلی هێنایە دەرێ. دەرکی کولانەکەی بە وازی جێهێشت تا هەتاو بچێتە ناوییەوە.

کاکە قەل بای باڵی خۆیدا، دەنووکی بە عاردیدا خشاندو گوتی:– بەڕاستی یوڵدز گیان، ئازادی شتێکی چاکە.

یوڵدز هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:– تۆ زانیت دایکە قەلێ بەو بەیانی زووە بۆچی هاتبوو؟

کاکە قەلێ گوتی:– بەڵێ.

یوڵدز گوتی:– دەتوانی بە منیش بڵێی؟

کاکە قەل گوتی:– ڕاستییەکەی هاتبوو تا من بەرێ و فێر فڕینم بکات. لەگەڵ هەتاو کەوتندا هاتە کن من گوتی:– ئەمڕۆ ڕۆژی فڕینە.براو خوشکەکانت دەبەم فێرە فڕینیان دەکەم. تۆش دەبێ بێی پاشان دەتگەڕێنمەوە. من بە دایکم گوت:– ئەدی یوڵدز؟ ئاگاداری ناکەیتەوە؟

دایکم گوتی:– خەبەری دەدەمێ، دایکم دەرکی کولانەکەی گرت، هات تۆ خەبەر بکاتەوە، تۆ هەر نەهاتیتە دەرێ. من لە کولانەکەمدا بووم. لە پڕ گوێم لە دەنگی بگرەو بەردە بوو.

دایکم قیژاندی: "قاڕ!... قاڕ!..." دڵم داخورپا. دایکم دەیگوت:– "چما ئێمە لەم شارەدا هەقی ژیانمان نییە؟. بۆ نابێ بە ئاشکرا خۆشەویستی خۆمان بۆ دۆستان دەربڕین؟

لە کونی دەرگاکەوە سەیرم کرد. بینیم باوەژنت دایکمی خستۆتە ژێر بێژنگێکەوە. دیار بوو لە قسەکانی دایکم نەدەگەیی.

یوڵدز بێتاقەت بوو بوو. خێرا پرسی:– پاشان چی بوو؟

کاکە قەل گوتی:– پاشان دایکمی بە پەت بەستەوەو بە دارتووەکەوە هەڵیواسی. دایکم لە پڕ ڕاپەڕی و بە دەنووک بەر بووە دەموچاوی باوژن و برینداری کرد. ئەوجا باوەژن دەهری بوو، بە گۆپاڵ کەوتە وێزەی دایکم.

یوڵدز گوتی:– دایکە قەلێ چ قسەیەکی دی نەکرد؟

کاکە قەل گوتی:- با، ئەی باوەژنی نەزان، تۆ پێت وایە قەلان حەزیان لە دزییە؟ ئەگەر تێرە خۆری و خۆم و بێچووەکانم خواردن و خۆراکم هەبێ چما گلاراومە دزی بکەم؟... خۆتان تێرن و پێتان وایە هەموو کەس وەکو ئێوەیە!...

کاکە قەل بێدەنگ بوو. یوڵدز لە گریان کەوت و پرسی:- ئەدی ئیتر؟

کاکە قەل گوتی:- ئیتر تۆ بە تۆی کراسێك هاتیتە دەرێ... باقییەکەی بە خۆت دەیزانی.

هەردووکیان ماوەیەك بێدەنگ بوون. یوڵدز گوتی:- ئیدی دایکە قەلێ رۆیی و تەواو بوو! هەنووکە چ بکەین؟

کاکە قەل گوتی:- من دەبێ فێری فڕین ببم.

یوڵدز گوتی:- راستە. منیش هەر لە بیری ئەوەدام.

کاکە قەل گوتی:- بریا بابم، براکانم، خوشکەکانم. داپیرەم دەیانزانی لە کوێن.

یوڵدز گوتی:- بەڵێ، یارمەتیان دەداین.

کاکە قەل گوتی:- بیرتە دایکم دەیگوت ئەگەر تا چەند رۆژی تر فێری فڕین نەبم دەمرم؟

یوڵدز گوتی:- لە بیرمە.

یوڵدز بە قامکەکانی کەوتە حیسابکردن و گوتی:- تەنیا شەش رۆژمان ماوە هەیە.

کاکە قەل گوتی:- بە رای تۆ دەبێ چبکەین.

یوڵدز گوتی:- دەتەوێ بتدەمە دەستی یەشار، بتبا بۆ دەشت و فێرە فڕینت بکات؟

کاکە قەل گوتی- یەشار کێیە؟

یوڵدز گوتی:- ئەم دراوسێیەی دەستە چەپمانە.

کاکە قەل گوتی:- ئەگەر کوڕێکی باش بێ من قایلم.

یوڵدز گوتی:- بۆ چاکی، کوڕێکی چاکە، سڕ قایمیشە، بەڵام چۆن خەبەری بدەینێ؟

کاکە قەل گوتی:- هەر ئێستا بچۆ سەربان، پێی بڵێ بێت بمبات.

یوڵدز گوتی:- ئێستا نابێ، چووە بۆ قوتابخانە.

کاکە قەل گوتی:- قوتابخانە؟ ئەوە چەند رۆژە تەعتیڵی هاوینە.

یوڵدز گوتی:- خۆ راست دەکەیت. باوەژن هەڵی خەڵەتاندوم. ئێستا قوتابخانەکان تەعتیڵن. من دەچمە سەربان، تۆ لێرە چاوەڕوان بە.

لەسەر پیلیکانەی دووەم بوو کە لە کۆڵانەوە دەنگی پێ هات. یوڵدز خێرا بێچووە قەلەکەی خستە کولانەکەوەو دەرکەی لێداخست، چووە ژوورەوە، خۆی کردە ژێر لێفەکەداو چاوی بڕییە ناو حەوشە.

**( ماڵ داخرا )**

دەنکی حەپە حەپی کسۆکێك هات. لە دەرگا درا. بابە هاتە ژوورەوە. ئەوجا هاپۆ، برا بچووکەکەی بابە وەژوورکەوت. کسۆکێکی ڕەشیش لە دوو وانەوە وەژوورکەوت. سەری رستی سەگەکە بە دەست هاپۆوە بوو.

بابە گوتی:- ئیدی هیچ قەلەڕەشێك ناتوانێ پێ بخاتە ئێرە.

هاپۆ گوتی:– کە زستان هات، دەیبەمەوە.

بابە گ تی:– قەیدی نییە، ئێمە زستان پێویستیمان بە کسۆك نییە.

هاپۆ گوتی:– ئەدی یوڵدز لە کوێیە؟ لەگەڵ براژنمدا ڕۆییوە؟

بابە گوتی:– نەء ، نەخۆشە، خەوتووە.

ڕستی سەگەکەیان بە دار تووەکەوە بەستو هاتنە ژوورەوە. یوڵدز مامی خۆشدەویست. بە تایبەتی لەبەر ئەوەی لە گوندەکەی دایکی ئەوەوە دەهات.

هاپۆ ئەحواڵی یوڵدزی پرسی، بەڵام هیچی دەربارەی دایکی نەگوت. بابە حەزی نەدەکرد لەلای ئەو باسی ژنی یەکەمی بکەن. هاپۆ بە بابەی گوت:– ناگەڕێیتەوە بۆ دایەرە؟

بابە گوتی:– نەء ، مۆڵەتم وەرگرتووە. کاتیش درەنگە.

پاش ئەوەی دیسان قسەو باس هاتەوە سەر سەگەکەو قەلەڕەشەکان، بابە لێکدا لێکدا جوێنی بە قەلان دەدا. بۆ نموونە دەیگوت:– قەلەڕەش دزی چەپەڵ و ترسنۆکن. دێن دزی دەکەن، بەڵام هەر کە یەکێك دەبینن بۆ بەردێ، شتێ دادەنەوێتەوە، خێرا هەڵدەفڕن و دەڕۆن.

سەعاتێك پاش نیوەڕۆ، باوەژن هاتەوە، سەگەکە هەوەڵجار وەڕی، بەڵام هەرکە هاپۆ لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێناو تێی خوڕی، کڕبوو.

باوەژن ڕووی لە هاپۆ دەشاردەوە. هاپۆش لە ئاستی ئەودا سەری دادەخستو کەمو زۆر سەیری سەروچاوی براژنی نەدەکرد.

یوڵدز کش و مات ڕۆنیشتبوو. چاوی بڕی بووە هاپۆ ، لە پڕ گوتی:– هاپۆ، ناتوانی سەگەکەت لەگەڵ خۆتدا بەریتەوە؟

بابە ڕاچڵەکی. هاپۆ ئاوڕی لە یوڵدز دایەوەو پرسی:– بۆ بیبەمەوە؟

زمانی یوڵدز کەوتە تەتەڵە. نەیدەزانی چ بڵێ. ئاخرییەکەی گوتی:– من.... من دەترسم.

بابە گوتی:– بی بیرەوە چەتیو. نازمان بەسەردا مەکە.

هاپۆ گوتی:– مەترسە گیانەکەم. سەگێکی باشە. پێی دەڵێم نەتگرێ.

بابە گوتی:– وازی لێبێنە! قسەی کەس ناچێتە گوێیەوە. خۆی لە سەگ خراتر هەموومان دەگرێ. هەر لە خوتو خۆڕایی لایەنی قەلانی دەڵە دز دەگرێ. کەس نازانێ چ چاکییەکی لەم حەیوانە چەپەڵانە دیتوە.

یوڵدز چیدی نەگوت. لێفەکەی دا بەسەر خۆیداو خەوت. کاتێ بێدار بۆوە سەیری کرد هاپۆ لێی داوەو ڕۆییوە، سەگەکە لە حەوشەدا دەوەڕێ و قەلەڕەشەکان دەتارێنێ.

لەو ڕۆژە بە دواوە ماڵەکە مەنع بوو. هیچ قەلەڕەشێك نەیدەتوانی بێتە خوارەوە. تەنانەت یوڵدزیش بە ترس و لەرزەوە دەچووە نێو حەوشە. جارێکیان پارچە گۆشتێکی مەڕی بۆ کاکە قەل دەبرد، سەگە ڕەش پڕی پێدا کردو لە دەستی ستان. یوڵدز قیژاندی و غاری دایە ژوورەوە.

**( ڕۆژانی پەرێشانیو نیگەرانی**

**برسێتیو ترس )**

یوڵدز لە جێ هەستا. زامی نێو چەوانی باوەژن زوو چاك بۆوە. بەڵام زامەکەی سەری یوڵدز زۆری درێژە کێشا تا ساڕێژ بۆوە. رەفتاری باوەژن دووبارە گۆڕابوو. لە جاران خراتر هاواری بەسەر یوڵدزا دەکرد. جێی ددانەکانی یوڵدز لەسەر رانی خەتم بوو بوو.

حاڵی کاکە قەل یەکجار خرا بوو بوو. هەمیشە برسێتی دەکێشا. یوڵدز هەرچەندی دەکردو دەکۆشا نەیدەتوانی لە کاتی خۆیدا خواردنو ئاوی بداتێ. سەگەڕەش چوار چاو هەموو لایەکی دابووە بەر نیگا. بە گشت دەنگێکی نا ئاشنا دەوەڕی . تاقە ئومێدی یوڵدزو بێچوە قەلەکە، یەشار بوو. ئەگەر یەشار فریایان کەوتبا، کارەکان دروست دەبوون، بەڵام نەیان دەزانی چۆن خەبەری بدەنێ. یوڵدز لە ترسی سەگەکە نەدەچووە سەربان یانی نەیدەتوانی بڕوات. سەگەڕەش بواری نەدەدا. دەیکرد بە هەرا. لەوەبوو بیگرێ. هەمیشە بە نێو حەوشەدا دەسوڕایەوەو بۆنی دەکرد.

دایکی یەشار جار جارێ دەهات بۆ ماڵی ئەوان. بەڵام نەدەکرا چ قسەیەکی لەلا بگوترێ. بە چییا مەعلومە کە ئەویش دەستە راستی باوەژن نەبێ؟ ناکرێ زوو بە زوو متمانە بە بنیادەمی ئەو دەوروزەمانە بکرێ. خۆ باوەژنیش قەت ئەوی بە تەنیا لەگەڵ کەسێکدا بە جێ نەدەهێشت.

ڕۆژان تێپەڕین، ٥ رۆژ بە پەرێشانیو نیگەرانی تێپەڕین، تاقە یەك رۆژ دەرفەتیان مابوو. یوڵدز دەیزانی کە دەبێ لەم رۆژەدا بێچوە قەلەکە هەڵفڕێنێ. دەنا دەمرێ. بەڵام چۆنی هەڵفڕێنێ؟ نەیدەزانی.

ئەنجام دەرفەتێك رەخساو توانی یەشار ببینێ. هەمان رۆژ باوەژن دەیویست بچێتە زەماوەند.

یوڵدز گوتی:– باجی، من لە سەگەکە دەترسم، ناتوانم بە تەنیا لە ماڵەوە بم.

باوەژن رووی گرژ کرد، دەستی یوڵدزی گرتو بردییە کن دایکی یەشار. یوڵدز لە کانگای دڵەوە شاد بوو. یەشاری لە ماڵەوە نەبینی. لە دایکی پرسی:– ئەدی یەشار لە کوێیە؟

دایکی یەشار گوتی:– چووەتە قوتابخانە گیانەکەم. ئاخر لە دوێنێوە قوتابخانە کراوەتەوە.

یوڵدز دانیشتو چاوەڕوانی یەشار بوو.

## ( نەخشەیەك بۆ ئازاد کردنی کاکە قەل )

بوو بە نیوەڕۆ، یەشار بەغار هاتەوە. هەرکە یوڵدزی بینی سوور هەڵگەڕاو سڵاوی کرد. یوڵدز سڵاوەکەی سەندەوە. یەشار خوشکێکی شیرە خۆڕەشی هەبوو. دایکی ئەوی شیردەدا تا بنوێ.

یوڵدزو یەشار چوونە نێو حەوشە.

یوڵدز هێدیو خەمگین گوتی:– یەشار دەزانی چی بووە؟

یەشار گوتی: نەء.

یوڵدز گوتی:– کاکە قەل خەریکە دەمرێ؟

یەشار گوتی:– کام کاکە قەل؟

یوڵدز گوتی:– کاکە قەلی من؟

یەشار گوتی:– چما تۆ قەلەڕەشیشت هەیە؟

یوڵدز گوتی:– بەڵێ هەمە. هەنووکە چی بکەین؟

یەشار پرسی:– لە کوێت بوو؟

یوڵدز گوتی:– دوایی پێت دەڵێم. هەنووکە تۆ دەڵێی چ بکەین؟

یەشار گوتی:– لە برساندا دەمرێ؟

یوڵدز گوتی:– نەء. .

یەشار گوتی:– بریندار بووە؟

یوڵدز گوتی:– نەء .

یەشار گوتی: –ئەدی بۆ دەمرێ؟

یوڵدز گوتی:– ناتوانێ بفڕێ. قەلەڕەش گەر نەتوانێ بفڕێ، بێگومان دەمرێ.

یەشار گوتی:– بیدە من فێرە فڕینی بکەم.

یوڵدز گوتی: – لە ژێر قاڵدرمەکاندا شاردومەتەوە.

یەشار گوتی:– باوەژنەکەت دەزانێ؟

یوڵدز گوتی:– ئەگەر بزانێت دەیکوژێت؟

یەشار گوتی:– دەبێ فێڵێ بدۆزینەوە.

یوڵدز گوتی:– دەبێ یەکەمجار تەکبیرێکی سەگەکە بکەین. دەنگی ناژنەوی؟

یەشار گوتی:– با سەگەکە نایەڵێ کاکە قەل دەربێنین. یەك ، دوو ڕۆژ مۆڵەت بدە با بیرێ بکەمەوە. نەخشەیەك بکێشم.

یوڵدز گوتی:– مۆڵەتمان نییە. دەبێ هەر ئەوڕۆکە بێچووە قەلەکە دەربێنین ئەگینا دەمرێ. دایکە قەلێ بە خۆمی گوت.

یەشار هەڵچوو بوو. هەستی دەکرد کۆمەڵێك کاری فرە گرینگ لە ئارادایە. بە پەلە پرسی: – دایکە قەلێ کێیە؟

یوڵدز گوتی:– دایکی کاکە قەلە. دوایی ئەمانەت بۆ باسدەکەم. هەنووکە دەبێ کارێکی وا بکەین کە کاکە قەل نەمرێ.

یەشار گوتی:– دوای نیوەڕۆ من ناچم بۆ قوتابخانە. بە دزییەوە دەچین و کاکە قەل دەردێنین.

نیوەڕۆ، نان و پەنیرو سەوزەیان خوارد، پاش فراڤین بابی یەشار چۆوە بۆ سەر کار. دایکی لەگەڵ منداڵە شیرە خۆرەکەیدا نووست.

یەشار گوتی:– من و یوڵدز نانووین. من دەبێ فریای دەرس و مەشقەکانم بکەوم.

یەشار جار جارێ لەم وردە درۆییانەی دەکرد تا دایکی بە تەنیا بەجێی بێڵێ.

## ( کوشتن لە پێناوی ئازادکردنی کاکە قەل لە زیندان )

پاش تۆزێك دوو بە دوو هاتنە دەرێ. لە قاڵدرمەکانەوە سەرکەوتنە سەربان. تەماشایەکی ئەولاو ئەولای خۆیان کرد. سەیریان کرد سەگە ڕەشیان بەرەڵا کردووە، هاتووە لەبەر دەرکی کولانەکەی کاکە قەلدا ڕاکشاوەو خەوتووە.

یەشار گوتی:- من دەچمە خوارێ. قەلەکە دێنم.

یۆڵدز گوتی:- ئەدی نابینی سەگەکە لەبەر کولانەکەی خەوتووە؟

یەشار گوتی:- ڕاست دەکەی. بەلەنگاز قەلە، ئاخۆ چ حاڵێکی هەیە؟

یۆڵدزگوتی:- پێم وا نییە زۆر بترسێت. قەلێکی ئازایە.

یەشار گوتی:- هەنووکە چ بکەین.

یۆڵدز گوتی:- بیر بکەینەوە، چارەیەك بدۆزینەوە.

یەشار گوتی:- هەر ئێستا بیرێ دەکەمەوەو نەخشەیەك دەکێشم.

کوپەڵە سرکەکەی باوەژن لە سوچێکی سەربانەکە دانرابوو. باوەژن بەردی لە دەوری کوپەڵەکە هەڵچنی بوو... تا نەکەوێ.

یەشار چاوی بە بەردەکان کەوت، لە پڕ گوتی:- وەرە سەگەکە بکوژین.

یولدز ڕاچڵەکی و گوتی:- بیکوژین؟

یەشار گوتی:- بەڵێ، ئەگەر بیکوژین بۆ هەمیشە لە دەستی ڕزگار دەبیت.

یەشار گوتی:- من دەترسم.

یەشار گوتی:- من دەیکوژم.

یۆڵدز گوتی:- گوناح نییە؟

یەشار گوتی:- گوناح؟ نازانم، من نازانم گوناح چییە، بەڵام پێدەچێ چ ڕێیەکی دیمان نەبێ. خۆ خراپە دەرهەق بە کەس ناکەین تا گوناح بێ.

یۆڵدز گوتی:- سەگەکە هی مامە.

یەشار گوتی:- با هی ئەویش بێ. مامت بۆ سەگەکەی هێناوەو لێرە بەستویەتێوە تا تۆ بترسێنێت و بێچووە قەلەکە حەپس بکات، ها؟

یولدز چ وەڵامێکی پێ نەبوو. یەشار هێدی هێدی چوو بەردێکی گەورەی هەڵگرت و هێنای بە یولدزی گوت:- کەس لەماڵەوەیە؟

یولدز گوتی:- باجیم چووە بۆ شایی. نازانم بابە. من دڵم بە حاڵی سەگەکە دەسووتێ.

یەشار گوتی:- پێت وایە من حەز لە سەگ کوژی دەکەم؟ چ ڕێیەکی دیمان نییە.

ئەوجا پلەیەك چووە خوارەوە، گەییە ئاستی سەگەکە، بەردەکەی هەڵبڕی و دای هێنایەوەو بەری دا. بەردەکە کەوت بە سگەکەدا.سەگەکە بە ئاستەم قوڕاندی کەوتە لەقە فرتێ. لە پڕ دەنگی بابی یولدز هات. ئەمان هاتنە دواوە. بابە هاتە دەرێ، سەیری کرد سەگەکە گیان دەدا.

یەشار بە گوێی یولدزیا چپاند. وەرە با بڕۆین، هەنووکە بابت بەردەکە دەبینێ و دێتە سەربان.

یولدز گوتی:- واز لە بێچووە قەلەکە بێنین؟

یەشار گوتی:- پاشان من دێم بە سۆراخییەوە.

هەردووکیان بە هێواشی هاتنە خوارەوەو چوون لە ژوورەوە دانیشتن. کتێبەکانی یەشاریان خستە بەردەمی خۆیان، بە جۆرێ هەر کەسێك بیدیتبان وای دەزانی خەریکی دەرس ئامادەکردنن.

بەڵام دڵیان توند توند لێی دەدا. کەمێ ڕەنگیان هەڵبزڕکا بوو. لەسەر بانەوە دەنگی پێی بابە هات. پاشان دەنگەکە نەما.

یەشار بە تەنێ چووە سەربان، بابی یوڵدز خۆی لەبەر کردبوو، لە کەنار کەلاکی سەگەکەدا وەستا بوو. پاشان ڕۆیی بۆ کۆڵان.

یەشار بیری کەوتەوە کە ڕۆژێ بەردی هاویشتبوو، شوشەی پەنجەرەکەی ماڵی یوڵدزی شکاندبوو، بابی یوڵدز وەکو هەنووکە چوو بووە کۆڵان. حەس حەسی هێنا بوو و کردبووی بە هەرا.

بەدەم ئەم بیرانەوە بەپەلە چووە خوارەوە. یەکەمجار کاکە قەلی دەرهێناو گوتی:- من یەشارم. سەگەکەمان کوشت تا تۆ ڕزگار ببی.

کاکە قەل گوتی:- زۆر سوپاس، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە.

یەشار گوتی:- بۆ؟

کاکە قەل گوتی:- قەراری دایکم تا ئەم نیوەڕۆیە بوو. جگە لەوەش ئەوەندەم برسێتی کێشاوە کە توانای هەڵفڕینم نییە.

یەشار خەم دایگرت. کەمی مابوو بگری: گوتی:- هەنووکە نایەی من فێرە فڕینت بکەم؟

کاکە قەل گوتی:- پێم گوتیت تازە کار لە کار ترازاوەو بێ سوودە. بە یوڵدز بڵێ چەند پەڕێکم لێ هەڵکەنێ و لای خۆی هەڵیگرێ. ئەنجام هەر چۆنێ بووە قەلان بە سۆراخی من و ئێوەوە دێن.

کاکە قەل ئەمەی گوت. دەنووکی دا بە یەکاو لەشی سارد بۆوە. یەشار گریا. لەپڕ بیرێکی بە مێشکدا هات. چاوەکانی بریسکایەوە بزەیەکی کردو لاشەی بێچوە قەلەکەی لەسەر قاڵدرمەکە دانا. بەردەکەی هەڵگرت و بردی لە ناوەندی ئاشخانەکەدا داینا. کەلاکی سەگەکەی لەژێر دار تووەکەدا دانا. سەتڵێ ئاوی هێنا. خوێنی سەر پلەکان و بەر کۆڵانەکەی شۆرد، سەتڵەکەی بە دەموقڵپی لە ناوەندی ژوورەکەدا دانا. ئەوسا لاشەی قەلەکەی هەڵگرت و هەڵهات. لە سەربان بیری کەوتەوە کە نابێ شوێن پێ لە پاش خۆیەوە بەجێ بهێڵێ. ئەمەشی کرد.

یوڵدز زۆر خەمبار بوو. گریا، بەڵام ئیدی کارێ بووو ڕووی دابووو چ دەسەلاتێك نەبوو. یەشار دڵی دایەوە و گوتی:- ئەگەر دەتەوێ کارەکە خراتر نەبێ، دەبێ دەنگت دەرنەچێ، کەس هەست نەکات، بەڵایەکیان بەسەر بێ چۆنت بوێ. ئەمڕۆ شتێك لە مامۆستاکەوە فێر بووم و دەمەوێ بابە و باوەژن ئەوەندە بترسێنم کە تەنانەت لە سێبەری خۆشیان بڕەوێنەوە.

ئەوجا هەر چییەك کە کاکە قەل گوتبووی و هەرچییەك کە خۆی کردبووی بۆ یوڵدزی گێڕایەوە. یوڵدز کەمێ هێور بۆوە. چەند پەڕێکی لە کاکە قەل هەڵکەند و خستییە گیرفانی. یەشار لاشەی قەلەکەی برد لە شوێنێکا وەیشێرێ تا دوایی بینێژێ.

دایکی یەشار، منداڵەکەی لە باوەش کردبووو خەوتبوو.

**( منداڵانی ئاقڵ**

**باب و دایکانی نەزان هەڵدەخەڵەتێنن )**

منداڵەکان بە دەم چاوەنوارپییەوە ڕۆنیشتبوون. لە پڕ دەنگە دەنگ بەرزبۆوە. بابی یوڵدز هاواری دەکرد. دەنگی تریش هەبوون. دایکی یەشار لە خەو ڕابووو غاری دایە نێو حەوشە. پاشان گەڕایەوە، عەباکەی بە سەریداو چووە سەربان. بابی یوڵدز وەکو شێتی لێ هاتبوو. لێکدا لێکدا بەسەری خۆیدا دەداو هاواری کرد:– وای، وای!.. ماڵ وێران بووم!.. "جنییان" بە ماڵەکەم فێربوون!.. من ناتوانم چیدی لێرە وەمێنم!.. "جنییان" بە ماڵەکەم فێر بوون!.. فریام کەون!..

ئینزیبات و چەند پیاوێکی دی دەوریان گرتبوو. دەیانویست هێوری بکەنەوە. بابی یوڵدز کەلاکی سەگەکەی نیشان دەدان و هاواری دەکرد: تەماشا بکەن، کێ ئەمەی هێناوەتە ئێرە؟.. کێ بەردەکەی بردووە؟.. کێ خوێنی سەر پلەکانی شۆردووە؟.. "جنییان" بە ماڵەکەم فێربوون!.. هەوەڵجار هاتن سەگەکەیان کوشت.. پاشان.. وای!.. وای!..

یوڵدزو یەشار لە پاڵ قاڵدرمەکەدا وەستابوون و گوێیان دەگرت. دایکی یەشار نەیدەهێشت بچنە سەربان. چاویان لە یەکدی دادەگرت و لەدڵی خۆیاندا بە نەزانی بابەو ئەوانی دی پێدەکەنین. خۆشحاڵ بوون بەوەی کە ئەم هەموو بنیادەمە خۆشباوەڕەیان هەڵخەتاندووە.

بە ڕاکێش ڕاکێش بابەیان بردە ژوورەوە. بەڵام لە پڕ هاواری ترس لە هەموویان هەستا. وای پەنا بەخوا!.. جنییان!..

بابە دیسان غاری دایە نێو حەوشەو وەکو شێت دەستی بە هاوار کرد. حەجمانی لێ بڕا، لێرەوە بۆ ئەوی، لەوێوە بۆ ئێرە دەهات و دەچوو. سەتڵە دەموقڵێپەکە هەموویانی ترساند بوو.

پیرەمێردێك گوتی:– "جنییان" بە ماڵەکە فێربوون. ماڵەکە بگەڕێن، با یەکێك بچێ بە شوێن جنگردا. یەکێك بچێ بە دوای نوشتە نووسدا. بابە هاواری کرد:– فریامکەون!.. ماڵم وێران بوو!..

یەکێك چوو بە شوێن سەید قولی جنگردا. یەکێکی دی چوو بە دوو "سەید میرزای دوعا نووس" دا. پیرێژنێك بە پەلەچوو لە ماڵەوە "بسم الله"ێکی هێنا تا جنۆکان بتارێنێ. "بسم الله" کە بە خەتێکی تێکەڵ و پێکەڵی درشت نووسرابووو خرابووە چوار چێوەیەکی کۆنەوە. دوو پیاو چوار چێوەکەیان بە دەستەوە گرت و بە دەم بیسم اللە کردنەوە کەوتنە گەڕان بە پەناو پاسارەکاندا.

لە پڕ لە ناوەندی ئاشخانەکەدا چاویان بە بەردێکی گەورەی خوێناوی کەوت . بە ترسەوە بەردەکەیان هەڵگرت و هێنایانە ناو حەوشە.. بابە هەرکە بەردەکەی بینی دیسان هاواری لێ هەستا، وای، وای!.. ئەم بەردە لەوێ چی دەکرد؟.. کێ بردویەتی و لە وێی داناوە؟.. "جنییان" بەمنەوە گرتوویانە... دەیانەوێ ئەزیەتم بدەن.. وای!.. ئاخر من چ گوناحێکم کردووە؟

یوڵدزو یەشار لە پەنای دیوارەکەدا وەستابوون. کە گوێیان لەم قسانە بوو، پێکەنین گرتیانی و دەم و دەست خۆیان خزاندە ژوورەوە تا خەڵکەکەی سەربان نەیان بینێ.

یەشار گوتی:– با باوەڕ بێتەوە بزانە چ هەشێك بەسەر خۆیدا دەکات. شایی لێ دەبێ بە ژەهری مار.

ئەوسا دوو بە دوو لە ناخی دڵەوە پێکەنین. یەشار دەستی خستە سەردەمی یوڵدز تا کەس دەنگی نەژنەوێ .

مەعلوم نەبوو کێ باوەژنی ئاگادار کردبۆوە کە بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵەوە. هەرکە چاوی بە مێردەکەی کەوت، بورایەوەو لە ناوەندی حەوشەکەدا کەوت. ژنان راکێش راکێش بردیان بۆ ماڵی دراوسێکەی دەستە راستیان.

پیرێژن دەیگوت:– دەبێ هەوەڵجار جنگرو دوعا نووس بێن و جنۆکەکان دەربکەن، ئەوجا ژنی حامیلە بچێتە ژوورەوە.

خولاسە. سەرتان نەیەشێنم، پاش نیو سەعات جنگرو دوعانووس هاتن. جنگر تەشتێکی دەموقلپی لەبەردەم خۆی دانا، کۆمەڵێ قسانی عەجیب و غەریبی وت، داوای ئاوێنەی کرد. دەنگی عەجیب و غەریبی لە خۆی و لە ژێر تەشتەکەوە دەرپەڕاند و ئەنجام گوتی:– ئەی "جنۆکان" بەشای "جنییان" سوێندتان دەدەم، لە ماڵی ئەم پیاوە موسڵمانە دوورکەونەوە، ئەزیەتی مەدەن! ئەوجا گوێ قولاغ چاوی بڕییە ئاوێنەکەو بە بابی یوڵدزی گوت:– ئەمڕۆ سفتاحیان نەکردووە، پەنجا تمەن بدە با بەڕێیان بکەم.

بابی یوڵدز پاش سەودایەکی زۆر سی تمەنی دایێ. جنگرەکە پارەکەی وەرگرت، دەستی خستە ژێر تەشتەکەو دەری هێنایەوە.

ئەوسا دووبارە گوتی:– ئەی "جنییان" لە ماڵی ئەم پیاوە موسڵمانە دوور بکەونەوە، ئەزیەتی مەدەن! بەشای "جنییان" سوێندتان دەدەم!.

دوای تۆزێك، هەستایە سەر پێ و بە پێکەنینەوە بە بابی یوڵدزی گوت:– خۆت و بەختت وازیان لێ هێنایت و زوو ڕۆیشتن. چیدی ناگەڕێنەوە، بە مەرجێ من رازی بکەیت.

بابە هەناسەیەکی ڕەحەتی هەڵکێشا، سی تمەنی دی دایە جنگرەکەو بە رێی کرد. نۆرە هاتە سەر دوعانووس. بە خەتێکی خوارو خێچ، بە مەرەکەبی ڕەش و نارنجی هەندێ شتی نووسی، هەر پارچە کاغەزێکی لە سووچێکا قایم کرد، بیست تمەنی وەرگرت و رۆیی.

باوەژنیان هێنایەوە.

کەس نەیدەزانی کە ئینزیباتەکە رۆییوە.

شەوێ، دایکی یەشار، یوڵدزی بردەوە. بابەو باوەژن ئەوەندە پەشۆکا بوون تا ئەو کاتە یوڵدزیان بیر نەکەوتبۆوە.

(بەفر، سەرما، بێکاری و چاوەڕوانی)

پایز هات، بەفرو سەرمای لەگەڵ خۆدا هێنا. ئەوجا بوو بە زستان، بەفرو سەرما لە ئەندازە دەرچوو. هاپۆی یوڵدز بە سۆراخی سەگەکەیەوە هات. بە دەستی بە تاڵ و توڕەییەوە گەڕایەوە. لەسەر سەگەکە لەگەڵ بابەدا بەشەڕ هات.

ترسی باوەژن هێشتا نەڕەوی بۆوە. دەرو دیواری ئاشخانەکە پڕ بوو لە دوعاو نامەی دەست خەت و چاپکراو. شەوان دەترسا بە تەنێ بچێتە دەرێ. یوڵدزی دەگەڵ خۆی دەبرد. یوڵدز کەم و

زۆر ترسی نەبوو. بە تەنێ دەچووە دەرێ‌و لە دڵی خۆیدا بە باوەژن پێدەکەنی. پەڕی قەلەکەی لە نێو قاوغی رادێوکە شاردبووەوە .

زۆر کەم یەشاری دەبینی. یەشار جەستەی قەلەکەی لە شوێنێکی چاکدا تاقەت کردبوو. بەردەوام دەچوو بۆ قوتابخانەو دەرسی دەخوێند. بەڵام جار جارێ لەسەر قەڵەم ون کردن لەگەڵ دایکیا شەڕی دەکرد. یەشار بە زۆری قەڵەمەکەی ون دەکردو دایکی توڕە دەبوو و دەیگوت:– تۆ هەر بە خەیاڵتدا نایەت کە بات بە هەزار کوێرەوەری پارەی ئەم قەڵەمانە پەیدا دەکات.

سکی باوەژن تەواو بەرز بۆوە. ژنانی دراوسێ پێیان دەگوت: یەك،دوو هەفتەی دی نەجاتت دەبێ.

باوەژن وەڵامی دەدانەوە:– لەوەیە زووتر.

ژنانی دراوسێ دەیانگوت:– ئیشاڵڵا ئەمجارە بۆت دەمێنێ.

باوەژن دەیگوت:– گەر نەزرو نیاز بکەم هەڵبەت بۆم دەمێنێ.

بابی یەشار بە زۆری بێکار بوو. نەدەچووە عەمەلەی بازاڕ. ئەوەندە بەفر دەکەوت کە بەیانیان هەڵدەستایت دەتبینی بەفر تا نیوەی پەنجەران هاتووە. کزەی سەرما چۆلەکەی رەق دەکردەوەو وەکو گەڵای خەزان هەڵیدەوەراند.

بەیانییەکی زوو بابە سەیری کرد دوو قەلەڕەش لەسەر سووانەکە نیشتوونەتەوە. پەلارێکی تێ سرەواندن‌و هەردووکیانی خست.

بەڵام کە دەستی لێدان بۆی دەرکەوت کە لە سەرماندا ڕەق بوونەتەوە.

یوڵدز زۆر پەست بوو. یەشار دوای چەند رۆژێك ئەم خەبەرەی لە دایکییەوە بیست، لەبەر خۆیەوە گوتی:– ناشێت بە دوای کاکە قەلدا هاتبن! بەستە زمانانە!

دایکی یەشار هەموو بەیانییەك دەهات کە یارمەتی باوەژن بدات. ئامانەکانی بۆ دەشت. ماڵەکەی بۆ خاوێن دەکردەوە. دەوروبەری نێوەڕۆ دەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان، کارەکەری رۆژ بوو.

یوڵدز ئەوی خۆشدەویست. ژنێکی چاك دیار بوو. ئەو کاتانەی باوەژن دەڕۆیی، یوڵدز دەیتوانی چەند قسەیەکی لەگەڵدا بکات، ئەحواڵی یەشاری لێ بپرسێ‌و سڵاوی بۆ بنێرێ. دراوسێکانی دیش هاتووچۆیان دەکرد. بەڵام یوڵدز دایکی یەشاری لە هەموویان خۆشتر دەویست. لەگەڵ ئەمەشدا هیچی لەلای نەدەدرکاند. بە تاقی تەنیا چاوەڕێی قەلەڕەشەکانی دەکرد. دڵنیا بوو کە رۆژێك هەر دێن.

بابە وەکو جاران دەچۆوە دایەرەو بۆ ماڵێ دەگەڕایەوە. بابە شەوێك بە باوەژنی گوت:– من حەزم لە منداڵە. ئەگەر ئەمجارە منداڵەکەت بۆ بمێنێ‌و پێبگرێ، یوڵدز دەنێرم بۆ شوێنێ کە تۆ ئاسودە ببی، بەڵام ئەگەر منداڵەکەت بە مردوێتی بێتە دنیاوە، ئەوا ئیدی ناتوانم یوڵدز لە خۆم دوور بخەمەوە.

باوەژن بە هەویا بوو منداڵەکەی بە زیندوێتی ببێ، چونکە نەزرو نیازێکی زۆری قەرار دابوو. یوڵدز بەغیلی بەم منداڵە هێشتا لە دایك نەبووە، دەبرد. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بە مردوێتی ببێ.

## ( نەزرو نیاز مەرگ ناگێڕێتەوە
## یادێکی دایکە قەلیٚ )

ئەنجام باوەژن منداڵی بوو. منداڵەکە زیندوو بوو. نووشتەو جادوویان کرد، نەزرو نیازیان کرد، هەر شتیٚ هەبوو کردیان. بۆچی؟ بۆوەی منداڵەکە نەمریٚ، بەلاّم لە یەکەم هەفتەدا منداڵەکە گەییە حاڵی مەرگ . دکتۆریان هێنا: لە سکی دایکیا باش نەخەملیوە، زۆر زەحمەتە بمێنیٚ. من هیچم پێناکریٚ.

بۆ سبەینیٚ منداڵەکە مرد.

باوەژن لە داخ و خەفەتاندا نەخۆش کەوت. شەوو رۆژ دەیگوت:- "جنییان" منداڵەکەیان خنکاند، هێشتا وازیان لێنەهێناوین. چاوی پیس منداڵەکەی کوشتووم.

دایکی یەشار رۆژ تا ئێواریٚ لە لای باوەژن دەمایەوە. یەشار هەندیٚ جار بۆ نیوەڕۆژە دەهاتە کن دایکی و چەند قسەیەکی لەگەڵ یوڵدزا دەکرد. چ هەواڵێك لە قەلەڕەشەکانەوە نەبوو. تەنیا جار جاریٚ قەلێکی تاق و تەنیا بە ئاسماندا تێدەپەڕی یا دەنگی قارە قارێك دەهات و زوو نەدەما. درەختی چنارەکان چۆڵ و هۆڵ بوو بوو. یوڵدز دایە قەلێی بیردەکەوتەوە کە چۆن لەسەر چلاّن دەنیشتەوە، دەیقڕاند، تەکانێکی دەدا. لە پڕ لە شەقەی باڵی دەداو دەڕۆیشت.

## ( زستانی سەخت )

زستانەکەی زۆر سەخت و تووش بوو. بەفر لە نێو حەوشاندا بە بارستایی دیوارەکان کەوت. نەوت و رەژوو خۆشەویست بوون، بە سیٚ قاتی نرخی جارانیش دەست نەدەکەوتن. بابی یەشار هەمیشە بێکار بوو. دایکی بۆ کارکردن و جل شۆری دەچووە مالاّنی دیش. هەندێجار هەواڵی سەیر سەیری لەگەڵ خۆدا دەهێنایەوە. بۆ نموونە دەیگوت:- دوێنیٚ شەو ماڵە هەژارێك لە سەرما رەق بوونەتەوە.

رۆژێکیش چاو بە گریان هات و بە باوەژنی گوت:- شەویٚ منداڵەکەم لە ژێر کورسییەکەدا لەسەرما مرد.

یەشار زۆر نیگەران بوو. هەرچەند مەرگی خوشکە چکۆلەکەی بیر دەکەوتەوە خەریك بوو شێت دەبوو. لەلای یوڵدز زۆر گریا، گوتی:- زۆری نەما بوو منیش لە سەرما رەق ببمەوە. ئاخر ژێر سیسەمەکەی ئێمە رووتە، ساردە، خەڵوزمان نییە.

یوڵدز فرمێسکەکانی یەشاری سڕی و گوتی:- مەگری یەشار. ئەگینا منیش گریان دەمگریٚ.

یەشار کڕبۆوەو گوتی:- بەیانی بابم بە دایکمی گوت:- لەم کاولەدا کەسێك نییە بلٚیٚ ئەریٚ بۆ فلاّنە کەس خەڵوزی نەبیٚ.

یوڵدز گوتی:- بابت ئیش دەکات؟

یەشار گوتی: نەء.. هەمیشە دادەنیشێت و بیردەکاتەوە. هەندێجاریش دەچێتە بەفر ماڵین.

یوڵدز گوتی:- ئەدی بۆ ناچیٚ کاریٚ بدۆزێتەوە؟

یەشار گوتی:- دەڵێ کار نییە.

یوڵدز گوتی:- بۆ کار نییە؟

یەشار هیچی نەگوت.

(بۆنی بەهار)

بەفر بەرە بەرە توایەوە. بەهار خۆی نواند. جۆگەڵان ڕێچکەیان بەست. دنیا سەوز بوو، گوڵان شکۆفەیان کرد. زستان گەلێ کەسی کوشتبوون. هەندێکیش بە چاو قایمی و سەرسەختی مابوونەوە.

دایکی یەشار سیسەمە ساردو سڕەکەیانی پێچایەوە. پەنجەرەی کردەوە. بابی یەشار لەگەڵ ١٥- ٢٠ کەسی دیدا چوو بۆ تاران. چوو تا لە کوورەی گەچدا کار بکات. یەشارو دایکی بە تەنێ لە ماڵ مانەوە.

باوەژن تازە چاك بوو بۆوە. چاوی بەرایی نەدەدا تەماشای یوڵدز بکات. یوڵدز زۆربەی کات لە ماڵی یەشار بوو. باوەژنیش هیچی نەدەگوت. بابە نازی یوڵدزی هەڵدەگرت. بەڵام یوڵدز حەزی لە چارەی ئەویش نەدەکرد. بابە دەیگوت:- ئەمساڵ دەتنێرمە قوتابخانە.

(کێ زمانی قەلەڕەشان بەڵەدە؟)

دوا مانگی بەهار بوو. یەشار سەر قاڵی تاقی کردنەوەکانی سەری ساڵ بوو. ڕۆژێ بە یوڵدزی گوت:- دوێنێ دوو قەلم بینین کە لە دەوروبەری قوتابخانەکەماندا دەسووڕانەوە.

یوڵدز راپەڕی و گوتی:- ئێ، ئیدی؟

یەشار گوتی:- ئیدی من چوومە پۆلەوە. تاقی کردنەوەی حیسابمان هەبوو، کاتێ هاتمە دەرەوە، سەیرم کرد نەماون.

یوڵدز بە ئەسپایی دانیشتەوە. یەشار گوتی:- خەم مەخۆ، ئەگەر قەلەکانی ئێمە بوون، دەگەڕێنەوە.

یوڵدز گوتی:- قسەت لەگەڵ کردن ؟

یەشار گوتی:- ڕێك نەکەوت. ئەمە جگە لەوەی من زمانی قەلان بەڵەد نیم.

یوڵدز گوتی:- با بەڵەدی.

یەشار گوتی:- چوزانیت؟

یوڵدز گوتی:- چونکە میهرەبانی، چونکە دڵت پاکە، چونکە هەموو شتێکت تەنیا بۆ خۆت ناوێ. چونکە وەکو باوەژن نیت.

یەشار گوتی:- ئەمانە لە کوێوە فێر بوویت؟

یوڵدز گوتی:- هەموو منداڵانی باش زمانی قەلان دەزانن. دایە قەلێ ئەمەی دەگوت. من لە خۆمەوە دەری نایەنم.

یەشار، بەم هەواڵە گەشایەوە. لە خۆشیاندا دەستی یوڵدزی دەنێو هەردوو دەستانی خۆی ناو گوشی، گوتی:- نازانم ئەو ڕۆژە چۆن قسەم لەگەڵ بێچوە قەلەکەدا کرد. لە بیرم نەماوە.

## ( گەڕانەوەی قەلان )

دوو سێ رۆژان تێپەڕین. هاوین نزیك دەبۆوە. هەوا گەرم دەبوو. گەورەکان ئارەزووی نیوەڕۆ خەویان دەبزوت. کە نیوەڕۆژەیان دەکرد، دەخەوتن، منداڵەکانیانیش بە تۆبزی دەنواند.

رۆژێك یەشار لە دوا تاقیکردنەوە بوو بۆوەو بۆ ماڵ دەگەڕایەوە. مزگەوتەکە کەمێك لەم لای قوتابخانەکەیانەوە بوو. دار تویەکیان لەبەر مزگەوتەکەدا چاندبوو. دەنگێك لە ژێر دار تووەکەوە یەشاری گازکرد. وەختی نیوەڕۆ بوو. یەشار ئاوڕی دایەوە. سەیری دەوروبەری خۆی کرد، کەسی نەبینی. کۆڵانەکە چۆڵ بوو. ویستی بکەوێتەڕێ، دووبارە لە دواوە گازیان کرد:- یەشار!

یەشار گەڕایەوە. لە پڕ چاوی بە دوو قەلان کەوت کە لەسەر دار تووەکە نیشتبوونەوە، پێ دەکەنین. دڵی یەشار کەوتە تەپە تەپ:- قەلەکان ئێوە لە کوێ من دەناسن؟

یەکێك لە قەلەکان بە دەنگی ناسك گوتی:- کاکە یەشار، تۆ هاوڕێی یوڵدز نیت؟

یەشار گوتی:- با.

قەلەکەی دی بە دەنگی نێر گوتی:- راستە دایکی ئێمە تۆی نەبینی بوو، بەڵام یوڵدز نیشانەکانتی پێ گوتبوو. دەمێکە قوتابخانەکان بە دووتا دەگەڕێین. نەمان دەویست هەوەڵجار یوڵدز ببینین. "دایە گەورەمان" وای راسپارد بووین. یوڵدز چۆنە؟

یەشار گوتی:- دەترسێت کە ئێوە لە بیرتان کردبێ کاکە قەل.

قەلە دەنگ نێرەکە گوتی:- ببورە، ئێمە خۆمان پێ نەناساندیت. من برای هەمان ئەو کاك "قەل"ەی کن ئەنگۆم کە دوایی مرد، ئەمەش خوشکمە. پێی بڵێ قەلە خان.

قەلە خان گوتی:- هەڵبەتە برایەکی دیشمان هەبوو کە سەرمای زستان رەقی کردەوەو مرد. بابیشمان لە مەراقی دایکماندا مرد.

یەشار گوتی:- خۆتان خۆش بن.

قەلەکان گوتیان:- سوپاست دەکەین.

یەشار کەمێ بیری کردەوەو گوتی:- باش نییە لێرە قسان بکەین، با بچین بۆ ماڵی ئێمە، کەس لە ماڵ نییە.

قەلەکان قایل بوون. یەشار کەوتەڕێ. قەلەکان بەسەر سەرییەوەو بە فڕین هاتن.

کەس ناتوانێ بڵێ یەشار چ حاڵێکی هەبوو. خۆی ئەوەندە بە گەورە دەهاتە بەر چاو هەر مەپرسە. هەندێجار سەیری ئاسمانی دەکرد، تەماشای قەلەکانی دەکردو پێدەکەنی و دەکەوتەوە رێ. ئەنجام گەییە ماڵەوە. کلیلەکەی لە دراوسێکەیان وەرگرتەوەو چووە ژوورەوە.

دایکی نیوەڕوان بۆ ماڵ نەدەهاتەوە. قەلەکان دابەزین، لەسەر قاڵدرمەکە نیشتنەوە. یەشار گوتی:- ناتانەوێ یوڵدز ببینن؟

لەم کاتەدا دەنگی گریانی یوڵدز لەو دیو دیوارەکەوە بەرز بۆوە. هەر سێکیان بێدەنگ بوون. ئەوجا قەلەخان گوتی:- جارێ ناکرێ یوڵدز بدینین. باپەلە نەکەین.

کاکە قەل گوتی:- بەڵێ، بابڕۆین بۆ شاری قەلانو هەواڵیان بدەینێ، پاشان دێینەوە، سڵاومان بە یوڵدز بگەیەنە.

کە قەلەکان ڕۆیشتن، یەشار چووە سەربان. چەندی چاوەڕوان کرد یولدز هەر نەهاتە نێو حەوشەی. گەڕایەوە. دایکی نان و پەنیری خستبووە ژێر یەغدانەکەوە. فراڤینی خوارد، دیسان چووە سەربان. هەوا گەرم بوو. کراسەکەی داکەند. بە پشتا ڕاکشا. دەیویست بە دیقەتەوە سەیری ئاسمان بکات. ئاسمان ساف و شین بوو. چەند پەلەوەرێك بە قولایی ئاسمانی سافدا دەڕۆیشتن. باڵیان نە دەجولاندەوە.

### (بڕیاری هەڵاتن)

نیوە ڕۆژەیان دەکرد. بابە یولدزی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو. چاوانی یولدز بە گریان بوون. هەنسکی هەڵدەدا. باوەژن دەیگوت دڵی کوتەکی دەوێ. بەجارێ شولی لێ هەڵکێشاوە.

بابە گوتی:- کیژە گیان خۆ تۆ منداڵێکی گوێرایەڵ بوویت. بڵێ بزانم چیت دەوێ.

یولدز چی نەگوت، هەر هەنسکی هەڵدەدا. باوەژن گوتی:- دەڵێ بە تەنێ دیق دەکەم، دەبێ ڕێم بدەی بچم لەگەڵ یەشاردا گەمان بکەم.

یولدز لەپڕ گوتی:- بەڵێ، حەزم لە هاووازییەکە، بە تەنیا دیق دەکەم.

پاش هەندێ قسەو باس، بابە بڕیاری دا کە یولدز جار جارێ بچێتە کن یەشار، بەلام زوو بگەڕێتەوە. یولدز زۆر خۆشحاڵ بوو.

پاش نیوە رۆژە بابەو باوەژن نوستن. یولدز هەستا و چووە سەربان. حەزی دەکرد لەوێ دانیشێ و چاوەڕێی قەلەکان بکات.

لە پڕ چاوی بە یەشار کەوت کە لە شیرین خەودا بوو. هەتاوەکەی گەرم بوو. یولدز چوو بە دیار یەشارەوە دانیشت. دەستی بە قژیا هێنا. یەشار چاوی هەڵێنا. پێکەنی. یولدزیش پێکەنی.

یەشار هەستاو دانیشت. کراسەکەی کردەوە بەری و گوتی:- یولدز دەزانی خەوی چیم دەدی؟

یولدز گوتی:- نەء .

یەشار گوتی:- لە خەوما دەستی یەکدیمان گرتبوو، لەسەر هەوران دانیشتبووین، دەچووین بۆ زەماوەندی قەلە خان، قەلەکانی دیش بە دوومانا دەهاتن.

یولدز تۆزێ سوور بۆوە. پاشان گوتی:- قەلەخان کێیە؟

یەشار گوتی:- ئەدی پێم نەگوتیت؟

یولدز گوتی: نەء. .

یەشار گوتی:- قەلەکانم بینی. قسەشم لەگەڵ کردن.

یولدز گوتی:- کەی؟

یەشار گوتی:- کە لە قوتابخانە دەگەڕامەوە، خوشك و برایەکی "کاك قەل"م بینی، قەرارە ئێستاکێ بێنەوە.

یولدز گوتی:- یانی قەلەخان خوشکی کاکە قەلی خۆمانە؟

یەشار گوتی:- بەڵێ.

یولدز گوتی:- خەبەرو باسی بابە قەل چییە؟

یەشار گوتی:– دەیانگوت لە مەراقی ژنەکەیدا مرد.

لەم کاتەدا جووتێ قەل لە پشت درەختەکانەوە پەیدا بوون. هاتن هاتن تا گەیینە سەر بانەکە. نیشتنەوە. سڵاویان کرد. یوڵدز گرتنی و ماچی کردن و لە باوەشی خۆیدا داینان. پاش چاکو خۆشی و ئاشنا بوون کاك قەل گوتی:– یوڵدز، هەموو قەلەکان دەڵێن دەبێ تۆ بێی بۆ کن ئێمە.

یوڵدز گوتی:– یانی لەم ماڵە هەڵێم؟

کاکە قەل گوتی:– ئا، دەبێ هەڵێی و بێی بۆ کن ئێمە. ئەگەر لێرە بمێنی دیق دەکەی و دەمری. ئێمە دەزانین کە باوەژن زۆرت ئەزیەت دەدا.

یوڵدز گوتی:– چۆن دەتوانم هەڵێم؟ بابەو باوەژن نایەڵن. مامەش لەوەتەی سەگەکەی کوژراوە، پێی بە ماڵی ئێمەدا نەکردووە.

قەلەخان گوتی:– ئەگەر خۆت بتەوێ، قەلان دەزانن چۆن دەربازت دەکەن.

یەشار تا ئێرە چ قسەیەکی نەکردبوو. لەم کاتەدا گوتی:– یانی بڕوات و ئیدی نەگەڕێتەوە؟

قەلەخان گوتی:– ئەمە وەستاوەتە سەر حەزی خۆی. تۆ چ دەڵێی یەشار؟

یەشار گوتی:– قسەکەی ئەنگۆ بەجێیە. ئەگەر لێرە وەمێنێ لە دەست دەچێ و هیچ کارێکیش ناکرێ. بەڵام ئەگەر بڕوات بۆ شاری قەلان... من نازانم چۆن دەبێ.

کاك قەل گوتی:– سبەی دێینەوە دیسان قسان دەکەین. یوڵدز تۆش تا سبەینێ بیری خۆت بکەوە..

قەلەکان رۆییشتن.

یوڵدز گوتی:– بە ئاقڵی تۆ بڕۆم؟

یەشار گوتی:– ئا، بڕۆ. بەڵام بگەڕێوە. قەول دەدەی کە بگەڕێیەوە؟

یوڵدز گوتی:– قەول دەدەم یەشار!

## ( دایە گەورە
## رێ و شوێنی هەڵاتن فێر دەکات )

سبەی نیوەڕۆ قەلەکان هاتن. قەلێکی پیرشیان لەگەڵ بوو. قەلە خان گوتی:– ئەمەش "دایە گەورەیە"

دایە گەورە چووە باوەشی یەشارو یوڵدز، ئەوجا لە بەرانبەر یان ڕۆنیشت و گوتی:– قەلان هەموو خۆشحاڵن لەوەی کە ئێوەیان دۆزییەوە، کیژەکەم زۆری تاریف لە ئەنگۆ دەکرد.

یوڵدز گوتی:– "دایە قەلێ" کیژی تۆ بوو؟

دایە گەورە گوتی:– ئا، قەلێکی چاك بوو.

یوڵدز گوتی:– لەبەر خاتری من هاتە کوشتن.

دایە گەورە گوتی:– قەلان یەك و دوو نین. بەمردن و کوشتن تەواو نابن. ئەگەر یەکێکیان بمرێ، دووان لە دایك دەبن.

یەشار گوتی:– یوڵدز دەیەوێ بێتە کن ئەنگۆ.

دایە گەورە گوتی:– خۆزگە! کەواتە دەبێ دەست بەکاربکەین.

یوڵدز گوتی:– هەر کاتێ بمەوێ دەتوانم بگەڕێمەوە؟

دایە گەورە گوتی:– بێگومان دەبێ بگەڕێیتەوە. ئێمەی قەلان حەز ناکەین کەس ماڵو حاڵو دۆستانی خۆی بەجێ بێڵێ و هەڵێ بۆوەی خۆی ئاسوودە بژیو لە خەڵکانی دی بێخەبەر بێ.

یوڵدز گوتی:– چۆن دەمبەن بۆ کن خۆتان؟

دایە گەورە گوتی:– بەر لە هەموو شتێك تۆڕێکی گەورە پێویستە. دەبێ خۆتان تۆڕەکە بچنن.

یوڵدز گوتی:– تۆڕمان بۆ چییە؟

دایە گەورە گوتی:– یەکەم، قەلان بۆیان دەردەکەوێ کە ئەنگۆ تەمەڵو تەوەزەل نینو ئامادەن لە پێناوی بەختەوەری خۆتاندا زەحمەت بکێشن. دووەم، تۆ لەسەر تۆڕەکە دادەنیشیتو قەلەکان هەڵتدەگرنو دەتبەن بۆ شاری قەلان.

یەشار خۆی تێهەڵقورتاندو گوتی:– ببورە دایە گەورە ئێمە دەزووو وخوری لە کوێ بێنین تا تۆڕ بچنین؟

دایە گەورە گوتی:– قەلان هەمیشە ئامادەن یارمەتی خەڵکانی چاكو ئیشکەر بدەن. ئێمە خوری دێنین، ئێوە دوو بە دوو دەی ڕێسنو تۆڕ دەچنن.

چەند خڕکە بەردێك لەسەربان بوو. باوەژن لە دەوری کوپەڵەی سرکەکەی هەڵی دەچنین.

دایە گەورە گوتی:– ئێمە خوری دێنینو لە بەینی ئەم بەردانە دای دەنەین.

تۆزێکی دی قسەو باسیان کرد، ئەوسا قەلەکان ڕۆییشتن.

یوڵدز گوتی:– یەشار، من نازانم چۆن خوری بڕێسمو تۆڕ بچنم.

یەشار گوتی:– من دەزانم. لە بابمەوە فێر بووم.

## (قەلان تێدەکۆشن،
## منداڵەکان بە دڵو بە گیان کار دەکەن،
## کارەکان دەچنە پێشێ)

قوتابخانەی یەشار تەعتیل بوو. هەنووکە خوێندەوارییە فارسییەکەی خراپ نەبوو. دەیتوانی نامەکانی بابی بخوێنێتەوە، مەعناکەی لێك بداتەوەو بە دایکی بڵێ. کتێبیشی دەخوێندەوە. دایکی هێشتا هەر دەچووە جل شۆری ماڵان. بابی لە کورەی گەچی تاراندا ئیشی دەکرد. قەلانی زۆر هاتووچۆی ماڵی ئەوانیان دەکرد.

باوەژن هەندێ جاران سەیری ئاسمانی دەکردو زۆر بوونی قەلان ترسی دەخستە دڵییەوە. یوڵدز خۆی نەدەکردە ساحێبی چ شتێك. باوەژن نارەحەت دەبوو هەندێجار لەبەر خۆیەوە دەیگوت:–ناشێت ئەو چەتیوە شتێکی لەگەڵ ئەو قەلانەدا هەبێ؟ بەڵام ڕواڵەتی هێدیو مەزڵومی یوڵدز ئەم شتەی نەدەنواند.

کاری خوری ڕستن لە ماڵی یەشاردا ئەنجام دەدرا. یەشار بە پێوە دەوەستا، وەکو پیاوی گەورە بە تەشی خوری دەڕست. یوڵدز بەنەکانی با دەداو بەنی ئەستورتری دروست دەکرد. کولانەیەکی بە تاڵ لە نێو حەوشەدا هەبوو. پەتەکانیان لەوێ دەشاردەوە.

دایە گەورە هەندێجار سەری دەدان و تاقیبی کارەکەی دەکرد.

یەشار پەتە بادراوەکانی پێ نیشان دەدا، دایە گەورە پێدەکەنی و دەیگوت:– ئافەرین منداڵانی زرینگ، ئافەرین! چاوو گوێتان بکەنەوە نەبادا یەکێ پێبحەسێ کە بە نهێنی کاردەکەن!

یەشارو یوڵدز دەیانگوت:– دڵنیابە، دایە گەورە. راستە تەمەنمان کەمە، بەڵام ئەقڵمان زۆرە. ئەوە دەزانین کە بنیادەم نابێ هەموو کارێك ئاشکرا بکات. هەندێ کاران بە ئاشکرا دێنە کردن و هەندێك بە نهێنی. دایە گەورە دەنووکە خوارەکەی بە عاردی دا دەخشاند و دەیگوت:– زۆرم خۆش دەوێن. زۆر جیاوازترن لە داك و بابتان. ئافەرین، ئافەرین! بەڵام هێشتا منداڵن و قاڵ نەبوونەتەوە، دەبێ زۆر شتان فێر بن و لەمە باشتر بیربکەنەوە.

هەندێجاریش قەلەخان و براکەی دەهاتن. لە کن ئەوان دادەنیشتن و قسانیان دەکرد. باسی شارەکەی خۆیان دەکرد. باسی داری چناریان بۆ دەکردن. باسی هەور، با، کێوان، دەشت و ئەستێڵیان بۆ دەکردن.

یوڵدزو یەشار لەگەڵ ٥٠– ٦٠ قەلی دیدا ئاشنا بوو بوون.

قەلەخان دەیگوت:– لە شاری قەلان پتر لە یەك ملیۆن قەل دەژین. ئەم قسەیە منداڵەکانی خۆشحاڵ دەکرد. یەك ملیۆن قەل لە شوێنێکا بژین و هیچ شەڕیشیان نەبێ، چەند چاکە.

## (هاوسەفەری یوڵدز)

ڕۆژێك یەشارو یوڵدز خوریان دەڕست. یوڵدز سەری هەڵبڕی، سەیری کرد یەشار مات و کز راوەستاوەو تەمەشای ئەو دەکات. کوتی:– بوا سەیرم دەکەی یەشار؟ چی بووە؟

یەشار گوتی:– بیرم دەکردەوە.

یوڵدز گوتی:– بیری چی؟

یەشار گوتی:– هیچ، هەروا.

یوڵدز گوتی:– دەبێ پێم بڵێی.

یەشار گوتی:– باشە، پێت دەڵێم، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر تۆ بڕۆی من بە تەنیا دیق دەکەم.

یوڵدز گوتی:– منیش دوێنێ بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆزگە پێکەوە سەفەرمان دەکرد. سەفەر بە تەنیا زۆر خۆش نییە.

یەشار گوتی:– یانی تۆ حەزدەکەی منیش لەگەڵتا بێم؟

یوڵدز گوتی:– پڕ بە دڵ. دەبێ بە دایە گەورە بڵێین.

یەشار گوتی:– خۆم پێی دەڵێم.

ڕۆژی دوایی دایە گەورە هات. یەشار گوتی:- دایە گەورە، منیش دەتوانم لەگەڵ یوڵدزا بێمە کن ئەنگۆ؟

دایە گەورە گوتی:- دەتوانی بێی، بەڵام دڵت بە دایکت ناسووتیٚ؟ خۆ ئەو دایکێکی خراپ نییە تا بەجێی بێڵی و هەڵێی!

یەشار گوتی:- تەگبیری ئەمەم کردووە. ڕۆژێك بەر لە سەفەرەکە پێی دەڵێم.

دایە گەورە گوتی:- قەیدی نییە، ئەگەر قایل بیٚ، تۆش لەگەڵ خۆدا دەبەین.

یوڵدزو یەشار کەوتنە سەر شەوق و زەوق و خێراتر کەوتنە کارکردن.

**( دزانی ماسی، دزانی خوری**

**دوعای ناگیرا )**

یەشار لە تاقی کردنەوە دەرچوو. ئەو ڕۆژەی کە شادەتنامەکەی هێنایەوە، کاغەزێکی بۆ بابی نووسی. یوڵدزو یەشار بە زۆری پێکەوە بوون. باوەژن کەمتر ئەزیەتی دەدان. ڕاستییەکەی دەیویست یوڵدز لەبەر چاوی خۆی دووربخاتەوە. جگە لەوەش هەمیشە نیگەرانی قەلەکان بوو. قەلەکان زۆریان هاتووچۆ دەکردو ئەویان نیگەران دەکرد. دەترسا ئاقیبەت بەڵایەکی بەسەرا بێت. بابەش ناڕەحەت بوو. بە تایبەتی لەو ڕۆژەوە کەچووە سەر حەوزەکەو سەیری کرد ماسییەکان نەماون، قەلەخان و براکەی دوو ماسییان خوارد بوو، دایە گەورە یەکێکی خواردبوو، باقییەکەی قەلەکانی دی خواردبوویانن. باوەژن و بابە هەرکە قەلێکیان دەبینی، جنێویان دەدایی و بەردیان تێدەگرت.

ڕۆژیٚ بابە ترێی هێنا بوو تا باوەژن سرکە دروست بکات. باوەژن کوپەڵەکەی هەڵگرت و بردیە سەربان. بەردەکانی ئەم دیوو و ئەودیو کرد. لە پڕ کۆمەڵیٚ خوری دەرکەوت. خورییەکانی هەڵگرت و هێنایە بەر دەستی مێردەکەی و گوتی:- دەبینی؟ "جنییان" هێشتا دەست بەردارمان نەبوون. کیٚ ئەم خورییەی لە نێو بەردەکاندا داناوە؟

بابە گوتی:- دەبیٚ ڕێیان لێبگیریٚ.

باوەژن گوتی:- سبەی دەچمە کن دوعانووس، دوعایەکی چاکی پیٚ دەنووسم تا "جنۆکەکان" بتارێنیٚ.

سبەینیٚ یوڵدز یەشاری بینی. قسەکانی بابەو باوەژنی بۆ گێڕایەوە، یەشار پێکەنی و گوتی: - دەبیٚ خورییەکان بدزینەوە. ئەگینا کارەکەمان چەند ڕۆژێك دوا دەکەویٚ.

یوڵدز خورییەکانی دزییەوە. هێنایان و لە کولانە چۆڵەکەدا دایان نا. یەشار سەیری کرد خورییەکی زۆر کۆبۆتەوە. خەبەریان دایە قەلەکان کە چیدی خوری نەیەنن. باوەژن چووە نك دوعا نووس و دوعایەکی چاکی لێوەرگرت. بەڵام کە بینی خورییەکان نەماوە، پتر ترسی لیٚ نیشت.

**( یەشار مۆڵەت لە دایکی وەردەگریٚ**

**مەسەلەی سەگی زمان زان )**

منداڵەکان لەو ڕۆژە بە دواوە کەوتنە تۆڕچنین. یەکەمجار پەتی ئەستووریان دروست کرد. ئەوجا کەوتنە گرێ دانی.

دایکی یەشار تەنافێکی درێژی هەبوو. ئەم تەنافە چەند تەڵێکی پێکەوە پێچرا بوو. یەشار دەیویست ئەو تەنافە لە دایکی وەرگرێو بیخاتە پاڵ پەتەکانی دی تا مەحکەمتر بن.

شەوێك لەسەر شیو خواردن بە دایکی گوت:- دایە، ئەگەر بۆ چەند ڕۆژێك سەفەر بکەم زۆر نیگەران دەبی؟

دایکی وایزانی یەشار شۆخییان دەکات.

یەشار دووبارە پرسی:- دایە مۆڵەتم دەدەیی سەفەرێکی چەند ڕۆژی بکەم؟ قەولت دەدەمێ کە زوو بگەڕێمەوە.

دایکی گوتی:- دەبێ هەوەڵجار پێم بڵێی کە پارە لە کوێ بێنم؟

یەشار گوتی:- پارەم ناوێ.

دایکی گوتی:- باشە لەگەڵ کێدا دەڕۆی؟

یەشار گوتی:- هەنووکە ناتوانم بیڵێم، کاتی ڕۆیشتن دەیزانیت.

دایکی گوتی:- باشە بۆ کوێ دەچیت؟

یەشار گوتی:- ئەمەشیانت لە کاتی ڕۆییشتندا پێت دەڵێم.

دایکی گوتی:- باشە منیش وەختی ڕۆییشتن مۆڵەتت دەدەمێ.

دایکی وایدەزانی یەشار هەر بەڕاستی شۆخییان دەکاتو دەیەوێ لەو قسە گەورانەی ساڵان بکات. ئەوسای کە یەشار منداڵ بوو پۆلی یەکەم بوو، هەندێجاران لەم قسە گەورانەی دەکرد. بۆ نموونە لەسەر سەرینەکەی دادەنیشتو دەیگوت:- دەمەوێ بچم بۆ ئاسمان، چەند دانەیەك لەو ئەستێرە وردانە بچنمو بیهێنمو بیکەم بە دوگمەی چاکەتەکەم.

ئیدی نەیدەزانی کە هەر یەکێك لەو "ئەستێرە وردانە" ملیۆن ملیۆن ئەوەندەی ئەو زیاتریشنو هەندێکیان هەزار ئەوەندەی ئاگری ناو مەقڵییەکەی ئەوان گەرمترن.

ڕۆژێکیش سەگێکی ڕەشی بەرەڵڵای ڕاکێش ڕاکێش هێنابووەماڵەوە. کاتی نیوەڕۆژە بوو و یەشار لە قوتابخانە دەگەڕایەوە. بابیو دایکی گوتیان:- ڕۆڵە، بۆ ئەم حەیوانە چەپەڵەت هێناوەتەوە؟

یەشار بە پۆزەوە گوتی:- وا مەڵێن. ئەم سەگە زمان دەزانێ. ماوەیەکی زۆری لەگەڵ خەریك بووم تا فێرە زمانم کرد. ئێستا هەرچییەکی پێ بڵێم بە قسەم دەکات.

بابی بە پێکەنینەوە گوتی:- ئەگەر ڕاست دەکەی، پێی بڵێ با بچێ دوو نان بکڕێو بیهێنێ، ئەمەش پارەکەی.

یەشار گوتی:- دەبێ جارێ نانەکەی بخوات ئەوسا...

دایکی هەندێ نانی وشکی خستە بەر سەگەکە. سەگەکە خواردیو کەوتە کلکە سووتێ. یەشار بە سەگەکەی گوت:- تێگەیشتم چیت دەوێ، هاوڕێ.

بابی گوتی:- باشە چی وت یەشار!

یەشار گوتی:- دەڵێ "یەشار گیان شتێك چۆتە بەینی ددانمەوە تکایە دەمم بکەرەوەو بۆم دەربێنە!

دایکی و باوکی بە سەرسامی سەیریان دەکرد. یەشار بە کاوەخۆ دەمی سەگەکەی کردەوەو دەستی بردە ژوورەوە کە بەینی ددانەکانی سەگەکە پاك بکاتەوە. لە پڕ سەگەکە کەوتە جرت وفرت و حەپاندی و دەنگی هاواری یەشار بەرز بۆوە. بابی لە سەگەکەی داو دەری کرد.

دەستی یەشار لە چەند لایەکەوە بریندار بوو بووو بەخۆیشی هەر "ئاخ و ئۆفی" دەکرد.

ئەو رۆژە یەشار بە دایکی گوت:- مەعلومە کاتی رۆیشتن مۆڵەتم دەدەی؟

دایکی گوتی:- بەڵێ.

یەشار گوتی:- باشە.. تەنافە تەلەکەشتم دەدەێی دایکە؟

دایکی گوتی:- بۆ چیتە؟ دیسان چیت لە ژێر سەردایە ڕۆڵە گیان؟

یەشار گوتی:- بۆ سەفەرەکەم پێویستە.

دایکی سەرسام بوو بوو. دەیزانی مەبەستی کوڕەکەی چییە. ئاخری قاییل بوو کە تەنافەکەشی بداتێ. کاتێ کە دەیانویست بنوون، یەشار گوتی:- دایکە؟

دایکی گوتی:- گیانی دایکە، تۆ بڵێ!

یەشار گوتی: قەولم دەدەێی ئەم قسانە بە کەس نەڵێی؟

دایکی گوتی:- خاترجەم بە، بە کەس ناڵێم، بەڵام دەزانی گەر بابت لێرە بوایە پێکەنینی بەم قسانەت دەهات؟

یەشار هیچی نەگوت . لە حەوشەدا خەوتبوون و تەماشاکردنی ئەستێرەکان یەکجار لەزەت بەخش بوو.

(ڕۆژی سەفەر)

کارەکان بەخێرایی دەچوونە پێشتێ. دایکی یەشار زۆربەی نیوەڕوانان نەدەهاتەوە بۆ ماڵێ. منداڵەکان ماوەی کارکردنیان زۆر بوو. قەلەکان هاتووچۆیان کەم کردبۆوە. باوەژن زۆر وریا بوو. دایە گەورە دەیگوت:- وا چاکە کەمتر هاتووچۆ بکەین. ئەگینا باوەژن پێدەحەسێ و ریسەکەمان لێدەکاتەوە بە خوری.

ئاخرو ئۆخری مانگی چواری هەتاوی بوو، تۆڕەکە حازر بوو. دایە گەورە هات، تۆڕەکەی بینی و پەسەندی کرد، گوتی:- ئەو هەموو زەحمەتەتان کێشاوە هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە سوودی لێوەر بگرن.

یەشارو یولدز گوتیان:- کەی دەڕۆین؟

دایە گەورە گوتی:- گەر مەیلتان لەسەر بێ سبەی نیوەڕۆ...

یەشارو یولدز گوتیان:- رۆژێ زووتر، چاترە.

دایە گەورە گوتی:- کەواتە سبەی نیوەڕۆ چاوەڕوان بن. هەرکاتێ گوێتان لە دوو قەل بوو سێ جارانیان قڕاند، تۆڕەکە هەڵگرن و وەرنە سەربان.

منداڵەکان لە خۆشیاندا پێیان عاردی نەدەگرت. بەوان بابە هەستانایەو بکەوتنایە سەما. توزێکی دی قسانیان کرد، دایە گەورە هەڵفڕی‌و چوو لەسەر دار چنارێکی هێروەتر نیشتەوەو جارێکی قڕاند، تەکانێکی دا، هەستاو ڕۆیی.

**( سەلا لە دڵ بێ خەبەران، دەڵێن**
**یوڵدز شێت بووە! )**

شەو داهات. یوڵدز لەسەر شیو خۆ بە خۆ پێدەکەنی. باوەژن دەیگوت:- چەتیوە شێت بووە.
بابە دەی پرسی:- کیژم، بەچی پێدەکەنی، من شتێك نابینم مایەی پێکەنین بێ.
یوڵدز دەیگوت:- لە خۆشیاندا پێدەکەنم.
باوەژن تووڕە دەبوو.
بابە دەیپرسی:- لە خۆشی چی؟
یوڵدز دەیگوت:- هەی لەوە، هەر وا شادم، چ شتێك نییە.
باوەژن دەیگوت:- وازی لێ بێنە، سەری لێداوە.

**( دایکی باش‌و دلۆڤان )**

کاتی خەو بوو. یەشار بە دایکی گوت:- دایە، دەتوانی سبەی نیوەڕۆ بێیتەوە؟
دایکی گوتی:- ئیشێکت هەیە؟
یەشار گوتی:- بەڵێ، نیوەڕۆ پێت دەڵێم. دەربارەی سەفەرەکەمە.
دایکی گوتی:- زۆر چاکە سبەی نیوەڕۆ دێمەوە.
دایکی یەشار سەری لە کاری کوڕەکەی دەرنەدەکرد. بە ڕاستی مەسەلەی سەفەرەکەی هەر بیر نەمابوو، پاشان بیری کەوتەوە، بەڵام دەیزانی یەشار کوڕێکی باشەو کاری خراپ ناکات. یەشاری زۆر خۆشدەویست. بە رۆژەوە کە دەچووە جل شۆری ماڵان بیری هەر لەلای یەشار بوو. هەندێ جار خۆی بە برسێتی دەهێشتەوەو جل‌و بەرگ‌و قەڵەم‌و کاغەزی بۆ وی دەکڕی. دایکێکی دلۆڤان‌و چاك بوو. یەشاریش بە قسەی دەکرد‌و ئەزیەتی نەدەدا.

**( سەفەر،**
**یوڵدز‌و زیندان )**

رۆژ بۆوە. چەند سەعاتێکی دی وەختی سەفەر دێت. زەمان بەسستی دەڕۆیی. یەشار لە ماڵەوە بە تەنێ بوو. ئارامی لێبڕابوو، بە نێو حەوشەکەدا دەهات‌و دەچووو بیری لەلای دایکی‌و یوڵدز بوو. چەند جارێ تۆڕەکەی دەرهێنا‌و لە نێو حەوشەکەدا ڕای خست، لەسەری دانیشت، ئەوجا کوێ کردەوە‌و لەجێی خۆی دایناپەوە.
نیوەڕۆ دایکی هاتەوە. ترێ‌و نان‌و پەنیری کڕی بوو. دانیشتن، فراڤینیان خوارد. یەشار خەمی یوڵدزی بوو. دایکی چاوەڕوان بوو کە کوڕەکەی قسان بکات. کەسییان هیچیان نەدەگوت:-

یەشار بیری دەکردەوە. ئەگەر یوڵدز نەتوانێ بێ، چ دەبێ؟ نەخشەکەیان تێکدەچێ. ئەگەر باوەژنم بکەوێتە دەست، خۆم دەزانم چی لێدەکەم. قژەکەی دەسکەنە دەکەم. بێ حەیا! بۆ نایەڵێ یوڵدز بێتە کن من؟ هەنووکە ئەگەر دەنگی قەلەکان بێت، چیبکەم، هێشتا یوڵدز نەهاتووە. خەریکە دڵم شەق بەرێ..

بە بیانوی ئاو هێنانەوە چووە نێو حەوشە. دەنگی باوەژنو بابە لەو دیو دیوارەکەوە دەهات. باوەژن ئاوی بە دەستی بابەدا دەکرد. دیار بوو بابە تازە هاتبۆوە. باوەژن دەیگوت:– نازانی چەتیوە چ بەڵایەکی بەسەرم هێناوە، ئاخرییەکەی ناچار بووم لە ئاشخانەکەدا حەپسی بکەم...

لەم کاتەدا جووتە قەلێك لەسەر چنارێك نیشتنەوە. یەشار هەرکە چاوی بەوان کەوت، دڵی دا خورپا، ئەدی یوڵدز چی لێبکات؟ دایکی بە دویدا بنێرێ؟ ناکا باوەژن هەر بە ڕاستی ڕاستی حەپسی کردبێ؟!

قەلەکان هەڵفڕین. نزیك بوونەوە، گەیینە ئاستی یەشار. بزەیەکیان بە روویا داو لەسەر دار تووەکە نیشتنەوەو لە پڕ دوو بە دوو کەوتنە قڕاندن.

– قاڕ.. قاڕ!.. قاڕ.... قاڕ!... قاڕ... قاڕ!..

دەنگی قەلەکان وەکو شەیپوڕی جەنگ بوو. هەم ترسی لەگەڵ بوو هەم حەرەکەتو تەکان. یەشار بۆ نیو نەخت پەشۆکا. پاشان هاتەوە سەرەخۆو بە کاوە خۆ بۆ لای کولانەکە چوو، تۆڕەکەی هەڵگرتو بە هێواشی چووە سەربان. بابەو باوەژن چووبوونە ژوورەوە.

قەلەکان هاتنو لە تەنیشت یەشار نیشتنەوەو لە ئەحواڵیان پرسی. یەشار تۆڕەکەی ڕاخست. هێشتا یوڵدز نەهاتبوو. نیو دەققە تێپەڕی. یەشار تەماشای دووری کرد. بە دەستە چەپاو لە دوورەوە ڕەشاییەکی گەورە دەجوڵاو دەهاتە پێشەوە. یەکێك لە قەلەکان گوتی:– خەریکە دێن، یوڵدز بۆ نایەت؟

یەشار گوتی:– نازانم لەوەیە باوەژنەکەی حەپسی کردبێ.

ڕەشاییەکە نزیکتر بۆوە. دەنگی هێواشی قاڕە قاڕ دەهات. یوڵدز هەر نەدەهات. قەلەکان گەیینە جێ. قاڕە قاڕی هەزاران قەلە ڕەش ئەرزو ئاسمانی پڕکرد. دارو دیوار لە قەلاندا ڕەش بوو.

شوێنی بە تاڵ بەسەر دار تووەکەوە نەما. خەڵکی لە ماڵان هاتبوونە دەرێ. هەموو ترسیان لێ نیشتبوو.

دایکی یەشار مەنجەڵێکی بەسەرەوە بوو، لە ناوەندی حەوشەدا وەستابوو، هاواری دەکرد. یەشار کێوە چوویت؟.. هەنووکە چاوت دەردێنن!..

یەشار هەر کە گوێی لە دەنگی دایکی بوو، هاتە نزیکی سووانەکەو گوتی:– دایکە، مەترسە! ئەمانە هاوڕێی منن. ئەگەر منت خۆشدەوێ هەڕۆ یوڵدزم بۆ بنێرە سەربان،. دایکە، تکات لێدەکەم بڕۆ دایکە!... ئێمە دەبێ دوو بەدوو سەفەر بکەین.

دایکی ماتو سەرسام دەیڕوانییە کوڕەکەیو هیچی نەدەگوت. یەشار دیسان لێی پاڕایەوە. بڕۆ دایکە! تکات لێدەکەم.. قەلەکان هاوڕێی ئێمەن.. لێیان مەترسە!

یەشار نەیدازانی چ بکات. کەمی مابوو لە سەلاَی گریانیَ بدات. دایە گەورە هاتە پێشەوەو گوتی:– تۆ بڕۆ لەسەر تۆڕەکە دانیشە، من خۆم و چەند قەلێك دەچم بە دووی یوڵدزا، بزانم لە کوێیە.

قاڕە قاڕی قەلەکان زۆر کەسی هێنابووە نێو حەوشان. هەرکەسەو شتێکی دابوو بە سەریا و بە ترسەوە سەیری ئاسمانی دەکرد. هەندیَ کەس لە پشت پەنجەرەکانەوە تەماشایان دەکرد. پیرێژنان هاواریان دەکرد: بەلاَ نازڵ بووە! بڕۆن دوعا بکەن، نوێژ بکەن، نەزرو نیاز بکەن!

بابە کوت و پڕ گۆپالْ بە دەست هاتە نێو حەوشە. باوەژنیش بە دووی ئەودا هاتە دەریَ. هەریەکەیان مەنجەڵێکیان دابوو بە سەریاندا. دایە گەورە گوتی:– قەلەکان بنەون لە دەست و پێی ئەم پیاوو ژنە، نەیەڵن بجوڵێن.

قەلەکان بەسەریانا دابارین. تەقەتەقی مەنجەڵەکان. بابەو باوەژنی دەتۆقاند.

دایە گەورەو چەند قەلێك چوونە ژوورەوە. دەنگی هاواری یوڵدز لە ئاشخانەکەوە دەهات. دەرگای ئاشخانەکە قفلْ بوو. یوڵدز بە چەقۆ پێی دا دەکێشا تا دەرگاکە کون بیَ. کونێکی بچکۆلەشی تێکردبوو. لەم کاتەدا دایکی یەشار گەییە وێندەریَ. قەلەکان رێیان بۆ کردەوە. دایکی یەشار بە بەرد قفڵەکەی شکاند. یوڵدز هاتە دەریَ... دایکی یەشار کردییە باوەش و ماچی کرد. یوڵدز گوتی:– دایە، خەمی ئێمەت نەبیَ، زوو دەگەڕێینەوە. بە باوەژنیش مەڵیَ کە تۆ منت هێناوەتە دەریَ. ئەزیەتت دەدا.

دایکی یەشار دەگریا، یوڵدز غاری دا. لە کولانە مریشکاندا بوخچەیەکی دەرهێناو چووە سەربان. قەلەکان دەوریان گرتبوو.

وەختیَ گەییە نك یەشار خۆی بە سەریادا. یەشار باوەشی بۆ کردەوەو بە خۆیەوەی گوشی و لە خۆشییاندا گریا.

دایە گەورە سوپاسی دایکی یەشاری کرد، هاتە سەربان و بە دەنگی بەرز گوتی:– قەلان، حەرەکەت بکەن!.

لە پڕ قەلەکان کەوتنە جم و جۆلْ. بە دەنووك و چنگ تۆڕەکەیان هەڵگرت و بەرز کردەوە. ئەو ریشوانە یەشار بە قەراخی تۆڕەکەیەوە کردبوو، قەلەکان ئەو ریشوانەشیان گرت. یەشار لە سەریَ را هاواری کرد: دایکە، ئەوا ئێمە رۆیشتین، سلاَو لە بابم بکە، زوو دەگەڕێینەوە، خەم مەخۆ!.

قەلەکان بابەو باوەژنیان بە دەقی خۆیانەوە بە جێهێشت و کەوتنە ڕیَ. بابەو باوەژن بە دوو قۆڵی لە حەوشەدا وەستا بوون، هاواریان دەکردو بەردو داریان دەهاویشت. جلەکانیان پارچە پارچە بوو بوو، چەند شوێنێکیشیان بریندار بوو بوو.

ئەنجام لە شار دوور کەوتنەوە.

هەزاران قەل دەوروبەری منداڵەکانیان گرتبوو، تەنیا ئاسمانیان لێوە دیار بوو. یوڵدز تەمەشایەکی هەورەکانی کردو لەبەر خۆیەوە گوتی:– چەند جوانن!.

قەلەکان هەڵهەڵەیان لێدەداو دەڕۆیشتن. دەچوون بۆ شوێنێ کە لە ماڵی "بابە" چاکتر بوو. دەچوون بۆ شوێنێ کە "باوەژنی" لێنەبوو.

**( مەمکەمژەکان تور بدەن!**
**بە یادی دۆستانی شەهیدو ناکام )**

دایە گەورەو قەلەخانو کاك قەل هاتنە کن منداڵەکان تاتۆزێ قسان بکەنو پاشان بڕۆن وەکو قەلەکانی دی کار بکەن.

یوڵدز بوخچەکەی کردەوە. کراسێکی دەرهێناو بە یەشاری گوت:- هی بابەیە، بۆ تۆم دزیوە، دوایی لەبەری بکە.

یەشار سوپاسی کرد.

تۆزێ نانو کەڕەش لە بوخچەکەدا بوو. یوڵدز چەند پەڕە قەلێکی لە گیرفانی دەرهێنا. دای بە دایە گەورەو گوتی:- دایە گەورە، ئەمانە پەڕی "کاکە قەل"ن. وەکو یادگار هەڵمان گرتبوو تا بیدەین بە تۆ. منو یەشار، "کاکە قەل"و دایکی، هەرگیز لە بیر ناکەین. ئەوان لە پێناوی ئێمەدا هاتنە کوشتن.

دایە گەورە پەڕەکانی وەرگرت، چوو بە حەوادا. لە کاتێکا کە بەسەر منداڵەکانو قەلەکانەوە دەفڕی، بە دەنگی بەرز بەرز گوتی:- بە یارمەتیتان دەمەوێ دوو کەلیمە قسان بکەم. قەلەکان بێدەنگ بوون. دایە گەورە مەمکەمژەیەکی لە بن باڵی دەرهێناو گوتی:- دۆستانی ئازیزم! قەلانی ئەمەکدار! هەنووکە یوڵدز چەند پەڕێکی "کاکە قەل"ی دامێ. ئێمە ئەم پەڕانە هەڵدەگرین. چونکە تاقە نیشانەی دایكو کوڕی دڵسۆزو فیداکارە. ئەم پەڕانە فێرمان دەکەن کە ئێمەش قەلی ئازاو چاك بین.

یوڵدزو یەشار هورایان کێشا.

قەلەکان بە دەنگی بەرز بەرز قڕاندیان.

دایە گەورە لەسەر قسەکەی ڕۆیی. بەڵام ئەم "مەمکەمژە"یە فڕێ دەدەین. چونکە باوەژن بۆ یوڵدزی کڕی بوو تا هەمیشە بی مژێتو دەرفەتی نەبێ لەگەڵ کەسدا قسان بکاتو دەردی دڵی خۆی بۆ کەس دەرببڕێ.

یوڵدز مەمکەمژەکەی خۆی ناسییەوە. هەمان مەمکە مژە بوو کە دابووی بە "دایە قەڵێ".

دایە گەورە مەمکەمژەکەی توڕدا. قەلەکان هەڵهەڵەیان لێدا.

دایە گەورە گوتی:- باوەژن ،"دایە قەلێ"ی کوشت، "کاکە قەلی" جوانە مەرگ کرد، بەڵام یەشارو یوڵدز ئەوانیان لە بیر نەکردووە. کەواتە هەر بژی ئەو منداڵانەی کە هەرگیز دۆستانی جوانە مەرگو شەهیدی خۆیان لە بیرناکەن!

قەلەکان بە دەنگی بەرز قیڕاندیان. یوڵدزو یەشار چەپڵەیان لێداو هورایان کێشا.

( لوتکەی کێوان
شاری قەلان
قەلانی چیانشین )

لە دوورەوە کێوانی بەرز دەرکەوتن . دایە گەورە هاتە خوارەوەو گوتی:- سەری ئەو کێوانە شای قەلانە. سەرتان سوور نەمێنێ کە چووینەتە ئەو لوتکانە. قەلان جۆراو جۆرن.

( پایزی ١٣٤٤=١٩٦٥)

## نامەی دۆستان

ئەمە دەقی نامەی پڕ لە خۆشەویستی هەندێ لەو منداڵانەیە کە چیرۆکی "یولدزو قەلان"یان بەر لە چاپکردنی ژنەوتووەو نەیان ویستوە بێدەنگ بن. نامەکە لەلایەن مامۆستای ئەو منداڵانەوە بە دەستی ئەم نووسەرە گەییوە.

سلاومان بۆ دۆستانی یولدز هەیە، هەر کەسێك خەبەرێکی یولدزمان بۆ بێنێ مزگێنی دەدەینێ. ئێمە نیگەرانی قەلەکان، یولدو یەشارین. ئێمە سابوونی زۆرمان هەیە، دەمانەوێ بیدەین بە یولدز. ئێمە چاوەڕوانی بەهارین. چیدی قەلان ئەزیەت نادەین. ئێمە دەمانەوێ دایکەکان وەکو دایکە قەلێ بن.

دایکە قەلێ، دایك بوو. ئێمە دایکانمان خۆشدەوێ. دایە قەلێ لەگەڵ مێردەکەیدا تەبا بوو. دەمانەوێ دایکی ئێمەش لەگەڵ بابماندا تەبابن. ئێمە وا دەزانین کاك قەل و یولدزو، یەشار چوونەتە شەڕ. شەڕ لەگەڵ باوەو باوەژنەکان بکەن. ئێمە تیروکەوان بۆ یەشار دروست دەکەین. ئێمە هێلانەی قەلان تێك نادەین تا کاك قەل لەسەری هەڵنیشێت و هەرکاتێ باوەژن یان بابە هاتن، یولدز ئاگادار بکاتەوە. ئێمە پێڵاوو جل و بەرگ دەدەینە یولدز. ماسییان دەدزین. جاڵجاڵۆکان کۆ دەکەینەوە.

کاك قەل مژدەمان بۆ دێنێ. لە شەڕدا سەر دەکەون. یەشار دەستی یولدز دەگرێ و دێنەوە. یولدز دەبێ بە دایکێکی چاك و یەشار دەبێ بە باوکێکی چاك. ئێمە لە زەماوەندەکەیاندا هەڵدەپەڕین. ئێمە نیگەرانین، نیگەرانی هەموویانین. دەمانەوێ بچینە هیمدادیان. دەمانەوێ ئەوان زوو لەشاری قەلان بگەڕێنەوە.

دڵسۆزانی
یولدز، یەشار، قەلان
"ناوو ئیمزای ٢٨ قوتابی پۆلی
شەشەمی قوتابخانەی سەرەتایی
دەوڵەتیی ئەمیر کەبیر- ئازەر شار"
١٣٤٤/١١/١٤=١٩٦٥
ح. ك. ع ١٩٨٢

# پیرێژن و جوجکە زێڕینەکەی

پیرێژنێك هەبوو لە دارای دنیادا جگە لە جوجکێکی زێڕین چ شت و چ کەسێکی دی نەبوو. ئەم جووجکەشی لە خەودا دەستکەوتبوو. پیرێژن لفکەی دەچنی و دەیبرد لە گەرماوەکاندا دەیفرۆشت.

جووجکە زێڕینیش لە کوختەکەی پیرێژن داو لە حەوشە چکۆلەکەیدا بە دووی مێروولەو جاڵجاڵۆکاندا دەگەڕاو لە سایەی سەری جووجکە زێڕینەوە چ مێروویەك زاتی نەدەکرد پێ بنێتە ماڵی پیرێژن. تەنانەت مێروولە گورج و درشتەکانیش سڵیان لێدەکردەوە، جووجکە زێڕین شەلم کوێرم چاك و خراپی مێروولانی نەدەبوارد، هەمووی دەخواردن و قڕی دەکردن. دەرەقەتی ئەو پشیلە چڵێسانەش دەهات کە سەر بە هەموو کونێکا دەکەن و بۆ پلە گۆشتێك دارو بەرد بە یەکا دەدەن.

دار گوێزێکی زەلام و پڕ لق و پۆپیش لە حەوشەکەی پیرێژندا هەبوو. کە وەرزی گوێز پێ گەیشتن دەهات، جووجکە زێڕین کەیفی کۆك دەبوو. با هەڵی دەکردو گوێز بەردەبوونەوە، جووجکە دەیشکاندن و نۆشی گیانی دەکردن.

جاڵجاڵۆکەیەکیش تەنیایی و پیری پیرێژنی بە هەل زانی بوو. لەسەر ڕەفەکەو لە پشت بوتڵە بەتاڵەکانەوە داوی تەنی بوو. هێلکەی تێدا دەکرد. پیرێژن جاران سرکەو ئاوی بەرسیلەو... لەم بوتڵانەدا دەگرتەوەو دەیفرۆشت و ژیانی خۆی دەقەتاند، بەڵام ئێستا هەر لفکەی دەچنی. بوتڵە ڕەنگاو ڕەنگەکانی بە تاڵ و بێناز لەسەر ڕەفەکە کەوتبوون.

جاڵجاڵۆکەکە لە جووجکە زێڕین دڵنیا نەبوو، هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوو کە ئاقیبەت ڕۆژێك گیرۆدەی دەنووکی جووجکە زێڕین دەبێ. بە تایبەتی چەند جارێك لە قەراغ ڕەفەکە دیتبووی و هەڕەشەی لێکردبوو کە ئاقیبەت دەیکا بە پاروویەکی نەرم. چەند بێچوویەکی جاڵجاڵۆکەکەشی خوارد بوو... لەلایەکی دیکەشەوە جووجکە زێڕین قڕی خستبووە ئەو مێروولە وردە زەردانەی کە بە بۆنی ئەو وردە شتانەوە دەهاتن کە پیرێژن لەسەر ڕەفەکەی دادەنان، بە پشت بوتڵە بەتاڵەکاندا ڕێچکەیان دەبەست و جاڵجاڵۆکەکەش بۆ خۆی پێیان خەنی دەبوو.

شەوێك جاڵجالۆکەکە هاتە خەونی پیرێژن و پێی گوت:- ئەهای پیرێژنی کلۆڵ، باشە تۆ ئاگات لێیە جووجکەی بێ حەیا چۆن ماڵ و سامانت بە فیڕۆ دەدا!

پیرێژن گوتی:- هەی دێ گوم بە لەبەرچاوم! جووجکە زێڕینی من هێند میهرەبان و دڵسۆزە کە هەرگیز کاری وای لێناوەشێتەوە.

جاڵجاڵۆکەکە گوتی:- کەواتە بێ خەبەری، تۆ وەکو کەو سەرت دە نێو بەفری دەکەی و خەیاڵی خاو لێدەدەی.

پیرێژن، بەبێ تاقەتییەکەوە گوتی:- ڕاست و دۆغری پێم بڵێ بزانم مەبەستت چییە؟ جاڵجاڵۆکە گوتی:- جا چت پێ بڵێم؟ ئەفسوس و جادووی جووجکە زێڕین چاوانتی وا کوێر

کردوون کە باوەڕ بە قسەی من نەکەی. پیرێژن بێتاقەت بوو، گوتی:- ئەگەر بەڵگەی دروست و ماقووڵت هەبێ کە جووجکە زێڕین ماڵ و سامانی من بە فیڕۆ دەدا. بەڵایەکی وای بەسەر دێنم کە تەنانەت مێروولەکانیش گریانیان بۆ حاڵی بێ.

جاڵجاڵۆکە، کە بینی پیرێژن خەریکە بێتە ڕەداو تەواو پڕبووە، گوتی:- کە وایە گوێبگرە با پێت بڵێم ئەی پیرێژنی کلۆڵ، تۆ بە هەزار چەرمەسەری لفکان دەچنی و منەتی ئەم و ئەو هەڵدەگری تا ڕێت دەدەن لفکەکانت بەریتە گەرماوەکان و بیانفرۆشیت و پارووە نانێک پەیدا بکەی و خۆت لە برسێتی بخەلەسێنی، کەچی ئەم جووجکە بێحەیاو تێر نەخۆرەیە قەت جارێ بیر لەوە ناکاتەوە کە لەو هەموو گویزە شتێك بۆ تۆ بخاتە لاوە تا بیفرۆشیت و بەلای کەمەوە یەکدوو ڕۆژێك بە ئاسوودەیی بژیت و شیو وفراڤینێکی هەندێ چاك بخۆی. نووکە باوەڕت کرد کە جووجکە زێڕین ماڵ و سامانت بە فیڕۆ دەدا!!

پیرێژن بەڕقەوە لە خەو ڕاپەڕی. نەخشەیەکی قایمی کێشا. بەیانی نەچووە لفکە فرۆشتن، لە کوختەکەیدا ڕۆنیشت و چاوی بڕییە نێو حەوشە. جووجکە زێڕین دەمێ بوو لە خەو هەستا بوو هەتاو تەواوێك بەرز بوو بۆوە.

جووجکە زێڕین هاتە بن دار گوێزەکەو پێی گوت:- هاوڕێ درەخت یەك دوو گوێزان بەردەوە، با قاوەڵتی بکەم.

دار گوێزەکە یەکێك لە لقەکانی تەکان دا، چەند گوێزێکی گەییو کەوتنە خوارەوە. جووجکە زێڕین ویستی بەرەو گوێزەکان غاربدا، پیرێژن هاواری لێکرد:- ئەهای سیسەمارە، نەخەڵەتێی توخنیان بکەوی، ڕازی نیم چیدی گوێزی من بخۆی.

جووجکە زێڕین بە سەر سوڕمانەوە ڕوانیە پیرێژن، دەتگوت پیرێژنێکی دییە، ئەو چاوە میهرەبان، ئەو ڕووە خۆش و دەم و لەبزە شیرینەی جارانی نەبینی. هیچی نەگوت و بە بێدەنگی لە جێی خۆی وەستا. پیرێژن لێی چووە پێشەوە، بە نووکە پێیەك توڕی دایە ئەولاوەو گوێزەکانی خڕکردنەوەو لە بەڕکی خۆی نان.

جووجکە زێڕین ئەنجام هاتە زمان و گوتی:- دایکە ئەوڕۆکە خراپ گۆڕاوی، دەڵێی شەیتان چووەتە بن کلێشەتەوە.

پیرێژن گوتی:- دەمت داخە!... تەواو شووڵت لێهەڵکێشاوە، یەك جارم گوت ڕازی نیم گوێزی من بخۆی و بڕایەوە، دەمەوێ بیان فرۆشم.

جووجکە زێڕین سەری داخست، چوو لە بن دارگوێزەکە هەڵنیشت. پیرێژن چووە ژوورەوە. جووجکەکە پاش ماوەیەکی کەم هەستاو بە دارەکەی گوت:- هاوڕێ درەخت، یەکدوو گوێزی دی بەر بدەرەوە با بزانم ئەمجارە چۆن دەبێ. ئەوڕۆکە قاوڵتییەکەمان لێبوو بە ژەهری مار.

درەختەکە لقێکی دیکەی پڕی بزواند، چەند گوێزێك بەربوونەوە. جووجکەکە بە پەلە غاری دا، شکاندنی و خواردنی. پیرێژن گەییە سەری و تێی خوڕی:- ئەهای سیسەمارە! نووکە پێت نیشان دەدەم کە چۆن گوێزی من دەخۆی.

پیرێـژن ئەمەی گوت و چوو مەقەڵی هەڵایساند. ئەوجا هات جووجکە زێڕینی گرت و بردییە سەر مەقەڵیەکەو پاشەڵی نا بە پشکۆکانەوە. پاشەڵی جووجکە زێڕین بە چزە چز سووتا. دار گوێزەکە بە توندی لەرییەوەو گوێزەکان کەوتن بەسەر کەللەی پیرێژنداو زامداریان کرد. پیرێژن لە تاوا جووجکەکەی بەرەڵلا کرد، بەڵام کە دەستی دایە گوێزەکان تا خڕیان بکاتەوە، سەیری کرد گوێز نین و بەردن. سەیرێکی درەختەکەو جووجکەکەی کردو چوو لە ژوورێدا دانیشت.

جوووجکەکە لە سووچێکی حەوشەکەدا کزکۆڵەی کردبوو، سەری دەبن باڵی نابوو، جار جاریێ سەری لە بن باڵی دەردێناو سەیرێکی پاشەڵە سووتاوەکەی دەکردو بە نووکی باڵەکانی فرمێسکەکانی دەسڕی و ئەوجا دەچۆوە قاوغەکەی خۆی. پیرێـژن چاوی لە جووجکە زێڕینی نەدەگواستەوە.

دەوروبەری نیوەڕۆ با هەڵی کرد، گوێز هەڵوەرین. جووجکە لە جێی خۆی نەبزووت. دیسان با گوێزی دی تەکاند. جووجکە زێـڕین چوو بووە قاوغی خۆی و نەدەبزووت. تاکو عەسر هێندە گوێز بەر بووەوە کە حەوشەکە پڕ بوو. پیرێژن چاوی بڕی بووە جووجکە زێڕین و جگە لەو چی دی نەدەبینی. لە پڕ گوێی بە دەنگیێ زرینگایەوە دەیگوت:– دەك بتڕژەم پیرێـژن، باس جووجکە زەردەت سندم کرد. ئیدی ماتەڵی چیت؟ ڕابە هەڕۆ گوێزەکانت بفرۆشە. وا رۆژئاوایەو تۆ هێشتا نانێکت پەیدا نەکردووە.

پیرێژن ئاوڕی دایەوە. سەیری کرد جاڵجاڵۆکەیەکی درشت خەریکە لە رەفەکەوە دادەگەڕیێ. تاکە پێڵاوێکی لە کن بوو، هەڵی گرت و سرەواندییە جاڵجاڵۆکەکە. پاش تۆزێك تەنیا لیقاوی جاڵجاڵۆکەکە بە دیوارەکەوە مابوو. ئەوجا پیرێـژن بە چمکی عەباکەی فرمێسکی چاوەکانی سڕی، هەستا، چووە کن جووجکەکەو پێی گوت:– جووجکە زێڕینی نازدارم، گوێز رژاونەتە ژێر دەست و پێت، ناخۆی؟

جووجکە زێڕین بێئەوەی سەر هەڵبڕیێ گوتی:– وازم لێبێنە پیرێـژن. هەروا زوو بیرت چووەوە کە داغت کردم؟

پیرێژن دەستی بەسەر جووجکە زێڕیندا هێناو گوتی:– جووجکە نازدارو میهرەبانەکەم گوێز رژاونەتە ژێر دەست و پێت ناخۆی؟ جووجکە زێـڕین ئەمجارە سەری هەڵبڕی و روانییە سەروچاوی پیرێـژن و سەیری کرد ئەو چاوە میهرەبانە، ئەو رووە خۆش و دەم و لەبزە شیرینەی جاران گەڕاونەتەوە. گوتی:– بۆ نەء . دایکە گیان تۆش مەڵحەم لە برینەکەم دەدەی؟

پیرێژن گوتی:– بەسەرچاو جووجکە نازدارو میهرەبانەکەم. ڕابە بچینە ژوورەوە.

***

ئەو شەوە شیوی پیرێـژن و جووجکە زێـڕین کاکڵە گوێزی خالیسە بوو. بەیانیش پیرێـژن هەستاو هەرچی داوی جاڵجاڵۆکە لە کون و قوژبنەکاندا هەبوو، هەمووی پاك کردنەوەو فڕێی دان.

## ( دوو پشیله )

شەوێکی هاوین بوو، مانگ بە دەرەوە نەبوو. ئەستێران هەڵ نەهاتبوون. دنیا تاریک تاریک بوو. نیوە شەو بوو. جگە لە زیکە زیکی سیسرکان چ دەنگێکی دی نەبوو. پشیلەیەکی ڕەش لەو سەری دیوارەکەوە سەری داخستبوو، بەدەم موشە موشەوە هێدی هێدی دەهات. پشیلەیەکی سپیش لەم سەری دیوارەکەوە سەری داخستبوو، بە دەم بۆن کردنەوە سەلأنە سەلأنە دەهات.

هەر هاتن و هاتن، لە ناوەڕاستی دیوارەکەدا تەقین بەڕووی یەکدی دا. هەر یەکەیان مرەمرێکی کردو بستێك کشایەوە. ئەوجا هەڵتووتان و چاویان بڕییە ناو چاوی یەکدی. نێوانیان لە دوو بستان زێتر نەبوو. دڵی هەردووکیان خێرا خێرا لێی دەدا.

تۆزێك بەو دەقەوە مانەوە و هیچیان نەگوت. کەمێك جولأن. ئاخری پشیلە ڕەشەکە هاتەبەرەوە. پشیلە سپیش بۆی جولأو بە توندی وتی:– مڕ میاوو! مڕ میاوو!.. نەیەیتە پێشەوە!..

پشیلە ڕەش گوێی نەدایێ، هاتە پێشترەوە، لە بن لێوانەوە دەی پرتاند. نێوانیان بوو بوو بەیەك بست. پشیلە ڕەشەکە هەر دەهاتە پێشترەوە. پشە سپی نەیکردە نامەردی، چەپۆکێکی کێشا بە پشە ڕەشا و گوێی هەڵدڕی، ئەوجا قیژاندی:– مڕ میاوو.. مڕ میاوو!.. کەر پیاو نەمگوت نەیەیتە پێشێ؟

پشیلە ڕەشیش قیژاندی:– مڕ میاوو..

بەڵام نەیتوانی ڕەقیبەکەی بریندار بکا، زۆر توڕە بوو. کەمێك کشایەوە و هەستایە سەر پێ و گوتی:– میاوو!.. ڕێم کە با بڕۆم.. دەنا ئۆباڵت بە ملی خۆت!

پشیلە سپی لە قاقای پێکەنینی دا، سمێلەکانی لستەوەو گوتی:– چەند قسەی سەیر دەکەی! ڕێت بدەم بڕۆی؟ ئەگەر ڕێ دان کارێکی چاکە، بۆ تۆ ڕێی من نادەی تا بڕۆم بۆ ئەو سەری دیوارەکە؟

پشیلە ڕەش گوتی:– پێم گوتیت ڕێم بدە با ڕەتبم پاشان تۆش ملی خۆت بشکێنەو کێوە دەچی بچوو.

پشیلە سپی بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:– ئەگەر ئەمجارە بە گوێم نەکەی دەتکەم بەیەك پاروو.

پشیلە ڕەش تورە بوو، لە پڕ یەك بەخۆی قیژاندی:– میاوو!.. بگەڕێوە بچۆ سەربان، ڕێگام بکە مشکە تۆپیو!.. پشیلە سپی تووڕە بوو، لە پێکەنین کەوت، دەنگی کەوتە لەرزین، لە ناخەوە هاوارێکی کرد:– میاوو! وتت مشکە..؟ کەر پیاو.. مڕ میاو!.. بگرە!.. مڕ میاو!..

دیسان چەپۆکێکی سرەواندە پشیلە ڕەش. پشیلە ڕەش ئەمجارەیان خۆی لاداو چەپۆکێکی کێشا بە کەپووی پشیلە سپی دا، زامداری کرد. خوێن فیچقەی کرد. ئیدی پشیلە سپی بە کەس بەند نەدەبوو. پشتی کووڕ کردەوە. تووکەکانی ڕەپ ڕاوەستان. بەجۆرێ دەیقیژاند کە هەموو سیسرکەکان کڕو بێدەنگ بوون.

گوڵێکی سوور کە لە پشکوتن دابوو، بە نیوەچڵی مایەوە.

ئەستێرەیەکی گەش ڕاخوشی.

ئەمجارە نۆرەی پشیلە ڕەش بوو کە پێبکەنێ و بە پێکەنینەوە وتی:- یەکەم مشك پتر سپی دەبێ تا ڕەش، کەواتە هەر تۆ مشکی. دووەم، هات و هاوار مەکە ئەگینا خەڵکی بێدار دەبنەوە و دێن هەردوکمان دارکاری دەکەن. من بەخۆم لە هەڕو گێف ناترسم و ناش گەڕێمەوە. لێرە دادەنیشم تا تاقەتت دەچێ و بە خۆت دەگەڕێیەوە .پشیلە سپی کەمێ هێور بووەوە و گوتی:- من و تاقەتم بچێ؟! خۆزگە ئەو نیوەڕۆیە لە ئاشخانەکەی ماڵی حەسەن پاچەچیدا دەبوویت و بە چاوی خۆت دەتبینی کە چۆن سێ سەعاتی ڕەبەق چاوم نەتروکاند و بە دیار کونە مشکێکەوە دانیشتم.

پشیلە ڕەش چ قسەیێکی نەکرد، بە هێمنی هەڵتووتابوو و سەیری دەکرد. پشیلە سپیش بە بێدەنگی دانیشت. گریانی منداڵێك بەرز بووەوە، پاشان منداڵەکە کڕبۆوە. دیسان زیکە زیکی سیسرکان دەستی پێکردەوە. پشیلەکان بۆ ماوەی دوو دەقیقە چاویان برییە یەکدی و کەسیان بۆڕیان نەدا، بەلاّم دیاربوو سەبریان سواوە. هەریەکەیان چاوەنۆڕ بوو ئەوی دیکەیان دەست بە قسان بکا. لە پڕ پشیلە سپی گوتی:- چارەیەکم دۆزییەوە؟

پشیلە رەش گوتی:- چ چارەیەك؟

پشیلە سپی گوتی:- من کاری زەروریم هەیە، زۆر زۆر زەروری، تۆ بگەڕێوەو بچۆ ئەوسەری دیوارەکە تا من رەت دەبم و ئەوجا تۆ برۆ.

پشیلە ڕەش پێکەنی و گوتی:- بە ڕاستی چارەیە! من کارێکم هەیە یەکجار زەروری و فەوری، ناتوانم یەك سانییە دوای بخەم.

پشیلە سپی بەخەمبارییەوە گوتی:- دیسان ناتەوێ بسازێین! پێم گوتیت کاری زەروریم هەیە، بڕوا بکە و ڕێگام بدە!..

پشیلە ڕەش بە دەنگی بەرز گوتی:- میاوو! چما تۆ چی منی تا ئەمرم بەسەرا بکەی؟ قسەی خۆت بزانە!..

پشیلە سپی جما. هەڵستا و نەڕاندی:- میاوو.. من قسەی خۆم دەزانم، تۆ پشیلەیەکی منجڕو سەر بزێوی، من دەبێ بچم بۆ ماڵی حەسەن پاچەچی، بۆنی کەللەپاچەم کردووە، ئێستا باوەڕ ناکەی کە چ کارێکی زەروریم هەیە.؟

پشیلە رەش جماو گوتی:- میاوو!.. چما من پیاز پاك دەکەم. بە خۆڕایی بەسەر دیواری خەڵکی کەوتووم؟ منیش لەو لایەوە بۆنی قاورمەم کردووەو زۆریشم برسییە، ئەگەر ڕێم نەدەی وات پێدا دەکێشم کە گل بییەوەو مێشکت داغان بێ.

پشیلە سپی دەهری بوو قیژاندی:- میاوو.. لاکەوە کەر پیاو، رێم بدە،.. مڕ میاوو.. بگرە!..

لەپڕ چنگی لە تووکی سەری پشیلە ڕەش گیر کردو تووك چوون بە حەوادا. هەردوو دەستیان بە مڕە مڕ کردو کەوتنە گیانی یەکدی و بە جنێوو قسەی ناشیرین تێك بەربوون.

پشیلەکان لە گەرمەی شەڕێدا بوون کە یەکێك لە خوارەوە جامێ ئاوی ساردی پێداکردن. هەردوو شپرزە بوون، بە خێرایی گەڕانەوەو قوچاندیان. هەریەکەو بەڕێی خۆیدا گەڕایەوەو هەر ئاوڕیشی نەدایەوە.

## ٢٤ سەعات

## لە نێوان خەوو بێداری دا

خوێنەری ئازیز

چیرۆکی (خەوو بێداریم) بۆوە نە نووسیووە کە ببێ بە سەر مەشقی تۆ. مەبەستم ئەمەیە کە مندالأنی ولأتەکەی خۆت چاتر بناسیو بیر لەوە بکەیەوە کە ئاخۆ چاری دەردیان چییە؟

گەر بمەوێ هەموو ئەوەی لە تارانا بە سەرم هاتووە بنووسمەوە ئەوا چەند کتێبێکی لێ دەردەچێو لەوەیە هەمووتان ماندووو بێزار بکا. بۆیە تەنیا دوا بیستو چوار سەعاتیتان بۆ دەگێڕمەوە کە پێم وایە بێزار کەر نەبێ. هەڵبەتە ناچارم ئەمەش باس بکەم کە چۆن بوو منو بابم هاتینە تارانێ.

بابم چەند مانگێك بوو بێکار بوو. ئان ئاخری داکمو خوشکەکەمو براکانمی لە شارەکەی خۆماندا بەجێ هێشتنو دەستی منی گرتو هاتینە تارانێ. چەند ئاشناو هاوشارییەکمان پێشتر هاتبوونە تارانێو توانی بوویان کار پەیدابکەن. ئێمەش بە خۆشی وانەوە هاتین. یەکێك لەو ئاشنایانەمان دوکانۆچکەیەکی سەهۆڵ فرۆشی هەبوو. یەکێکی دی جلوبەرگی کۆنی دەکڕیو دەفرۆشتەوە.

یەکێکی دی پرتەقاڵ فرۆش بوو. بابی منیش عەرەبانەیەکی دەستی پەیدا کردو بووە دەست فرۆش. پیوازو پەتاتەو ئاروو و ئەم جۆرە شتانەی دەگێڕا.. ئیدی پارووە نانێکمان بۆ خۆ دەخواردو شتێکیشمان بۆ دایکم دەناردەوە. منیش هەندێجار لەگەڵ بابمدا دەگەڕامو هەندێ جاریش بە تەنێ دەکەوتمە نێو شەقامەکانو درەنگە شەوانێ دەهاتمەوە بۆ کن بابم. هەندێ جاریش بنێشت یان بلیتی یانەسیبو ئەم شتانم دەفرۆشت.

ئێستا با بێینە سەر ڕاستە بابەتەکە.

ئەو شەوە من، قاسم، کوڕەکەی زێوەری بلیت فرۆش، ئەحمەد حسێنو دوو کەسی دی بووین کە بەر لە سەعاتێك لەبەر بانقدا بوو بوون بە دۆستمان.

ئێمە چوار قوڵی لەسەر سەکۆکەی بەر بانقدا دانیشتبووینو باسی ئەوەمان دەکرد کە لە کوێندەر گەمەی زارێن بکەین، ئەوانیش هاتن بە سەراو لە کنمان ڕۆنیشتن. هەردووکیان لە ئێمە گەورەتر بوون. یەکێکیان چاوێکی کوێر بوو. ئەوی دیکەیان جووتێ پێڵاوی رەشی نوێی لە پێدا بوو. بەڵام لینگێکی پانتۆڵەکەی لەسەر چۆکیەوە دڕابوو، کەشکەژنۆ رەقو چڵکنەکەی بەدەرەوە بوو، لە ئێمە پەرپوت و شڕۆڵەتر بوو. هەر چوارمان کەوتینە دزە نیگاکردنی پێڵاوەکانی. ئەوجا روانیمانە یەکدی. بە چاو بە یەکدیمان گوت ئەهای کوڕینە وریابن، ئەم کوڕە پێڵاو دزە، یارۆ کە دیتی خراپ سەیری دەکەین، گوتی:- ئەوە چییە؟ دەڵێی پێڵاوتان نەدیوە؟

هاوڕێکەی گوتی:- وازیان لێبێنە مەحمود. ئەدی نابینی پێخاوسو لینگ رووت، هەموو لەشیان بە دەرەوەیە؟ بەلەنگازانە پێڵاویان لە کوێ دیتوە.

مەحمود گوتی:- سەڵا لە ئەقڵی من، پێیە خاوسەکانیان هاوار دەکاو کەچی دەپرسم دەڵێی پێڵاوتان نەدیوە.

هاوڕێ، یەك چاوەکەی گوتی:- خۆ هەموو کەس وەکو تۆ کوڕە ئاغا نییە تا بابی وەکو خۆڵ پارە هەڵڕێژێ و پێڵاوی نوێ بۆ منالەکانی بکڕێ. ئەوجا هەردووکیان حیلکە حیلك کەوتنە پێکەنین. ئێمە هەر چوارمان دامابووین. ئەحمەد حوسێن سەیرێکی کوڕەکەی زێوەری کرد، ئەوجا هەردووکیان سەیری قاسمیان کرد، پاشان هەرسێکیان روانیانە من، چی بکەین؟ بە شەڕ بێین یا وازیان لێبێنین حیلکە حیلك پێبکەنن و پێمان ڕابوێرن؟

من بە دەنگی بەرز بە مەحمودم گوت:- تۆ دزیت... ئەو پێڵاوانەت دزیوە! هەردووکیان لە قاقای پێکەنینیان دا. کوێرەکەیان ئانیشکی دەژەنییە قەبرغەی ئەوی تریانەوەو دەیگوت: - نەمگوت مەحمود؟.. هاها!... نەمگوت؟.. ها.. ها.. ها!..

ترومبێلی ڕەنگاو ڕەنگ لە قەراغ شەقامەکەوە بەڕیز وەستابوون. ئەوەندە بە پاڵ یەکەوە بوون دەتگوت دیوارێکی ئاسنیان لە بەردەممان‌دا دروست کردبوو. ئەو ترومبێلە سورەی کە ڕێك لە بەردەم منا وەستابوو، ڕۆیی و کەلێنێك کەوتە دیوارە ئاسنەکەوەو شەقامەکەم لێدەرکەوت.

تاکسی و خسوسی و پاس شەقامەکەیان پڕ کردبوو. هەموو بە خاوی و بەدووی یەکا دەڕۆیشتن و کردبوویان بە هەنگامە. دەتگوت پاڵ بەیەکەوە دەنێن، دەچوونە پێشێ و بۆلەبۆڵیان بەسەر یەکا دەکرد.

بەلای منەوە تاران قەرەباڵخ ترین شوێنی دنیایەو ئەم شەقامەش قەرەباڵغترین شوێنی تارانە.

کوێرەو مەحمودی هاوڕێی خەریك بوو لەبەر پێکەنین دەبورانەوە. خوا خوام بوو ببێ بەشەڕ، جنێوێکی تازە فێر بوو بووم و دەمویست هەر چۆنێ بووە ئەو جنێوە بە یەکێك بدەم. لەبەر خۆوە دەمگوت بریا مەحمود بە بناگوێما بکێشێت و ئەوجا من تورە دەبم و پێی دەڵێم:- دەست لەمن دەکەیەوە؟ هەنووکە بە چەقۆ گونت دەبڕم ئەوە منو...! مەحمود لە کنمەوە دانیشتبوو. هەر بەو نیازەوە یەخەیم گرت و گوتم:- ئەگەر دز نیت پێم بڵێ بزانم کێ ئەو پێڵاوانەی بۆ کڕیوی؟

لە پێکەنین کەوتن. مەحمود بە توندی دەستی دامە دواوەو گوتی:- دانیشە هەتیو. ئاگات لە دەمی خۆتە؟

کوێرە کەوتە بەینماوەو نەیهێشت شەڕەکەمان بکەین بەڕاست. گوتی:- وازی لێبێنە مەحمود، بەمشەوە شەڕ مەنێوە با خۆشی پێکەنینەکەمان لە کیس نەچێ.

ئێمە هەر چوارمان نیازی شەڕمان هەبوو، بەڵام مەحمود و هاوڕێکەی بەڕاستی دەیانویست ڕابوێرن و پێبکەنن.

مەحمود پێی گوتم:- کاکە ئێمە ئەوشۆ نیازی شەڕمان نییە. ئەگەر ئەنگۆ حەزو لە شەڕە با هەڵیبگرین بۆ سبەی شەو.

کوێرە گوتی:- ئێمە دەمانەوێ ئەوشۆ هەندێ پێبکەنین. باشە؟ من گوتم: باشە.

ترومبێلێکی خسوسی بریقەدار هاتو لە پاڵ شۆستەکەداو لە بەردەم ئێمەدا وەستاو شوێنە چۆڵەکەی پڕ کردەوە. ژن و مێردێکی گەنج و کوڕێك و تولەیەکی سپی خاوێن لە ترومبێلەکە دابەزین.

کوڕەکە هەر بە قەد ئەحمەد حوسێن دەبوو. پانتۆڵێکی کوڵی لەبەردا بوو، جووتێ گۆرەوی سپی و جووتێ سەندەڵی دوو ڕەنگی لە پێدابوو. قژی شانەکرابوو، ڕۆنی لێدا بوو، عەینەکێکی سپی بە دەستەوە بوو، دەستەکەی دیکەی بەدەستی باببیەوە بوو. زنجیری تولە سەگەکە بە دەست ژنەکەوە بوو. بازووو پاوپوزی ڕووت، جووتێ پێڵاوی پاژنە بەرزی لە پێدابوو، کە بەکن ئێمەدا ڕەت بوو بۆنێکی خۆشمان بەسەردا هات. قاسم توێخێ پێستی لە بنی پێی خۆی کردەوەو ڕێك کێشای بە پشتی ملی کوڕەکەدا. کوڕەکە گەڕایەوە، تەماشایەکی کردین و گوتی: — بێ تەربێتانە!..

ئەحمەد حوسێن بەرقەوە گوتی:— هەی دێ بە. کوڕی ژن!..

منیش ئەمەم بە هەل زانی و هەڵم دایێ:— هەنووکە بە چەقۆ گونت لەبنا دەبڕم.

هاوڕێکانم تێکڕا لە قاقای پێکەنینیان دا. بابەکەی دەستی کوڕەکەی ڕاکێشاو چوونە ئوتێلێکی ئەو لای ئێمەوە.

دیسان هەموو کەوتینە تەماشا کردنی پێڵاوە نوێیەکانی مەحمود. مەحمو بە هێوری و دۆستانە گوتی:— کوڕینە من پێڵاوم زۆر بەلاوە مەبەست نییە، کێ دڵی پێوەیە با بۆ خۆی بێ.

ئەوجا رووی کردە ئەحمەد حوسێن و گوتی:— وەرە، کوڕکۆ، وەرە دایان بکەنە بۆ خۆت.

ئەحمەد حوسێن بە دوو دڵییەوە ڕوانییە پێڵاوەکانی مەحمودو لە جێی خۆی نەبزووت.

مەحمود گوتی:— ماتەڵی چیت؟ پێڵاوی نوێت ناوێ؟ دە وەرە بیبە.

ئەحمەد حوسێن هەستا، چوو لەبەردەم مەحمودا دانەوییەوە تا پێڵاوەکانی لە پێ دابکەنی. ئێمەش هەرسێکمان بە بێدەنگی سەیرمان دەکرد. ئەحمەد حوسێن گرتی بە پێی مەحموداو تا هێزی تێدابوو ڕایکێشا. لە پڕ دەستەکانی خزین و بە پشتا کەوتە سەر شۆستەکە. مەحمودو کوێرەی هاوڕێی بە جۆرێ لە قاقای پێکەنینیان دا لە دڵی خۆمدا گوتم:— هەر ئێستا ژان دەکەن. دەستی ئەحمەد حوسێن ڕەش بوو بوون. کوێرە لێکدا لێکدا بە خالیگەی مەحمودیا دەژەن و دەیگوت:— پێم نەگوتیت مەحمود؟ ها ها.. ها!.. نەمگۆ!... ها.. ها.

جێ قامکی ئەحمەد حوسێن بەسەر پێی مەحمودەوە نەخش بوو بوون. تازە بۆمان دەرکەوت کە کڵاومان کراوەتە سەر. پێکەنینی ئەو دوو برادەرە فێڵبازە سیرایەتی کردو ئێمەشی گرتەوە. ئێمەش لە قاقای پێکەنینمان دا. ئەحمەد حوسێنش کە بە هەزار ناری عەلی لە ژێر پێی ڕەوتەنیاندا هەستا بۆوە، قەدەرێ سەیری کردین و دەستی بە پێکەنینێ کرد. پێکەنین بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەی باشە !

خەڵکانی سەر شۆستەکە تەماشایان دەکردین و ڕەت دەبوون. من دانەوییمەوە و لە نزیکەوە ڕوانیمە پێی مەحمود. پێڵاوی چی! تومەز مەحمود پێیەکانی بە جۆرێ بۆیاخ کردبوون. لە مرۆڤ وایە پێڵاوی نوێی ڕەشی لە پێدایە. حیلەیەکی سەیر بوو!

***

مەحمود گوتی با هەر شەشمان زارێن بکەین. من چوار قڕانم پێ بوو. قاسم نەیگوت چەندی پێیە. ئەو دوو برادەرەش پێنج قڕانیان پێ بوو. کوڕەکەی زێوەری بلیت فرۆش تمەنێکی پێ بوو. ئەحمەد حوسێن پارەی هەر نەبوو. موغازەیەکی داخراو لە خوارمانەوە بوو. خۆمان گەیاندە وێندەرو کەوتینە زار هەڵدانێ. تەڕو وشکمان کرد، یەکەم کەس کوڕەکەی زێوەر دەرچوو. زاری هەڵدا.، پێنجی هێنا، نۆرە هاتە سەر قاسم، زاری هەڵدا، شەشی هێنا، قڕانێکی لە کوڕەکەی زێوەر بردەوە. هەمدیس زاری هەڵدا، ئەمجارە دووی هێنا، زارەکەی دایە مەحمود، مەحمود چواری هێنابوو، دوو قڕانی لە قاسم بردەوەو بە خۆشییەوە دەستەکانی پێکدادان و گوتی: — بەرەکەتی بابەیە. بەختمان هەستاوە.

بەمجۆرە دوو بە دوو زارمان هەڵدەداو گەمەمان دەکرد. دوو کوڕی گەنجی پۆشتەو پەرداغ لە دەستە راستەوە دەهاتن. ئەحمەد حوسێن غاری دایە پێشیان و کەوتە پاڕانەوە:— قڕانێك.. کاکە گیان یەك قڕان.. توخوا!..

یەکێك لە کوڕەکان دەستێکی بە ئەحمەد حسێندا کێشاو دووری خستەوە. ئەحمەد حسێن دەسبەردار نەبوو. پێشی لێگرتنەوەو پاڕایەوە:— کاکە قڕانێکم بدەیە..هەر یەك قڕان. توخوا!.

کە گەیینە ئاستی ئێمە. یەکێك لە کوڕەکان پشتی ملی ئەحمەد حوسێنی گرت و بەرزی کردەوەو لەسەر سك خستییە سەر موحەجەرەکەی کەنار شەقامەکە. سەری ئەحمەد حوسێن بەرەو شەقامەکە بوو، لاقی بەرەو شۆستەکە. ئەحمەد حوسێن بە لەقەفرتێ لاقەکانی گەیاندنە عاردی و لە شوێنی خۆیدا وەستا. دوو کیژۆڵەی ناسك و کوڕێکی مێرمنداڵ بە دەم پێکەنینەوە لە دەستە چەپەوە دەهاتن. کچەکان بە تەنورەی کورتی جوانەوە لەم شان و لەو شانی کوڕەکە دەڕۆشتن.

ئەحمەد حوسێن بەردەمی لێگرتن و رووی کردە کچێکیان:— خانم گیان قڕانێکم بدەیێ... برسیمە.. هەر یەك قڕان.. توخوا! خانم گیان قڕانێ..

کچە گوێی نەدایێ. ئەحمەد حوسێن دەست بەردار نەبوو. کچەکە پارەیەکی لە جانتاکەی دەرهێناو خستیە دەستی ئەحمەد حوسێنەوە.

ئەحمەد حوسێن بە شادییەوە گەڕایەوە کن ئێمەو گوتی:— منیش دەیکەم، کوڕەکەی زێوەر گوتی:— پارەت کوا؟

ئەحمەد حوسێن دەستی کردەوەو پارچە دراوەکەی نیشان دا، دوو قڕانیەکی لە دەستابوو.

قاسم گوتی:— دیسان سواڵت کردووە؟

ویستی لە ئەحمەد حوسێن بدا، بەڵام مەحمود دەستی گرت و نەیهێشت. ئەحمەد حوسێن هیچی نەگوت:— جێگای خۆی کردەوەو دانیشت. من هەستام و گوتم:— من لەگەڵ دەرۆزەکەرانا وازی ناکەم.

یەك قڕانم پێ مابوو. سێ قڕانم دۆڕاندبوو. مەحمودیش کە دۆڕابوو گوتی:— زارێن بەسە. چاڵێن دەکەین.

قاسم پێی گوتم:– لەتیف، دیسان وازیەکەمان لێتێك مەدە. ئەوجا ڕووی کردە هەمووان. کێ زار هەڵدەدا ؟

کوێرە گوتی:– بۆ خۆت بەتەنێ گەمان بکە، ئێمە چاڵێن دەکەین.

کوڕەکەی زێوەر ئاماژەی بۆ لای قاسم کردو گوتی:– زارێن لەگەڵ ئەمەدا بێ سوودە. دایمە پێنج و شەش دێنێ. شێرو خەت دەکەین.

ئەحمەد حوسێن گوتی:– باشە

مەحمود گوتی:– نەء . چاڵێن.

شەقامەکە وردە وردە چۆڵ دەبوو. چەند موغازەیەکی بەرانبەرمان داخرابوون. بۆ دەست پێکردنی یارییەکە هەریەکەمان لە قەراغ شۆستەکەوە یەك قڕانییەکمان بۆ بن دیوارەکە هەڵدا. هێشتا پارەکان لەبن دیوارەکەدا بوون کە ئەحمەد حوسێن یەك بەخۆی هاواری کرد:– ئینزیبات!....

کابرای ئینزیبات دۆنکی بە دەست، یەکدوو شەقاوێکی مابوو بۆ ئێمە.

من و ئەحمەد حوسێن و کوێرە هەڵاتین. مەحمودو کوڕەکەی زێوەریش بە دوای ئێمە کەوتن. قاسم دەیویست پارەکان کۆ بکاتەوە کە ئینزیباتەکە گەییە سەری و دۆنکییەکی گەیاندێ. قاسم هاوارێکی کردو خێرا هەڵات. ئێنزیباتەکە لە دواوە هاواری کرد:– خوێڕیانەی قوماربازینە! ئەوە ماڵە بابتان کوێر بوویتەوە؟ دایك و بابتان نییە؟

ئەوجا پارەکانی خڕکردەوەو کەوتەڕێ.

کە لە چوار ڕیان ڕەت بووم، سەیرم کرد هەر خۆم ماومەتەوە. کەبابخانەکەی ئەو بەری شەقامەکە داخرابوو. دیاربوو درەنگم بەسەر هاتبوو. چونکە هەموو ڕۆژێك لەو دەمانەدا شاگردە کەبابچییەکە دەرابەکەی تا نیوە دادەدایەوە، دەبوایە بگەمەوە کن بابم.

بەپەلە شەقام و فولکەکانم دەبڕی و لە دڵی خۆدا دەمگۆ:– هەنووکە بابم نووستووە. بریا نەنووستبێ و چاوەنۆڕم بێ.. نووکە ئەسەح نووستووە. ئەوجا لەبەر خۆوە گوتم:– ئەدی موغازەی ئەسباب وازیەکان؟! ئەویش داخراوە. کێ بەم شەوە تاقەتی کڕینی ئەسباب وازی و ئەو شتانەی هەیە؟.. بێگومان نووکە وشترەکەی منیشیان خستووەتە موغازەکەوەو دەرگەیان داخستووەو ڕۆیشتوون. بریا توانیبام چەند قسەیەکم دەگەڵ وشترەکەم کردبا. دەترسم قەرارەکەی دوێنێ شەومانی لە بیرچووبێ، باشە ئەگەر نەیەت؟.. نا، هەر دێت. بەخۆی پێی گوتم سبەی شەو دێم و سوارم دەبی و دەچین پیاسەی تارانێ دەکەین. کە وشتر سواریش خۆشە!..

لە پڕ، لەگەڵ جیڕەی ئستۆپی ترومبێلێکدا چووم بە حەوادا.

وامزانی تەشریفم بردووەتە گەڕانێ. وەختێ کەوتمەوە سەر زەوی ئەوجا زانیم ترومبێلێکی خسوسی لە ناوەندی شەقامەکەدا لێی داوم، بەڵام هیچم لێنەهاتووە.

خەریك بووم مەچەکم دەشێلا کە یەکێك لە نێو ترومبێلەکەوە سەری دەرێناو بە تووڕەییەوە: –دەلاکەوە هەتیو.. خۆ بت نیت.

کتوپڕ هاتمەوە سەرخۆ. پیرێژنێکی مکیاج کردوو لە پشت سووکانەکەوە دانیشتبوو، سەگێکی گەورەش لە تەنیشتییەوە هەڵتوتا بوو، سەیری دەرێی دەکرد. قرێتەی ملی سەگەکە بریقە بریق دەبریقایەوە. لە پڕ شتێك بە مێشکمدا هات کە ئەگەر کارێ نەکەم، مەسەلەن ئەگەر جامی ترومبێلەکە نەشکێنم لە داخا شەق دەبەمو ناتوانم لە جێی خۆم ببزوێم.

پیرێژنەکە یەك دوو هۆڕنی لێداو گوتی:- ئەوە کەڕی، دەلاکەوە لەبەر ترومبێلەکە.

یەك دوو ترومبێلی دی بە تەنیشتمانا ڕەت بوون. پیرێژنەکە سەری هێنا دەرێ تا شتێك بڵێ. منیش بێ سێ و دوو تفێکی هۆقەییم کردە چارەی، چەند جنێوێکی سەر بە کوڵکەم پێداو خێرا دوور کەوتمەوە.

پاش کەمێ ڕێ کردن لەبەر موغازەیەکی داخراوا ڕۆنیشتم. دڵم ترپە ترپ لێی دەدا.

موغازەکە دەڕابەیەکی ئاسنی کون کونی پێوە بوو. ناو موغازەکە ڕووناك بوو. پێڵاوی هەمە جۆر لە پشت جامخانەکەیەوە ریزکرابوون.

ڕۆژێکیان بابم دەیگوت:- ئێمەمانان بە پارەی دە ڕۆژانش جووتێ لەم پێڵاوانەمان بۆ لە کڕین نایێ.

سەرم نا بە دەڕابەکەوەو لاقەکانم درێژ کردن. مەچەکم هێشتا دەیەشا. دڵم دەلەرزی. بیرم کەوتەوە کە هێشتا نانم نەخواردووە.

لە دڵی خۆمدا گوتم:- ئەوشۆش دەبێ بەبێ شیو سەر بنێمەوە، بریا بابم شتێکی بۆ دانابام..

کوتوپڕ بیرم کەوتەوە ئەوشۆ وشترەکەم دێ، سواری دەبمو دەچینە گەڕانێ. هەر هەستامو بەپەلە کەوتمە ڕێ. موغازەی (لەعابە) فرۆشیەکە داخرابوو، بەڵام دەنگە دەنگی ئەسباب وازیەکان لە پشت دەڕابە ئاسنەکەوە دەهات. قیتارە بارکێشەکە بەدەم شووت لێدانەوە تاق تریقی بوو. ورچێکی زەبەلاحی ڕەش وەك بڵێی لە پشت ڕەشاشێکەوە دانیشتبوو. لێکدا لێکدا فیشەکانی دەتەقاندو بووکە قشتیلەو جوانەکانی دەترساند. مەیموونەکان کەوتبوونە بازبازێن و لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ خۆیان هەڵدەدا. هەندێجاریش خۆیان بە کلکی وشترەکەوە هەڵدەواسی، ئەویش یەك بە خۆی دیقیژاندو جنێوی سەر بە کۆڵکەی پێدەدان. کەرێکیش ددانەکانی لێکدی دەسووو دەزەڕی و بێچووە ورچ و بووکە شوشەکانی سواری خۆ دەکرد و بە لۆقە دەسوڕایەوە. وشترەکە گوێی بۆ چرکە چرکی سەعاتێکی چاڵمە هەڵخستبوو، وەك بڵێی وەعدی لەگەڵ یەکێکدا هەبێ.

فڕۆکەو هەلیکۆپتەرەکان بە ئاسماندا دەسوڕانەوە. کیسەڵەکان چوو بوونە قاوغەکانیانەوەو وەنەوزیان دەدا. دێڵە سەگەکان گوجیلەکانیان شیر دەدا. پشیلە هێلکەی لە ژێر سەبەتەوە دەدەزی.

کەروێشکەکان بە سەرسامی دەیان ڕوانییە ڕاوچییەکەی بەرانبەریان.

مەیمونێکی ڕەش میلۆدیکاکەی منی، کە هەمیشە لە پشت جامخانەکەدا بوو، خێرا خێرا بە دەمیا دەهێناو ئاوازی ناسك و هەمە جۆری لێدەدا. پاس و تاکسی بووکەکانیان سوار کردبوو و دەیانگێڕان. تانك و تفەنگ و دەمانچەو ڕەشاشەکان لێکدا لێدا تەقەیان دەکرد.

بێچووه کەروێشکەکان خرمە خرم گێزەری ئەستووریان دادەمرکاند... لە هەموو گرینگتر وشترەکەی من بوو، هەرکە دەجوولا هەموو شتەکان بەسەر یەکا دەکەوتن. ئەوەندە زەلام بوو لە پشت جامخانەکەوە جێی نەدەبووەوە. لە سبیانێوە تا ئێواریٚ لە قەراغ شۆستەکە دەوەستاو سەیری خەڵکی دەکرد. ئێستا لە ناوەندەی موغازەکەدا وەستا بوو. ملی بادەداو زەنگۆڵەکەی دەکەوتە زرینگە زرینگ. بنێشتی دەجوو و گوێی بۆ چرکە چرکی سەعاتەکە هەڵخستبوو.رێزێك بێچووە وشتری سپی پەیتا پەیتا هاواریان دەکرد:- دایکە ئەگەر چوویتە دەریٚ ئێمەش لەگەڵتا دێین. باشە؟

ویستم دوو قسان دەگەڵ وشترەکەمدا بکەم کەچی هەر چەندم هاوار کرد گوێی لە دەنگم نەبوو. ناچار چەند لەقەیەکم بە دەرابەکەدا کێشا تا ئەوانی دی بێدەنگ بن. بەڵام رێك لەم دەمەدا یەکێك لە پشتەوە گوێی گرتمو گوتی:- ئەوە شێت بووی کوڕك؟ هەرە بنوو.

ئیدی وەستان بێسوود بوو، خۆم لە دەستی ئینزیباتەکە ڕاپسکاندو کەوتمە غاردان تا لەوەی پتر دوا نەکەوم.

کاتیٚ گەییمە نك بابم، هەموو شەقامەکان کپ‌و چۆڵ بوون... تاك‌و تەرا تاکسی دەهات‌و رەت دەبوو. بابم لەسەر عەرەبانەکە نووستبوو، بە جۆریٚ خەوتبوو ئەگەر ویستبام منیش لەسەر عارەبانەکە بنووم دەبوا خەبەری بکەمەوە. تا برێك لاقی هەڵکێشێت‌و جێم بکاتەوە. جگە لە عارەبانەکەی ئێمە، عارەبانەی دیکەش لەو ناوە هەبوون‌و خەڵکانێك لەسەریان خەوتبوون. چەند کەسێکیش لە پەنا دیوارەکان و لەسەر عاردی خەوتبوون. ئێرە چوارڕێیان بوو. یەکیٚ لە هاوشارییەکانی ئێمە لێرەدا دوکانچەیەکی سەهۆڵ فرۆشی هەبوو. لە برساناو لە شەکەتی دا لاکەی سەرم دەهات، لە پاڵ عارەبانەکەی خۆمان‌و لەسەر عاردەکە خەوتم.

***

زرینگ... زرینگ!... زرینگ!...

- ئەهای لەتیف ئەوە لە کوێی؟ بۆ جواب نادەیەوە لەتیف ؟ بۆ نایەی بچینە گەڕانیٚ.

زرینگ.. زرینگ.. زرینگ..

- لەتیف گیان گوێت لێمە؟ من وشترەکەتم هاتووم بچینە گەڕانیٚ، دەی وەرە سوار بە با بڕۆین.

کە وشترەکە گەییە بەر هەیوانەکە من لە نێو جیٚ وەدەرکەوتم‌و خۆم هەڵدایە سەر پشتی‌و بە پێکەنینەوە گوتم:- خۆ من لەسەر پشتی تۆم. ئیدی بۆ هاوار دەکەی؟

وشترەکە بە دیتنم خۆشحاڵ بوو، دەمجایە بنێشتی خستە دەمی خۆی‌و تۆزێکی دایە من‌و کەوتینە ڕیٚ. تازە چەند هەنگاوێك رۆیشتبووین کە وشترەکە گوتی:- میلۆدیکاکەشم بۆ هێناوی، هانیٚ لێی بدە با گویٚ بگرین.

میلۆدیکا جوانەکەم لە وشترەکە وەرگرت‌و بە هەموو هێزمەوە دەستم کرد بە فوو پێداکردنیا. وشترەکەش هاوزەمان لەگەڵ میلۆدیکاکەی منا زەنگۆڵە وردو درشتەکانی دزرینگاندەوە.

وشترەکە ئاوڕی لێدامەوەو گوتی:- لەتیف شیوت خواردووە؟

گوتم:- نەء پارەم نەبوو.

وشترەکە گوتی:- کەواتە با جارێ بڕۆین شیو بخۆین.

لەم کاتەدا کەروێشکێکی سپی لەسەر دارێکەوە خۆی هەڵدایە خوارێ‌و گوتی:- وشتر گیان ئەوشۆ لە ڤیللا شیو دەخۆین، ئەنگۆ هەڕون منیش دەچم بە شوێن ئەوانی دیدا.

کەروێشکەکە سەرە گێزەرێکی بەدەمەوە بوو، تورِی دایە جۆگەکەوەو بە هەڵقون هەڵقون لێمان دوورکەوتەوە.

وشترەکە گوتی:- دەزانی ڤیللا چییە؟

وتم:- وابزانم شتێکە لە بابەتی هاوینەهەوارو سەیرانگا.

وشترەکە گوتی:- هاوینەهەوار نەء ، خەڵکانی ملیۆنێر لە شوێنی سازگارو خۆشاکۆشك‌و تەلاری رازاوەو جوان بۆ خۆ دروست دەکەن‌و بۆ ئیسراحەت‌و رابواردن دەچنە وێندەر. بەم کۆشك‌و تەلارانە دەگوترێ ڤێللا. هەڵبەتە ڤێللا، ئەستێڵ‌و حەوزو نافورەو باخ‌و باخچەی گەورەو پڕ گوڵیشی لە دەورە. تاقمێك باخەوان‌و چێشتچی‌و نۆکەرو کارەکەریشی هەیە. هەندێ لەو ملیۆنێرانە لە هەندەرانیش ڤیللایان هەیە؟ بۆ وێنە لە سویدو فەرەنسا. نووکە ئێمە دەچینە یەکێك لە ڤیللاکانی باکوری تاران تا گەرمای هاوین لە لەشمان دەربکەین.

وشترەکە ئەمەی گوت‌و وەك بڵێی باڵی گرتبێ‌و بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە. خانووی جوان‌و خاوێن لە ژێرمانەوە بوو. ئاسمان ساف‌و بێگەرد بوو. نە بۆنی دووکەڵ دەهات نە بۆنی پیسی. ماڵ‌و کوچەو کۆڵانەکان بە جۆرێ دەیان نواند دەتگوت لە فلیمدا دەیان بینم. ئەنجام بە وشترەکەم گوت:- وشتر، ناشێ لە تاران دەرچووبین!

وشترەکە گوتی:- چۆن ئەم شتەت بە خەیاڵدا هات؟

وتم:- ئاخر بۆنی دووکەڵ‌و پیسی لەم ناوە نایەت، خانووبەرەکان پاك‌و تەمیزو گەورەن، چەشنی چەپکە گوڵن.

وشتر پێکەنی‌و گوتی:- هەقتە لەتیف گیان، تاران دوو بەشەو هەر بەشەی بۆ خۆی شتێکە، باشوورو باکوور، باشوور یەکپارچە دووکەڵ و پیسی‌و گەردو تۆزە. باکوور خاوێن‌و پاك‌و تەمیزە. چونکە هەموو پاسە فریشقەکان لە باشوور کاردەکەن، هەموو کوورەخانەکان لەوێندەرن، هەموو مەکینەو بارکێشەکان لەوێندەر هاتووچۆ دەکەن، زۆربەی کۆڵان‌و شەقامەکانی باشوور قیرتاو نەکراون، هەموو چڵکاوو زێرابەکانی باکوور بەرەو باشوور دەچن. بە کورتی: باشوور گەڕەکی خەڵکانی هەژارو دەست کورت‌و برسییەو باکوور گەڕەکی دەوڵەمەندو داراو پارەدارانە. تۆ قەت لە (حەسیرائاوا)و (نازی ئاوا)و (حاجی عەبدولمەحمود)دا تەلاری دەقاتی مەڕمەڕت دیتووە؟ ئەمانە کۆشك‌و تەلاری بەرزن‌و خوارەوەیان کراوە بە موغازەی ئەو دەوڵەمەنانەی کە مشتەرییەکانیان خاوەنی ترومبێلی کەشخەو توڵە سەگی چەند هەزار تمەنین.

گوتم:- لە دەوروبەری باشووردا ئەم جۆرە شتانە بەرچاو ناکەون، لەوێدا کەس ترومبێلی خسوسی نییە، بەڵام زۆر کەس عارەبانەی دەستییان هەیەو لە کەوێڵاندا دەنوون.

لە برساندا دڵم دەلەرزی. ژێرمان باخێکی گەورە بوو، یەکپارچە گڵۆپی رەنگاو رەنگ، فێنك‌و پڕ گوڵ و درەخت بوو. تەلارێکی گەورە چەشنی چەپکە گوڵ لە ناوەندیا قوت بوو بووەوە. چەند

شەقاوێك لەولایەوە حەوزێكی گەورەی پڕ لە ئاوی زوڵاڵ هەبوو، پڕ بوو لەماسی سوور. مێزو كورسی و گوڵ و شكۆفە دەوری حەوزەكەیان دابوو، هەموو جۆرە خواردەمەنیەك لەسەر مێزەكان ریز كرابوو. بۆنی خواردن مرۆی مەست دەكرد.

وشترەكە گوتی:- با بچینە خواریٚ شیو حازرە.

گوتم:- ئەدی خاوەنی باخەكە لە كوێیە؟

وشترەكە گوتی:- بیری لێمەكەوە، لە ژێر خانەكەدا دەستی بەستراوەتەوەو خەوتووە. وشترەكە لەسەر كاشی رەنگاو رەنگی حەوزەكە وەستاو منیش خۆم هەڵدایە خواریٚ. كەروێشكەكە لەویٚ بوو، دەستی گرتم و بردمی لە پشت یەكێك لە مێزەكانەوە داینیشاندم.

دوای تۆزێك میوان سەری كرایەوە، بووكە شووشە بە ترومبێلی خسوسی، هەندێك بە فڕۆكەو هەلیكۆپتەر، كەر بە لۆقە، كیسەڵان خۆیان بە كلكی بێچووە وشترەكانەوە هەڵواسی بوو، مەیموونەكان بە بازرەقەو كەرۆێشكەكان بە هەڵقون هەڵقون گەیینە جیٚ. میوانیەكی سەیرو قەرەباڵغ بوو. بۆنی خواردن ئاوی دەزایاندە دەمی مرۆڤ.

قەلەمونی سوورەوە كراو، مریشكی برژاو، كەباب بە پلاو وشلەی هەمە جۆرو گەلیٚ خواردنی دی كە من ناویانم نەدەزانی، میوەش تا بڵێی زۆر بوو، رژابووە ژێر دەست و پێیان.

وشترەكە لەوسەری حەوزەكە وەستا. بە ئیشارەتی سەرو گەردن، هەموویانی بێدەنگ كرد و گوتی:- هەموو لایەكتان، بەوردو درشتەوە خێر هاتن، خێرو خۆشیتان هێنا. دەمویست ئەوەتان لیٚ بپرسم كە ئاخۆ دەزانن لەبەر خاتری كیٚ و بۆچی ئەم میواندارییە قورسەمان كردوون؟

كەر گوتی:- لەبەر خاتری لەتیف. ویستمان ئەویش ژەمێكی تێرو تەسەل بخواو عەزرەت لە دڵی نەمێنیٚ.

ورچی، پشت رەشاشەكە گوتی:- ئاخر لەتیف ئەوەندە زوو زوو سەرمان دەدا، وای لیٚ كردووین هەر هەموو خۆشمان بوویٚ.

پڵینگ گوتی:- بەڵیٚ وەك چۆن لەتیف حەز دەكا ئێمە هەموو هی ئەو بین، ئێمەش پڕ بەدڵ حەز دەكەین هی ئەو بین.

شێر گوتی:- بەڵیٚ منداڵە دەوڵەمەندان زوو زوو لێمان تەوەللا دەبن، بابیان هەموو رۆژ ئەسباب وازی تازەیان بۆ دەكڕن و ئەوانیش یەك دوو جار وازیمان پێدەكەن و دڵیان دەتۆریٚ و ئیدی گەمەمان پێناكەن و وازمان لێدێنن بپوكێینەوەو لە بەین بچین . من هاتمە قسان و گوتم: - ئەگەر هەر یەكێكتان ببن بە هی من، قەولتان دەدەمیٚ كە هەرگیز لێتان وەڕەز نەبم. هەمیشە یاریتان دەگەڵ دەكەم و بە تەنیٚ جێتان ناهێڵم.

هەموو ئەسباب وازییەكان گوتیان:- دەزانین، ئێمە تۆ باش دەناسین، بەڵام ناتوانین ببین بەهی تۆ، چونكە گرانمان دەفرۆشن. ئەوجا یەكێكیان گوتی:- باوەڕ ناكەم دەرامەتی یەك مانگی بابی تۆ بەشی كڕینی یەكێك لە ئێمەمانان بكا.

وشتر دیسان کرِی کردنەوە. با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. قسەی هەمووتان دروستە، بەلاَم ئەم میوانیەی ئەوشۆمان لەبەر خاتری شتێکی یەکجار گرینگ کردووە کە شتاقتان ئاماژەتان بۆ نەکرد.

دیسان هاتمە قسان و گوتم:- بە خۆم دەزانم بۆچی منتان هێناوەتە ئێرە. ئەنگۆ ویستتان ئەوەم پێ بلێن کە بزانە هەموو کەس وەك تۆو بابت برسی و تینوو لە کەنار شەقامەکاندا ناخەون. چەند ژن و پیاوێك لە دەوری مێزێکدا دانیشتبوون و خێرا خێرا نانیان دەخوارد. دیاربوو نۆکەرو کارەکەری تەلارەکە بوون. منیش دەستم بە خواردن کرد، بەلاَم دەتگوت گەدەم کون بووە. هەر چەندم دەخوارد تێر نەدەبووم و سکم هەر قۆڕە قۆڕی دەکرد.

لە دلَی خۆمدا گوتم:- ناشێ ئەمە خەون بێ؟ ئەگینا بۆ تێر نابم؟ دەستم لەچاوم دا. چاوم کرابوونەوە. بەخۆم گوت:- خەوتووم؟ نەخێر نەخەوتووم؟ بنیادەم بە خەوتوویی چاوی نابینێ. ئەدی بۆ تێر نابم؟ بۆ دلَم لە برسا دەلەرزێ؟

ئێستا بە دەوری تەلارەکەدا دەگەڕام. دەستم لە دیوارو بەردە گران بەهاکانی دەخشاند. نازانم تەپ و تۆز لە کوێوە دەهات و یەکڕاست بە دەموچاوما هەلَدەپژا. ئێستا لە ژێر زەمینەکەدا بووم، بۆیە وام دەزانی تەپ و تۆزەکە هی وێندەرە. لە یەکەمین پلەدا تەپ و تۆز بەجۆرێ خۆی بە کەپووودەومدا کرد کە پژمینم هاتێ! هاپژم!..

***

بەخۆم گوت:- ئەوە چییە لە کوێندەرم؟

گسکی کوچە مالَەکە رێك بەبەر کەپووو دەومدا رەت بووو تەپوتۆزی شوستەکەی بەدەم و چاومدا کرد. بەخۆم گوت:- چی بووە؟ لە کوێم؟ ناشێ خەون ببینم؟

بەلاَم نەخەوتبووم. عارەبانەکەی باوکمم بە چاوی خۆم بینی، گوێم لە فڕە فڕی تاکسیەکان بوو. لە تاریك و روونی سپێدەدا چاوم بە خانووو بەردەکانی دەوروبەری چوار ریانەکە کەوت. کەواتە نەخەوتووم. کوچە مالَەکە لە من رەت بوو بوو. پەیتا پەیتا تەپ و تۆزی هەلَدەستان و شۆستەکەی خەت خەت دەکردو دەچووە پێشێ.

ئەوجا بە خۆم گوت:- بلێی هەموو ئەو شتانەم لە خەودا دیتوون؟ نەء !.. ئا خەون بووو بڕایەوە. نەء .. نەء .. نەء ..

کوچە مالَەکە گەڕایەوەو سەیرێکی کردم. بابم لەسەر عارەبانەکەوە تەماشای کردم و گوتی: - لەتیف، نووستووی؟

گوتم:- نا. نا!..

بابە گوتی:- ئەدی بۆ هاوار دەکەی؟ هەستە وەرە سەرەوە. وەرە لای خۆمەوە.

چوومە سەرێ. بابم باسکی بۆ کردمە سەرین، بەلاَم خەوم لێنەدەکەوت. دلَم لە برسانا زافی دەکرد. سکم نووسابوو بە پشتمەوە. بابم کە هەستی کرد خەوم لێناکەوێ گوتی:- شەوێ درەنگت پێ چوو. منیش ماندوو بووم و زوو خەوتم. گوتم دوو ترومبێلان تامپۆنیان کردبوو، منیش بە دەم سەیرکردنەوە دواکەوتم ئەوجا گوتم:- بابە وشتر دەتوانێ بفڕێ..

بابم گوتی:- نەء ، لە کوێ دەتوانێ؟

گوتم:- وایە. وشتر باڵی نییە.

بابم گوتی:- ئەوە چیتە رۆڵە؟ کە بەیانیان لە خەو رادەبێ باسی وشتر دەکەی.

من کە بیرم لای شتێکی دی بوو گوتم:- پارەداری شتێکی چاکە، وا نییە بابە؟ مرۆڤ دەتوانێ حەزی لە هەرچییەك بێ بیخوا، هەر چییەکی بوێ بیکڕێ. وا نییە بابە؟

بام گوتی:- ناشکور مەبە رۆڵە. خوا خۆی چاك دەزانێ کێ پارەدار دەکاو کێ بێ پارە.

بابم هەمیشە ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە.

کە دنیا روناك بۆوە، بابم سۆڵەکانی لە ژێر سەری دەرهێنان و کردنییە پێی. ئەوجا لەسەر عەرەبانەکە دابەزین و بابم گوتی:- دوێنێ پەتاتەکەم بۆ ساغ نەکرایەوە، نیوەی زیاترم بە ملەوە ماوە.

گوتم:- ئێ شتێکی دیکەت کڕیبا.

بابم چ قسەیەکی نەکرد. دەرگای عارەبانەکەی کردەوە. دوو گونییە پەتاتەی دەرهێناو هەڵیڕشتنە سەر عارەبانەکە. منیش تەرازو و کیلۆکانم دەرهێناو ریزم کردن. ئەوجا کەوتینە ڕێ.

بابم گوتی:- دەچین ئاش دەخۆین.

هەر بەیانیەك بابم بیگوتبا:- "دەچین ئاش دەخۆین" یەکسەر دەمزانی کە شەوێ بەبێ شیو سەری ناوەتەوە.

کوچە ماڵەکە، شەقامەکەی تا ئەو سەر حەت خەت کردبوو ئێمە بەرەو لای (پارکی شار) دەچووین. پیرەمێردە ئاش فرۆشەکە وەکو هەمیشە لە قەراغ جۆگەکەو پشت لە شەقامەکە دانیشتبوو.

مەنجەڵە ئاشەکە لە بەردەمیاو لەسەر تەباخێکی نەوتی قوڵپی دەدا. سێ مشتەری ژن و پیاولە دەوری دانیشتبوون و لە کاسەی فافۆندا ئاشیان (شۆربا) دەخوارد. ژنەکە بلیت فرۆش بوو، عەبای لەسەر بوو، بە چینچکانەوە دانیشتبوو، دەستە بلیتەکانی خستبووە بەینی سکی و ئەژنۆکانی و عەبا چڵکنەکەی دابوو بەسەر ئەژنۆکانیا.

بابم چاك و خۆشی لەگەڵ پیرەمێردەکەدا کردو دانیشتین. دوو قاپی چکۆلەی ئاشمان بە لەتێ نانەوە خواردو هەستاین. بابم دوو قڕانی دامێ و گوتی: -من دەچم پەتاتەکە دەگێڕم، نیوەڕۆ وەرەوە بۆ ئێرە، پێکەوە فراڤین دەخۆین.

***

یەکەم کەس تووشی کوڕەکەی زێوەری بلیت فرۆش بووم. بەردەمی پیاوێکی گرتبوو. لێکدا لێکدا دەیگوت:- بلیتێ بکڕە. ئیشەڵڵا بۆت دەردەچێ، کاکە توخوا بیکڕە.

کابرا بە توێزی خۆی لە دەستی کوڕەکەی زێوەر دەرباز کردو ڕۆیی، کوڕەکەی زێوەر لە بن لێوانەوە چەند جنێوێکی دایێ و ویستی بکەوێتە ڕێ کە من لە دواوە گازم کردو گوتم:- ها، بۆت نەهاتە ڕەدا!...

کوڕەکەی زێوەر گوتی:- پەست بوو. وێدەچوو لەگەڵ ژنەکەیا شەڕی بووبێ.

دوو بە دوو کەوتینە ڕێ. کوڕەکەی زێوەر دەستەیەکی ١٥- ٢٠ بلیتی بە دەستەوە بوو. بگەیشتبا هەر کەسێك بۆی رادەگرت و دەیگوت:- کاکە بلیت؟ خانم بلیت؟...

کوڕەکەی زێوەر هەر بلیتێکی فرۆشتبا، قڕانێکی لە دایکی دەستاند. کە خەرجی خۆی دەردەکرد، ئیدی بلیتی نەدەفرۆشت، دوای گەمەو گەڕان و شەڕە شەق و سینەمای خۆی دەکەوت. لە هەموومان پارەدارتر بوو. عادەتی وابوو نیوەڕوان لە پاڵ جۆگە ئاوێك و لە ژێر پردێکا راکشێت و ١-٢ سەعاتان بنووێ. بەیانیان بەر لە هەتاو کەوتن ١٥- ٢٠ بلیتی لە دایکی وەردەگرت و دەکەوتە ڕێ تا بەر لە نیوەڕۆ ساغیان بکاتەوەو لە کار ببێتەوە، دڵی نەدەهات پاش نیوەڕوانیش بە بلیت فرۆشتن بە فیڕۆ بدا.

تا گەیشتینە شەقامی نادری سێ بلیتی فرۆشت، کە گەیینە وێندەر گوتی:- من دەبێ لێرەدا بمێنم.

تاکو تەرا موغازە کرابوونەوە، موغازەی لەعابە فرۆشییەکە هێشتا نەکرابووەوە، وشترەکەم هێشتا نەهاتبووە کەنار شۆستەکە... دڵم نەهات لە دەرگا بدەم و خەوی بەیانی لێبزڕێنم. وردە وردە بەرەو سەرێ هەڵگەڕام. شەقامەکان پڕ بوون لە مەکتەبلی و هەر ترومبێلێکی خسوسیت دەبینی یەکدوو منداڵە مەکتەبلی تێدا بوو، کە لە پاڵ داك و بابیان دانیشتبوون و بەرەو قوتابخانە دەچوون.

لەم کاتانەدا مەگەر تەنیا ئەحمەد حوسێنم دیتبا تا لە تەنیایی بخەلەسێم. چەند شەقامێکم بڕی و گەییمە ئەو شەقامە پاك و خاوێنانەی کە کەم و زۆر بۆنی دووکەڵ و پیسییان لێنەدەهات.

منداڵ و گەورە هەموو پۆشتەو پەرداخ و پاك و تەمیز بوون، روومەتی هەموویان دەبریقایەوە. کچ و ژن چەشنی گوڵی رەنگاو رەنگ دەدرەوشانەوە. موغازەوماڵەکان لە ژێر تیشکی هەتاودا چەشنی ئاوێنە دەبریسکانەوە. کاتێ کە بەم گەڕەکانەدا رەت دەبووم وام هەست دەکرد لە سینەما دام و سەیری فیلم دەکەم. هەرگیز نەم دەتوانی ئەوە بێنمە بەرچاوی خۆم کە چ جۆرە خواردنێك لەم ژوورە بەرزو خاوێنانەدا دەخۆن، چۆن دەنوون، چۆن دەئاخفن. چ جۆرە جلوبەرگێ لەبەردەکەن، تۆ دەتوانی ئەوە بێنیتە بەر چاوی خۆت کە چۆن لە سکی دایکتدا دەژیای؟ بۆ وێنە دەتوانی ئەوە بێنیتە بەرچاوت کە چۆن لە سکی دایکتدا، خواردنت دەخوارد؟ نەخێر ناتوانی. منیش وەکو تۆ بووم، ئەم مەتەڵەم پێ هەڵنەدەهات.

کۆمەڵێ منداڵی جانتا بەدەست لەبەر موغازەیەك وەستا بوون و سەیری یارییەکانی ناو جامخانەکەیان دەکرد. منیش لە پشتیانەوە وەستام. بۆنێکی یەکجار خۆش لە قژی شانەکراویان دەهات، بێ ئیختیار بۆنم کرد بە پشت ملی یەکێکیانەوە. منداڵەکان ئاوڕیان دایەوە. سەیریان کردم و بە قێزو بێزەوە لێم دوورکەوتنەوەو رۆیشتن.

لە دوورەوە گوێم لە یەکێکیان بوو دەیگوت: چ بۆنێکی پیسی لێدێت.

لە شووشەی جامخانەکەدا سەیری خۆمم کرد، قژم ئەوەندە درێژو ئاڵۆزکاو بوو کە هەردوو گوێچکەمی داپۆشی بوو. دەتگوت کڵاوی گەورەم لەسەر کردووە. کراسە جاوەکەم چڵکن بوو.

لەشی تاوەسووتم لە یەخە دڕاوەکەیەوە دیار بوو. پیێ خاوس و لینگ ڕووت، پاژنەکانم قلێشا بوون، بە من بوایە سەری هەر سێ دەوڵەمەند زادەکەم پان کردبایە.

ئەوان هۆی ئەم ژیانە ناخۆشەی من بوون؟

پیاوێك لە موغازەکەوە هاتە دەرێو بە ئاماژەی دەست دەری کردم گوتی:- هەڕۆ کوڕك، بەم بەیانییە زووە هێشتا خۆمان سفتاحمان نەکردووە تا شتێك بە تۆ بدەین.

لە جێی خۆم نەجولاّمو چ قسەیەکیشم نەکرد. کابرا دیسان بە ئاماژەی دەست دەری کردمو گوتی:- دەبڕۆ، چەند روو قایمی.

لە جێی خۆم نەبزووتمو گوتم:- خۆ سواڵکەر نیم.

کابرا گوتی:- ببوورە، براله، ئەدی چ کارێکت هەیە؟

گوتم:- چ کارێکم نییە، بۆ خۆم سەیر دەکەم.

کەوتمە ڕێ. کابرا وەڕوورکەوت. پارچە کاشییەکی سپی لە نێو جۆگەلەکەدا دەبریقایەوە، هەر پڕم دایێو تا هێزم تێدا بوو سرەواندمە جامخانەی موغازەکە، شووشە هاڕەی کردو شکا. هاڕەی شووشەکە بارێکی قورسی لەسەر شانم لابرد. دوو پێم هەبوو، دووی دیکەشم قەرزکردو تێم تەقاند، خۆیشم نازانم چەند شەقامم بڕی.

لە پڕ تووشی ئەحمەد حوسێن بووم، هەرکە ئەوم بینی ئیدی دڵنیا بووم کە زۆر لە موغازەکە دوور کەوتوومەتەوە.

ئەحمەد حوسێن وەکو هەمیشە لەبەر قوتابخانەیەکی کچاندا ئەمبەرو ئەوبەری دەکرد. دەستی لەو کچۆلانە پان دەکردەوە کە لە ترومبێلە خسوسییەکانەوە دادەبەزین. ئەمە پیشەی هەموو بەیانییەکی ئەحمەد حوسێن بوو. ئێستاو ئەوسا نەمزانی ئەحمەد حوسێن لای کێ دەژی. قاسم دەیگوت تەنیا پیرە داپیرێکی هەیە کە ئەویش گەدایە. ئەحمەد حوسێن بە خۆی هیچی نەدەگوت.

زەنگ لێی دا. قوتابییەکان چوونە پۆلەوە، ئێمەش دوو بە دوو کەوتینە ڕێ.

ئەحمەد حوسێن گوتی:- ئەوڕۆ چ وام دەست نەکەوت، هەر کەسێکیان دەگری دەڵێ وردەم پێ نییە.

گوتم:- کێوە دەچین؟

ئەحمەد حوسێن گوتی:- هەر وا بۆ خۆمان ڕێ دەکەین.

گوتم: هەروا نابێ. با بڕۆین قاسم وەدۆزینو سەرو پەرداخێ دۆ هەڵدەین.

قاسم لەو سەری شەقامی سی مەتری دا دۆی دەفرۆشت. پەرداخی بە قرانێ. ئێمە هەر کاتێ کە دەچووینە دیدەنی، سەرو پەرداخێکی بە خۆڕایی دەداینێ. بابی قاسم لە شەقامی حاجی عەبدولمەحمودا مامەڵەی جلە کۆنەی دەکرد. کراس بە پازدە قران، شۆرت جووتی ٢٥ قران، چاکەتو پانتۆڵ بە ٧-٨ تمەن. کە لە شەقامی حاجی عەبدولمەحمود پێچت کردباوە، یەکسەر قاسم بوو. عەردو بەردو دارو دیوار یەکپارچە شتی کۆنو فریشقە بوو، کە خاوەنەکانیان بە دیارییەوە وەستابوونو مشتەرییان گازدەکرد. بابی قاسم دوکانۆچکەیەکی هەبوو. شەوانیش لەگەڵ قاسمو دایکی قاسم دا لەوێ دەخەوتن. جێی دیکەیان نەبوو. دایکی قاسم رۆژ تا ئێوارێ

ئەو جلە کۆن و دڕاوانەی کە بابی قاسم لەو ولەمی دەکڕین، لە دوکانەکەیا یا لە چڵکاوی قەراخ شەقامی سی مەتری دا دەیشتن و پاشان پینەی دەکردن. شەقامی عەبدولمەحمود قیڕتاو نەکرابوو چ ترومبێلێك بەوێدا ڕەت نەدەبوو.

من و ئەحمەد حوسێن پاش یەکدو سەعات گەیینە کن قاسم. قاسم لەوێ نەبوو. چووین بۆ شەقامی حاجی عەبدولمەحمود. بابی قاسم گوتی:- قاسم دایکی بردووە بۆ خەستەخانە.

دایکی قاسم هەمیشە یا لاقی دەیەشان یا گەدەی.

***

سەروبەندی نیوەڕۆ بوو. من و ئەحمەد حوسێن و کوڕەکەی زێوەر لە شەقامی نادری بە دەم ناوکە قرتاندنەوە بەرانبەرمان لە وشترەکە گرتبوو. باسی نرخەکەیمان دەکرد. ئان ئاخری پێمان بە جەرگی خۆدا ناو بڕیارماندا بچینە ژووریّ و نرخەکەی لە کابرای موغازە چی بپرسین. کابرای فرۆشیار بەو خەیاڵەی کە سواڵکەرین هەر لە ڕێوە لێوی لێهەڵقورتاندین و گوتی:- هەڕنە دەرێ پارەی وردەمان نییە.

گوتم:- بۆ پارە نەهاتووین کاکە، ئەو وشترە بایی چەندە؟

ئاماژەم بۆ دەرێ کرد. فرۆشیارەکە بە سەرسامی گوتی:- وشتر؟!

ئەحمەد حوسێن و کوڕەکەی زێوەر دوا بە دوای من گوتیان:- بەڵێ بە چەندی دەفرۆشیت؟

موغازەچییەکە گوتی:- هەڕنە دەرێ بابە، هی فرۆشتن نییە.

بە پەستییەوە لە موغازەکە وەدەرکەوتین، لە یەکێ وایە گەر هی فرۆشتن با ئەوەندەمان پارە پێ بوو بیدەینێ و یەکسەر جڵەوی وشترەکە بگرین و لەگەڵ خۆدا بیبەین.

وشترەکە لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستا بوو. ئێمە پێمان وابوو دەتوانێ هەرسێکمان بە جارێ هەڵگرێ و هەر بە خۆیشی نەزانێ.

ئەحمەد حوسێن بە حاڵ دەستی دەگەییە ژێر زگی وشترەکە. کوڕەکەی زێوەریش دەیویست خۆی تاقی بکاتەوە، لە پڕ موغازەچییەکە هاتە دەرێ و گوێی باداو گوتی:- وڵاخ ئەدی نەتدیووە لێی نووسراوە، تکایە دەستی لێمەدەن؟

بە دەست پارچە کاغەزێکی نیشان دا کە بە سنجاق لەبەر سینگ وشترەکە درا بوو. شتێکی لەسەر نووسرا بوو، بەڵام ئێمە شتاقمان سەرمان لێدەرنەدەکرد. لەوێ دوور کەوتینەوە ودەستمان بە ناوکە قرتاندن و پیاسەی خۆمان کردەوە. پاش ماوەیەك کوڕەکەی زێوەر گوتی خەوی دێت. پەنایەکی دۆزییەوەو خۆی بە بن پردێکا کردو لێی خەوت. من و ئەحمەد حوسێن بەرەو پارکی شار کەوتینە ڕێ. دنیا گەرم بوو. ئازای لەشمان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو. ورتە لە کەسمانەوە نەدەهات. چەندم حەزدەکرد نووکە لای دایکم بام.

خراپ غەریبیم هەستا بوو. ئەحمەد حوسێن لەبەر دەرگای پارکەکەدا سەندەویچێکی هێلکەی کڕی و قەپێکی دایە منیش. پاشان چووین بۆ شوێنەکەی چەند ڕۆژەمان تا لە جۆگاکەدا مەلە بکەین. چەند منداڵێکی دیکەش لە سەرووی ئێمەوە خەریکی مەلەکردن و شەڕە ئاو بوون. من و ئەحمەد حوسێن بە بێدەنگی خۆمان بە جۆگاکەدا کردو سەروبەدەنمان شت و هەقی کەسمان

نەبوو. باخەوانەکە بە بۆڵە بۆڵ بەرەو ئێمە دایکێشا. هەموو هەڵاتین. چووین لەسەر چەوەکان دانیشتین‌و خۆمان دایە هەتاو. من‌و ئەحمەد حوسێن خەریك بووین بە چەو وێنەی حوشترمان دروست دەکرد. کە لە پڕ دەنگی بابم ژنەوت. ئەحمەد حوسێن ڕۆیی. من‌و بابم خۆمان بە سی وجگەرخانەیەکدا کردو نیوەڕۆژەمان خوارد. بابم کە بینی مات‌و بێدەنگم گوتی:- لەتیف چ قەوماوە؟ دەڵێی تەواو نیت؟

گوتم:- چ نییە.

هاتین بۆ بن درەختەکانی پارکی شار تا سەر خەوێ بشکێنین. بابم کە بینی هەر گینگڵ دەدەم‌و خەوم لێناکەوێ، گوتی:- لەتیف، شەڕت کردووە؟ کەس هیچی پێ گووتوویت؟ ئاخر پێم بڵێ بزانم چی بووە؟

زۆر بێتاقەت بووم. حەوسەڵەی قسە کردنم نەبوو. حەزم دەکرد بە بێدەنگی خەم بخۆم. حەزم دەکرد گوێم لە دەنگی دایکم بێ. بۆنی بکەم. باوەشی پێدا بکەم‌و ماچی بکەم. لە پڕ دام کورکاندو سەرم نا بە سینگی بابمەوە. بابم هەستا. لە باوەشی گرتم، وازی لێهێنام تا کوڵی گریانم نیشتەوە، بەڵام دیسان هیچم بە بابم نەگوت. هەر ئەوەندەم پێ گۆت کە بیری دایکم دەکەم. خەو بردمییەوە. وەختێ چاوم هەڵێنا دیتم بابم دەستەو ئەژنۆ بە دیارمەوە دانیشتووەو چاوی بڕیوەتە ئاپۆڕاکە. لاقیم گرت‌و تەکانم دا، گوتم:- باوکە!

بابم سەیری کردم. دەستی بەسەر سەرما هێناو گوتی:- هەستای گیانەکەم؟

سەری ئەرێم بۆ لەقاند.

بابم گوتی:- سبەی دەچینەوە بۆ لای خۆمان. دەچینەوە بۆ کن داکت. ئەگەر کاسبیەکان چنگ کەوت ئەوا لەوێندەر دەیکەین‌و پارووە نانێك دەخۆین. خۆ ئەگەر دەستیش نەکەوت، چش. هەر چۆنێ بێ لەمە چاترە ئێمە لێرە هەتیو بکەوین‌و ئەوانیش لەوێ.

لە پارکەوە بۆ گەراج ڕێگایەکی کەم نەبوو. نەمدەزانی خۆشحاڵ بم یان نەء . حەزم نەدەکرد لە وشترەکەم دوور بکەمەوە.

خۆ ئەگەر توانیبام وشترەکەش لەگەڵ خۆدا بەرم ئەوا چ خەمێکم نەدەبوو. چووین بلیتی سەفەرمان کڕی‌و بە شەقامەکاندا کەوتینە ڕێ. بابم دەیوست هەر چۆنێ بووە تاکو عەسر عەرەبانەکەی بفرۆشیت. منیش حەزم دەکرد هەر چۆنی بووە کەرەتێکی دی سەری وشترەکەم بدەم.

تەگبیرمان کرد کە شەوێ بێین لە دەوروبەری گەراجەکە بخەوین. بابم نەیدەویست بە تەنێ بم، بەڵام پێم گوت دەمەوێ بچم هەندێك بگەڕێم تا دڵم بکرێتەوە.

***

دەمەو خۆرئاوا بوو، خۆیشم نازانم چەند سەعاتان بە دیار وشترەکەوە وەستابووم. لە پڕ ترومبێلێکی خسوسی سەر واڵا هات‌و لە نزیك من‌و وشترەکە وەستا. پیاوێك‌و کچۆڵەیەکی پاك‌و خاوێن لە ترومبێلەکەدا بوون. کچۆڵەکە چاوی بڕیبووە وشترەکەو پێدەکەنی. دڵم خەبەری دا کە

دەیانەوێ وشترەکە بکڕن و لەگەڵ خۆدا بیبەن. کچە دەستی بابی گرت، بەدەم راکێشانەوە دەیگوت:– لە زێ کە بابە، نووکە یەکێکی دی دێت و دەی کڕێ.

باب و کچ دەیانویست بچنە موغازەکەوە. منیش رێك لەبەردەمیان وێستا بووم و رێگاکەم لێ گرتبوون. خۆیشم نەمدەزانی لە چ حاڵێکام. دەترسام؟ دەگریام؟ خەمم دەخوارد؟ نازانم. ئەوەندە دەزانم بەردەمی باب و کچەم گرتبوو و لێکدا لێکدا دەمگوت:– کاکە کاکە گیان. ئەم وشترە هی فرۆشتن نییە.

کابرا بە توندی دەڵەکی دام و گوتی:– بۆ ڕێگاکەت گرتووە کوڕە، دەلاکەوە. دوو بە دوو وەژوور کەوتن. کابرا لەگەڵ موغازەچییەکە کەوتە قسان. کچەش زوو زوو دەگەڕایەوە و سەیری وشترەکەی دەکرد.

ئەوەندە تەڕو بڕو بە دەماخ بوو وات خەیاڵ دەکرد لە هەموو ژیانیا زەڕەیەك خەفەتی نەخواردووە. دەتگوت زمانم لاڵ بووە و لاقم شکاون. لەبەر دەرگاکە وەستابووم و زەق زەق دەمڕوانییە نێو موغازەکە. مەیموونەکان، بێچووە وشترەکان، ورچەکان، کەرۆێشکەکان و ئەوانی دی سەیریان دەکردم. وامدەزانی دڵیان بە حاڵم دەسووتێ.

باب و کچ لە موغازەکە وەدەرکەوتن. بابەکە دوو قڕانییەکی بۆ درێژ کردم. دەستەکانم خستنە پشتم و چاوم بڕییە ناو چاوی.

نازانم چی لە چاوەکانما خوێندبووەوە کە خێرا دوو قڕانییەکەی لە بەڕکی نایەوەو رەت بوو. ئەوجا موغازەچییەکە لەو ناوەی دوور خستمەوە. دوو شاگرد لە موغازەکە وەدەرکەوتن و بەرەو وشترەکە چوون. کچۆڵەکە چوو بووە نێو ترومبێلەکەوە، لەوێوە سەیری وشترەکەی دەکرد. بە چاوو برۆ بە قوربان و بە سەدەقەی دەبوو.

کاتێ شاگردەکان وشترەکەیان هەڵگرت، بێ ئیختیار خۆم گەیاندێ. لاقی وشترەکەم گرت و هاوارم کرد:– وشتری خۆمە، بۆ کوێی دەبەن، نایەڵم .

یەکێك لە شاگردەکان گوتی:– لاکەوە هەتیو چما شێت بووی؟

بابی کچەکە لەموغازەچییەکەی پرسی:– سواڵکەرە؟

خەڵکیمان لێخڕ بوونەوە. لاقی وشترەکەم گرتبوو و بە ئامان و زەمان بەرم نەدەدا. ئاخری شاگردەکان ناچار وشترەکەیان دانایەوەو بە تۆبزی لەو ناوەیان وەدەرنام. گوێم لێبوو کچۆڵەکە لە نێو ترومبێلەکەوە بە بابی دەگوت:– بابە مەیەڵە چیدی دەستی لێبدا.

بابەکە سواری ترومبێلەکە بوو. وشترەکەیان خستە پشتی باب و کچەکەوە. ترومبێلەکە لە دەرچوونا بوو کە خۆم راپسکاندو بەرەو ترومبێلەکە غارم دا. بە هەردوو دەستان خۆم بە ترومبێلەکەوە نووساندو هاوارم کرد:– وشترەکەم کێوە دەبەن؟ وشترەکەم دەوێتەوە.

پێموایە چ کەسێك گوێی لە دەنگم نەبوو. دەتگوت لاڵ بوومە. دەنگم دەرنەدەهات، بە خەیاڵی خۆم هاوارم دەکرد. ترومبێلەکە دەرچوو. یەکێك لە دواوە گرتمی. دەستم لە ترومبێلەکە ترازاو بە دەما کەوتمە سەر جادە قیرەکە، سەرم هەڵبڕی. بۆ دوا جار وشترەکەم بینی کە دەگریاو بە

**تووڕەییەوە زەنگوڵەکەی ملی دەزرینگاندەوە. دەموچاوم کەوتە نێو ئەو خوێنەی کە لە کەپووم ڕژابوو. لاقەکانم لە عاردی خشاندن و هۆن هۆن گریام.**

**پڕ بە دڵ حەزم دەکرد ڕەشاشی نێو جامخانەکە هی من بێ.**

**هاوینی ١٣٤٧=١٩٦٨**

## قۆخێك، هەزار قۆخ

باخێکی یەکجار گەورەو دڵڕفێن لە پاڵ کوێرە گوندێکی بێ ئاودا هەبوو. باخێك تا حەزبکەی ئاوەدان. پڕ لە هەموو دار میوەیەك، ئاوی زۆر، باخەکە هێند گەورەو بەرین بوو بە دووربینیش ئەمسەرو ئەوسەری نەدەبینرا.

ئاغای گوند چەند ساڵێك لەمەوبەر زەوێکانی خۆی پارچە پارچە دابڕی بوو و فرۆشتبوونی بە دانیشتووانی گوندەکە. باخەکەی بۆ خۆی هێشتبووەوە. دیارە ئەو زەویانەی کە بە دێهاتییەکانی فرۆتبوو هەموو ناهەموارو چەقەن بوون. وشك و بێ ئاو بوون. یەك شوێنی هەموارو تەخت لەو گوندەیدا هەبوو ئەویش باخەکەی ئاغا بوو.

زەویەکانی دی هەموو بە قەد پاڵو لاپاڵەوە بوون. ئەو دێهاتیانەی ئەو زەویانەیان کڕی بوو، بە گەنمو جۆ دایاندەچاندو. زەویەکان دێم بوون.

بە هەر حاڵ با واز لەم قسانە بێنین. چونکە لەوەیە پێوەندییان بە چیرۆکەکەی ئێمەوە نەبێ.

دوو دار قۆخی خواروو ژوور لە باخەکەدا هەبوون. یەکێکیان تۆزێ بچووك تر بوو. هەرچی گەڵاو گوڵیان هەبوو لە یەك دەچوون، هەر کەسێ دیتبانی یەکسەر دەیزانی کە هەردووکیان لە یەك جنسن.

درەختە گەورەکەیان موتوربە کرا بوو، هەر چەند قۆخی دەگرت هەر یەك پڕ بە چنگێ. ئاڵو جوانو ئاودار ،مرۆڤ دڵی نەدەهات قەپیان لێبدات.

باخەوانەکە دەیگوت ئەو درەختە گەورەیە لەلایەن ئەندازیارێکی بێگانەوە موتوربە کراوە، قەڵەمەکەی لە وڵاتی خۆیانەوە هێنا بوو. دیارە درەختێك ئەو هەموو مەسرەفەی لێکرابێ چ بەرێك دەگرێ!

درەختەکان سەرو دوعای (وان یکاد)یان پێوە هەڵواسرا بوو تا لە چاوی بەد بەدوور بن.درەختە چکۆڵەکە ساڵێ سەدان گوڵی دەکرد، کەچی تاقە گوڵێکی هەڵنەدەپێچاو نەدەبوو بە بەر، یا هەر بە گوڵی هەڵدەوەرین یا قۆخەکان بە فەریکی سیس دەبوونو دەوەرین. باخەوانەکە هەرچییەکی دەکرد درەختەکە چاك نەدەبوو. ساڵ لە دووی ساڵ پتر لقو پۆپی دەهاویشت، بەڵام بۆ دەرمانیش قۆخێکی نەدەگرت.

باخەوانەکە هەستا درەختەکەی موتوربە کرد، بەڵام بێ سوود بوو. وێدەچوو کار گەیبێتە ئینکەبەرایەتی. باخەوانەکە قەڵس بوو. ویستی بە فێڵو دەهۆیان درەختەکە بترسێنێ. چوو هەڕەیەکی کولی هێنا، ژنەکەشی گازکرد، لەبەردەم درەختەکەدا کەوتە تیژکردنەوەی دانەکانی هەڕەکە، کە هەڕەکەی تیژ کردەوە پاشەو پاش کشایەوەو بەرەو درەختەکە تاوی دا وەك ئەوەی بڵێ نووکە لە رەگو ریشەوە دەتبڕم و وات تەمێ دەکەم کە نەخەڵەتابی جارێکی دی قۆخەکانت بوەرێنی.

باخەوانەکە لە نیوەی ڕێ دابوو کە ژنەکەی توند مەچەکی گرت و گوتی:- تۆ گیانی من دەستی لێمەدە. ئەمجارە بیکە بە خاتری من. قەولت دەدەمێ کە ساڵی داهاتوو قۆخان بگرێ و شتاقیان نەوەرێنێ. ئەگەر ئەمەی نەکرد ئەوسا ئۆباڵی دەکەوێتە ئەستۆی خۆی، دوو بە دوو دەیبڕینەوەو لە تەنووری داوێین و دەیسوتێنین.

ئەم فێڵ و دەهۆو هەڕو گێفەش کاری لە درەختەکە نەکرد.

دیارە هەمووتان بە تاسەوەن تا بزانن سەربهوردی درەختە بچووکەکە چی بوو، بۆ قۆخانی نەدەگرت. باشە لێرە بە دواوە چیرۆکەکەمان بۆ گێڕانەوەی سەربهوردی درەختە بچکۆل تەرخان دەکەین.

***

گوێ بگرن!...

باش گوێ ڕادێرن. درەختە چکۆڵ بە تەمای قسەکردنە. بێدەنگ بن با بزانین درەختە چکۆڵ چی دەڵێ. وێدەچێ سەربهوردی خۆی بگێڕێتەوە.

"سەد - سەدو پەنجا قۆخێك دەبووین و خرابووینە قەرتاڵەیەکەوە. کابرای باخەوان بان و بن و چواردەوری قەرتاڵەکەی بە گەڵا مێو داپۆشی بوو، تا تینی هەتاو پێستی ناسکمان نەباو تەپوتۆز لەگۆنای ئاڵمان نەنیشێ. تیرۆژکێکی سەوزباو لە درزی گەڵامێوەکانەوە دەڕژایە ژوورەوەو تێکەڵ بە ئاڵیی گۆنامان دەبوو و دیمەنێکی دڵڕفێنی دروست دەکرد.

باخەوانەکە بەر لە هەتاوکەوتن  چنی بوونی. بۆیە لەشمان فێنك و ئاودار بوو. هێشتا سەرمای شەوانی پایزمان لە لەش دەرنەچوو بوو. ئەو تیرۆژکەی لە درزی گەڵا مێوەکانەوە دەهاتە ژوورێ ئۆخژنی دەخستە نێو دڵ و دەروونمانەوە.

هەموومان ڕۆڵەی یەك درەخت بووین. باخەوانەکە هەموو ساڵێ ئەو کاتانە دەیڕنین و لە قەرتاڵەی دەنایین و بۆ شار... لەوێ لە دەرگای ماڵە ئاغای دەدا. قەرتاڵەکەی دەدانێ و وەکو نووکە بۆ گوندی دەگەڕایەوە.

وتم سەدو پەنجا قۆخێکی گەییوی ئاودار دەبووین. جا با باسی خۆم بکەم. ناسك، ئاودار شیرین و بەلەزەت. پێستەکەم هێند نەرم و ناسك بوو بە ئاستەم شتێکی بەرکەوتبا شەقی دەبرد. گوناکانم وا سوور هەڵگەڕا بوون لە تۆ وایە شەرمی رووتی جۆشی دابوونن، بە تایبەتی سەرو رووم وەکو یەکێ تازە مەلەی کردبێ تەنکە شەونمێکی پێوە دیاربوو.ناوکە درشت و ڕەقەکەم لە کەڵکەڵەی ژیانێکی تازەدا بوو. یا باشتر بڵێم بە خۆم لە کەڵکەڵەی ژیانێکی تازەدا بووم. چونکە ناوکەکەم بەشێك بوو لە خۆم، چونکە هەندێك بەرچاوی بووم ،باخەوانەکە لەسەری سەرەوە دای نابووم، نەبێ بە خۆ هەڵکێشان ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە لە هەموو قۆخەکانی دی درشت و ئاودارتر بووم. هەڵبەتە هەر قۆخێك دەرفەتی خەملینی بۆ بڕەخسێ، درشت و ئاودار دەبێ. مەگەر ئەو قۆخانە کە تەمبەڵی دەکەن و فریوی کرمان دەخۆن و ڕێگایان دەدەن بچنە ناو پێست و دەماریانەوە و تەنانەت ناوکەکەشیان بخۆن. ئەگەر بگەیەنرایینا کن ئاغا ئەوا من بە نسیبی کچە ئازیزو تاقانەکەی ئاغا دەبووم. کچەش بە قێزو بێزەوە قەپێکی لە گۆنام دەگرت و تورِی دەدام.

خۆ ماڵی ئاغا وەکو ماڵی ساحیبعەلی و پۆلا نەبوو کە بە ڕێکەوتیش تاقە زەردەلوویەك یا ئاروویەك یا هەڵوژەیەك لە دەرکی حەوشیان ئاودیوو نەبووبوو.

وەکو باخەوانەکە دەگێڕێتەوە، ئاغا میوە لە ولاتانی هەندەرانەوە بۆ کیژەکەی دێنێ. ڕادەسپێرێ بە فڕۆکە پرتەقاڵ و مۆزو تریێو تەنانەت گوڵیش بۆ کیژەکەی بێنن. دیارە ئەم کارانەش پارەی مۆڵی دەوێ، جا ئیدی بەخۆت حسێب و کتێبان بگرەوەو بزانە جل و بەرگ، قوتابخانە، خۆراك، دکتۆرو پەرستار، خولام و خزمەتکاران، ئەسباب وازیو سەفەرو سیاحەت، گەڕان و سەیرانی کچە ئاغای چەند پارەی تێدەچێ. بلێ مانگی "١٠" هەزار تمەن.. نەخێر هێشتا کەمە. لە مەبەستەکەم دوورکەوتمەوە.

باخەوانەکە قەرتاڵەکەی بە باوەشەوە بوو بە ڕاڕەوی ناوەندنی باخەکەدا دەڕۆیی، کوتوپڕ کونە جرجێك لەبن پێیدا تەپی و خەریك بوو بە دەما بەربێتەوە، بە هەزار ناری عەلی خۆی گرتەوە، قەرتاڵەکە بە توندی لەقی، من خزیم و بەربوومەوە، باخەوانەکە نەدیتم و ڕۆیی.

هەتاو تەواوێ بەرز بوو بوو. زەوی نەختێ گەرم بوو، بەڵام تیشکی هەتاوەکە زۆر گەرم بوو. ڕەنگە لەبەر ئەوەی لەشی خۆم فێنك بوو، بۆیە وامدەزانی هەتاوەکە زۆر گەرمە. گەرما، بەرە بەرە گەییە نێو گیانم، شیلەی لەشم گەرم داهات. ئەوجا گەرما گەییە ناوکەکەم. پاش تۆزێ هەستم بە تینوێتی کرد.

وەختێکی کە لە کن دایکم بووم. هەر کاتێ تینوم بایە ئاوم لێی هەڵدەمژی و خۆم دەدایە هەتاو تا پتر گەرمم بکاتەوە. هەتاو لێی دەدام، گۆناکانم داغ دەبوون، ئاوم لە دایکم هەڵدەمژی. خۆراکم لێی دەخوارد. شیلەی گیانم دەهاتە جۆش و ڕۆژ بە ڕۆژ درشت ترو جوانتر دەبووم. ڕەنگم هەڵدێنا و ئاودارتر دەبووم. سوورترو قورستر دەبووم و باسکی دایکم دادەنەواندەوەو سەمام دەکرد.

دایکم دەیگوت:– ڕۆڵە، بەرخۆڵەی دایکی، نەکەی خۆ لە هەتاو بدزییەوە. هەتاو دۆستی مەیە، زەوی خۆراکمان دەداتێ، هەتاو دەیکولێنی. جوانی تۆ لە ئازایەتی هەتاوە. تۆ تەماشای ئەوانە بکە کە خۆ لە هەتاوی دەدزنەوە بزانە چەند سیسەڵەو ڕەنگ زەردن. کیژم چاك بزانە گەر ڕۆژێك هەتاو لە زەوی بتۆرێو چیدی هەڵنەیەت ئەوا چ خەڵقەندیەکی زیندوو لەسەر ڕووی زەوی نامێنێ، نەگیا و نەگیاندار.

قسەی دایکم کردە گوارەو لە گوێم کرد. تا دەمتوانی خۆم دەدایە بەر هەتاو. گەرمام هەڵدەژی و لە خۆمادا کۆم دەکردەوە.

دەم دی ڕۆژ لە دووی ڕۆژ بەهێزتر دەبووم. هەمیشە لە خۆم دەپرسی ئەگەر ڕۆژێك یەکێك هەتاو بڕەنجێنێ و هەتاو لێمان بتۆرێ چ هەشێ بەسەر خۆدا بکەین؟ چ وەڵامێکم دەست نەدەکەوت، ئان ئاخری لە دایکم پرسی:– دایکە گەر ڕۆژێ یەکێ هەتاوخان بتۆرێنێ و هەتاو خان لێمان زویر بێ چ دەکەین؟

دایکم گەڵاکانی بەروومەتما هێنا، گەردوو تۆزەکەی لێ کردەوە و گوتی:– هەر لە ئێستاوە بیر لە شتی وا دەکەیەوە! دیارە کیژێکی زۆر زیرەك دەردەچی، بەرخۆڵەی دایکی هەتاو لەبەر چەند

کەسێکی خراپ‌و خۆپەسەند لێمان ناتۆرێ، بەڵام لە گوینە ڕۆژێك بێ بەرە بەرە تیشك‌و گەرمای کەم ببێتەوەو بمرێ، ئەوساکە دەبێ مشوری هەتاوێکی دی بخۆین، ئەگینا دەکەوینە تاریکی‌و لە سەرما ڕەق هەڵدێین.

بە ڕاست گەیی بوومە کوێ ؟ ئا، باسی ئەوەم دەکرد کە گەرما گەییە ناوکەکەم‌و تینووم بوو. دوای تۆزێك شیلەی گیانم هاتە جۆش‌و پێستەکەم کەوتە وشکەوەبوون‌و قڵیشان. مێرولەیەکی لۆق درێژ بە هەڵەداوان گەییە سەرم‌و کەوتە خول خواردن بە دەوروبەرما.

کە لە قەرتاڵەکە بەربوومەوە، پێستەکەم لەلایەکەوە قرینجا بوو، نەختێ شیلەم لێ هاتبووە دەرێ‌و هەتاوەکە ڕەقی کردبوو. مێرولەکە تا توانی دەمی تێ ژەند، ماندوو بوو، کەمێك ڕاما. پاشان سەری تێ ژەندەوە، شاخەکانی ڕەپ کردن. لاقەکانی لە عاردی گیرکردن، ئەوەندە بە توندی کەوتە ڕاکێشانی لە دڵی خۆمدا گوتم:- هەنووکە دەمی داغان دەبێ. مێروولەکە کەمێکی دی هێزی دایە خۆ، ئان ئاخری نەختێکی لە شیلە وشکەوە بووەکە بچڕی‌و بە خۆشحاڵی‌و ڕاکە ڕاك دوور کەوتەوە. لەم کاتەدا بوو کە گوێم لە دەنکێك بوو. دوو کەس لە دیوارەکەوە خۆیان هەڵداشتە نێو باخەکە، بە پەلە پەل بەرەو کن من هاتن. ساحیب عەلی‌و پۆلا بوون. هاتبوون ژەمە میوەیەکی تێرو پڕ بخۆن.

وەکو دێهاتیەکانی دی لە تفەنگی باخەوانەکە نەدەترسان. دیهاتییەکانی دی چ قودرەت بوو پێ بەو باخەدا بکەن. کەچی ساحیب عەلی و پۆلا دایمە بە پێ خاوسی‌و لینگ رووتی لە نێو باخەکەدا دەسوڕانەوە.

باخەوانەکە چەند جارێك تەقەی بەسەرا کردبوون، بەڵام ئەوان ڕایان کردبوو، ئەو کاتانە تەمەنیان ٧-٨ ساڵان بوو.

بە کورتی ئەو ڕۆژە بە غاردان هاتن. بەسەر منا بازیان داو چوون بۆ کن دایکم. دوای تۆزێك گەڕانەوە. پەست‌و خەمبار بوون. بە قسەکانیان بۆم دەرکەوت کە لە باخەوانەکە پڕن.

پۆلا دەیگوت: خۆ بەچاوی خۆت دیتت؟ ئەمەش دوا میوەی باخەکە، تاقە دانەیەکیشمان بە قیسمەت نەبوو.

ساحیب عەلی گوتی:- جا چ بکەین؟ یەك مانگی خشتە ئەم نێرە کەرە بە خۆو بە تفەنگی لە بن دارەکە دانیشتووەو جووڵەی بۆ ناکا.

پۆلا گوتی:- سەگبابی نامەرد! تاقە دانەیەکی بۆ نەهێشتووینەوە. کە بە عەزرەتەوە بووم دانەیەك لەو ئاودارانەیان بە تۆبزی بتەپێنمە دەممەوە، خۆزگەم بەپار، بیرتە چەندمان قۆخ خوارد؟

ساحیب عەلی گوتی:- دەڵێی ئێمەمانان بەشەر نین، دەگەڕێ دانە دانە دەیانچنێ‌و دەیبا بۆ ئەو سەگبابە تا خەساریان بکا، خەتای خۆمانە، دەستەو ئەژنۆ دانیشتووین‌و ئەویش بە کەیفی خۆی گوندەکەمان تالان دەکا.

پۆلا گوتی:- دەزانی ساحیب عەلی ئەم باخە یان دەبێ ببێ بەهی گوندەکە یا هەمووی ئاگر دەدەم.

ساحب عەلی گوتی:- دوو بە دوو ئاگری تیٚ بەردەدەین.

پۆلاٚ گوتی:- بیٚ غیرەت بین گەر ئاگری تیٚ بەرنەدەین.

ئەوەندە بە توندیو توڕەیی پێیان بە عاردیدا دەکوتا تەواو ترسام کە بمشێلن، بەلاٚم نەیان شێلام. ڕێك لە بەردەمیانا بووم.

دڕکەزییەك بە پێی پۆلاٚدا چەقی، پۆلاٚ دانەوییەوە دڕکەکە لە پێی دەربێنیٚ. کە چاوی بە من کەوت، لە خۆشیانا دڕکەکەی بیر چوو.

خێرا هەڵی گرتمو بە ساحیب عەلی گوت:- تەماشا! تەماشا.

یەك دەیدامە دەستی ئەوی دیو لە خۆشیانا گەز گەز بالاٚیان دەکرد. دڵیان نەهات هەر بەو دەقەوە بمخۆن. زۆر گەرم بووم، حەزم دەکرد فێنکم بکەنەوەو ئەوجا بمخۆن، تا تامم پتر لە ژێر ددانیاندا بمێنیٚ. دەستی زبرو قڵیشاویان پێستە ناسکەکەی دەڕۆشاندم. بەلاٚم من ئەمەم لەبەر گران نەبوو، چونکە دەمزانی بەو پەڕی لەزەتو ئیشتیاوە دوا تۆزقاڵم دەخۆنو پاشان لێوو پەنجەیان دەلێسنەوەو تامم تا چەند ڕۆژێك لە ژێر ددانیانا دەمێنیٚ.

ساحیب عەلی گوتی:- پۆلاٚ دەزانی تا ئێستا قۆخی وا زلمان نەدیوە.

پۆلاٚ گوتی:- نەخێر نەمان دیوە.

ساحب عەلی گوتی:- با بچین بۆ سەر حەوزەکە، فێنکی بکەینەوە ئەوجا بیخۆین، دەزانی بە فێنکی چەند بەتامە!

ئەوەندە بە وریاییەوە دەیان بردم لەوان وایە شووشەیەکی ناسکمو هەرکە بکەوم وردوخاش دەبم.

سەر حەوزەکە سێبەرو فێنك بوو. بیو هەناره موتوربە کراوەکان سێبەرێکی هێندە فێنکیان کردبوو هەرکە گەیاندمیانە وێندەر ناخم فێنك داهات. خستمیانە ئاوەکەوەو هەر چوار دەستە بچووكو قڵیشاوەکانیان لەبەر دەمم ڕاگرت نەك ئاوەکە ڕام ماڵیٚو بکەومە حەوزەکەوە. ئاوەکە ساردو کەللە تەزێن بوو. پاش کەمێك دانیشتن پۆلاٚ گوتی:- ساحیب عەلی!

ساحب عەلی گوتی:- تۆ بڵیٚ.

پۆلاٚ گوتی:- من دەڵێم ئەم قۆخە زۆر دەکا

ساحیب عەلی گوتی:- وایە.

پۆلاٚ گوتی:- وایە، قسە نیە. ئەگەر دەزانی بڵیٚ بزانم چەند دەکا.

ساحیب عەلی کەمێك تێفکریو گوتی:- منیش دەڵێم زۆر دەکا.

پۆلاٚ گوتی:- یانی چەند؟

ساحیب عەلی لە فکران ڕاچوو، گوتی:- ئەگەر بە تەواوی فێنکی بکەینەوە، بە تەواوەتی ها، هەزار تمەنان دەکا.

پۆلاٚ گوتی:- چونکە پارەی نەدیتوە لەو وایە هەزار، پارەیە.

ساحیب عەلی گوتی:- باشە، شوکر تۆ خەزنەداری بڵیٚ بزانم چەند دەکا.

پۆلاٚ گوتی:- کوڕە هەزار چییە، سەد تمەنیش دەکا.

ساحیب عەلی گوتی:- خۆ هەزار لە سەد زۆرترە.

پۆلا گوتی:- بە گیانی تۆ! ئەم قسەیەم لە گیرفانی خۆ دەرنەهێناوە، لە باوکم بیستووە.

ساحیب عەلی گوتی:- ئەگەر وابێ لەوەیە هەردووکیان هەر یەك بن، چونکە منیش لە باوکم بیستووە.

پۆلا بە ئەسپایی دەستی پێدا هێنام و گوتی:- دەستم تەزی، وابزانم وەختی خواردنی هاتووە. ساحیب عەلیش بە ئەسپایی دەستی پێدا هێنام و گوتی:- ئا، ساردی ساردە.

ئەوسا لە ئاوەکەی دەرێنام. کە لە ئاوەکە دەرهێنرام هەستم بە گەرما کرد. حەزم دەکردتا زووتره بمخۆن و دوا چۆڕی تامی پڕ لەزەتم، نۆشی گیانیان بکەم. حەزم دەکرد گشت ئەو هێزو گەرمایەی لە هەتاو و دایکمەوە وەرگرتبوو برێژمە لەشی ئەم دوو منداڵە دێهاتییەوە.

لەو دەمەدا کە پۆلا و ساحیب عەلی نەخشەی خواردنیان دەکێشام بیرم لەوە دەکردەوە کە لە ژیانما چەند جار گۆڕاوم و چەند جاری دیکەش دەگۆڕێم؟ لە دڵی خۆدا دەمگوت:- ڕۆژێ لە ڕۆژان گەردیلەکانی لەشم، خاك و ئاو بوونە، هەندێکیشانیش تیرێژکی هەتاو بوونە..

دایکم ئەو گەردیلانەی بەرە بەرە لە زەوییەوە هەڵمژیووەو گەیاندونیە ترۆپکی لقەکانی، پاشان چرۆی دەرکردووە. ئەوجا خونچەو پاشتر گوڵ و تا وردە وردە من دروست بوومە. گەردیلەکانی لەشم هێواش هێواش لە لەشی دایکمەوە مژیوەو لەگەڵ گەردیلەکانی تیشکی هەتاو تێکەڵم کردووە تا ناوك و پێست و گۆشتم دروست بووە و بووم بە قۆخێکی گەییو و ئاودار. بەڵام نووکە پۆلا و ساحیب عەلی دەمخۆن و پاش ماوەیەك گەردیلەکانی لەشی من دەبنە بەشێك لە گۆشت و ئێسقانی وان. دیارە ئەوانیش ڕۆژێك لە ڕۆژان دەمرن. ئەو دەمە گەردیلەکانی لەشی من چییان لێ دێ؟

لەسەر خواردنم ڕێك کەوتن. ساحیب عەلی دامییە دەست پۆلا و گوتی یەك قەپی لێبدە.

پۆلا قەپێکی لێدام و دامیەوە دەست ساحیب عەلی و خۆیشی کەوتە لیستنەوەی دەم و لێوی. ساحیب عەلی قەپێکی لێدام و داممییەوە دەست پۆلا.

وەکو چۆن گوتم تام و لەزەتێکی زۆرم دانێ. لەشم بەرەو فەوتان دەچوو، بەڵام ناوکەکە لە کەڵکەڵەی ژیانی تازەدابوو، هەمووی دەقەیەکی دی بوو، ئیدی ئادارم بەسەر پادارمەوە نەدەما، لە قۆخی دەکەوتم، بەڵام ناوکەکەم لە بیری ئەوە دابوو کە چۆن و کەی بڕوێتەوە، لە یەك کاتدا هەم دەمردم و هەم زیندوو دەبوومەوە.

ئاخرجار پۆلا خستمییە دەمییەوەو دوا گەردیلەی نەرمی خواردم. وەختێ لە دەمی دەری هێنامەوە ئیدی قۆخ نەبووم، ناوکێکی زیندوو بووم، تویێکڵێی ڕەقم پێوە بوو، تۆوی ژیانێکی تازەم تێدا هەڵگرتبوو، پێویستم بە نەختێك پشوو و خاکی شێدار بوو تا لە قاوغەکەم دەربێم و سەر لە نوێ بڕوێمەوە.

منداڵەکان چەند جارێك قامك و دەمیان لستەوە. پۆلا گوتی:- هە نووکە چ بکەین؟

ساحیب عەلی گوتی:- مەلە بکەین.

پۆلا گوتی:- ئەدی ناوکەکەی نەخۆین؟

ساحیب عەلی گوتی:– نەء  داینێ کارم پێیەتی.

پۆلا لە بن داربیەکەدا داینام. ئەوجا پاشەو پاش کشایەوە. بازێکی هەڵداو بە پشتا خۆی خستە ئاوەکەوە. ئەژنۆکانی لەبەر ورگیا گرمۆڵە کردو هەردوو دەستی تێ ئالاندن. خۆی کرد بە ژێر ئاوەکەداو دوای تۆزێك هاتە سەر ئاوەکەو بە پێوە وەستا. قوڕە لیتەکەی ژێر ئاوەکە هاڕوژاو دەوربەری لێڵ کرد، ئاوەکە تا ژێر چەنەگەی دەهات. قەوزەی سەر ئاوەکە بە سەرو گوێلاکییەوە نووسا بوو.

ساحیب عەلی گوتی:– پۆلا بەرکە بەولاوە.

پۆلا گوتی:– پانتۆڵەکەت دادەکەنی؟

ساحیب عەلی گوتی:– ئا.. حەز ناکەم بابم بزانێ مەلەمان کردووە، ئەگینا لێم دەدا.

پۆلا گوتی:– هێشتا زۆری ماوە بۆ نیوەڕۆ. وشك دەبییەوە.

ساحیب عەلی گوتی:– زۆری چی، زۆری چی، ئەدی نابینی هەتاو گەییوەتە دیار سەرمان؟

پۆلا بە بێدەنگی بەری کرد بەولاوە. وەختێ ساحیب عەلی شلْپەی لە ئاوەکە هەستاند، پۆلا رووی وەرگێڕایەوەو کەوتە مەلەو شەڕە ئاو. ئەوجا هەردووکیان گوتیان:– درەنگە، ها!

هاتنە دەرێ. پۆلا چەند جارێك لینگی پانتۆڵەکەی گوشی، ئەوجا منیان هەڵگرتو کەوتنە رێ، بە دیواری ئەوسەری باخەکەدا سەرکەوتن‌و خۆیان هەڵدایە ئەو دیوەوە. گوندەکە زۆر لە باخەکەوە دوور بوو.

پۆلا گوتی:– ئێ گوتت کارم پێیەتی.

ساحیب عەلی گوتی:– کە دنیا فێنکی کرد دێم بە شوێنتاو دەچین لەسەر گردەکەدا دادەنیشین‌و پێت دەڵێم چ کارێکم پێیەتی.

کۆلانەکانی گوند چۆڵ بوون، بەلام تەنورەی مێش‌و بۆنی زبڵ‌و پەین مرۆڤی هێڕ دەکرد. گوڵێکی زەلام لەسەر دیوارەکەوە خۆی هەڵدایە بەردەممان. پۆلا دەستێکی بەسەرو گوێلاکی سەگەکەدا هێناو خۆی بە ماڵی خۆیانا کرد. سەگەکەش دوا بەدوای وی وەژوورکەوت.

کۆلانەکە بەخۆی هەوراز بوو، بەرە بەرە بەرزتر دەبوو تا چەند شەقاوێك لەولاترەوە لەگەڵ سەربانەکەی ماڵی پۆلادا دەبوو بە یەك. ساحیب عەلی بەو سەربانانەدا کەوتەڕێ، گەییە ئاستی حەوشەی خۆیان. منی لە ناو دەستیا گوشی‌و خۆی هەڵدایە حەوشەوە تا ئەژنۆی ڕۆچووە ئەو شیاکە تەڕەی کە دایکی سەعاتێ لەوە پێشتر هەڵی خستبوو. دایکی ساحیب عەلی هەرکە گوێی لە خۆ هەڵدانەکەی بوو، لە دەلاقەکەوە سەری کێشاو گوتی:– ساحیب عەلی خێراکە وەرە هەنێ نان‌و ئاو بۆ بابت بەرە.

ساحیب عەلی بردمیە تەویلەکەوە، لە سوچێکاو لەنێو پەیندا چاڵێکی هەڵکەندو منی تێ هاویشت، تاریکی‌و بۆنی پەین هێڕی کردم. نازانم چەند سەعات لەوێ مامەوە. خەریك بوو بخنکێم. ئەنجام هەستم کرد پەینەکەم لەسەر لادەبرێ. ساحیب عەلی بوو. دەری هێنام. یەك دوو جار دەستی پێدا هێنام‌و لە پانتۆڵەکەی هەڵسووم تا پاك بوومەوە. بە هەمان ڕێی خۆمانا کەوتینە ڕێ تا گەیینە سەربانەکەی ماڵی پۆلا. دایك‌و خوشکەکەی پۆلا لە سەربان تەپاڵەیان

دروست دەکردو لەگەڵ ژنێکی دراوسێیاندا کە تەپاڵە وشکەکانی لە دیوار دەکردەوە، سەرگەرمی قسە کردن بوون.

ساحیب عەلی پرسیاری پۆلای لە دایکی کرد. دایکی پۆلا گوتی:- پۆلا بزنەکەی رەوان کردووە، لە ماڵ نییە.

چووینە سەر گردەکە. پۆلا لەوێندەر بوو. بزنەکەی بەڕەلا کردبوو، لە پشت گردەکەوە دەلەوەڕی. بە خۆیشی لەگەڵ سەگەکەیدا لەسەر گردەکە دانیشتبوو و چاوەنۆڕی ئێمە بوو. کە دیقەتی سیمای ساحیب عەلی و پۆلام دا ڕێك ڕەنگیان لە ڕەنگی توێکڵەکەی من دەچوو. هێندە بە رووتی و شڕۆڵەیی بە بەر هەتاوا سوڕابوونەوە رەش هەڵگەڕابوون.

پۆلا بە پەلە پرسی:- ئێ، کارەکەت بڵێ.

ساحیب عەلی گوتی:- حەزدەکەی دار قۆخێکت هەبێ؟

پۆلا گوتی:- ئەی مەعنای چی؟

ساحیب عەلی گوتی:- دە هەستە بابڕۆین.

پۆلا گوتی:- ئەی بزنەکەم؟

ساحیب عەلی گوتی:- دەیبەینەوە بۆ ماڵ.

پۆلا گوتی:- ئاخر دایکم گوتی تا ڕۆژئاوا نەیبەمەوە.

ساحیب عەلی گوتی:- دەباشە سەگەکەی بە دیارەوە دادەنەین.

پۆلا دەستێکی بە سەرو گوێلاکی سەگەکەیدا هێناو گوتی:- ئاگات لە بزنەکە بێ تا دێمەوە، ئێ؟

بەسێ قۆڵی کەوتینەڕێ، گەیشتینە بن دیواری باخەکە.

ساحیب عەلی گوتی:- سەرکەوە.

پۆلا گوتی:- ئا ئێستا زانیم کارەکەت چییە، دەمانەوێ ناوکە قۆخەکە داچێنین.

ساحیب عەلی گوتی:- ئافەرین، ناوکە قۆخەکەمان لە پاڵ خۆڵەکەی ئەو سەری باخەکە دادەچێنین. ئیدی دوای چەند ساڵێك دەبین بە خاوەنی دار قۆخی خۆمان. خۆ دەزانی بۆ لە شوێنێکی دی دای ناچێنین.

پۆلا گوتی:- ئاخر قۆخ لە شوێنی چەقەن و بەردەلان ناڕوێ. ئاوی دەوێ، خاکی نەرمی دەوێ.

ساحیب عەلی گوتی:- دەباشە، مەیکە بە وەعزی ئاخوندان، وا من سەردەکەوم بزانم باخەوانەکە نەگەڕاوەتەوە.

باخەوانەکە هێشتا لە شار نەگەڕابۆوە. پۆلاو ساحیب عەلی لە پشت گردە خۆڵەکەوە چاڵێکیان هەڵکەند. منیان ناشت. دەستێکیان بە سەرما هێناو ڕۆیشتن. خاکی تاریك و شێدار لە باوەشی گرتم. گوشیمی و پێمەوە چەسپی. هەڵبەتە هێشتا نەمدەتوانی بڕۆیم، ماوەیەکم دەویست تا توانای شین بوون پەیدا بکەم. بە ساردی ژێر زەوەکەیدا زانیم زستان هاتوەو بەفر کەوتووەو

زەوی بە ئەندازەی قولانجێك لە سەرووی منەوە بەستی، بەڵام ژێر زەویەکە ئەوەندە گەرم بوو کە من سەرمام نەبێ و بەفر نەمبا.

بەو جۆرە من بە شێوەیەکی کاتی لە جموجوڵ کەوتم و چوومە باوەشی خەوێکی شیرینەوە. خەوتم تا لە بەهارا بە تواناو گوڕێکی زیاترەوە بێدار ببمەوە و بڕۆیم، چەکەرە بکەم، بۆ پۆڵا و ساحیب عەلی ببم بە درەختێکی گەورەو پڕ میوە، درەختێکی پڕ قۆخی درشت و ئاودارو گۆنا ئاڵ چەشنی گۆنای کچانی شەرم کردوو.

ئەو زستانە زۆرم خەون دیتن، زۆریانم بیر چوون و کەمیانم لە یاد ماون. جارێکیان خەونم بینی: بوو بووم بە درەختێکی گەورە. پۆڵاو ساحیب عەلی پێمدا هەڵگەڕابوون. لق و پۆپەکانیان رادەوەشاندم. مندالانی پێ خاوس و لینگ رووتی گوند لە دەورم خڕ ببونەوە. لە حەوادا قۆخیان دەقۆستەوەو وەکو ژەمبردە دەیان تەپاندنە دەمیانەوە. ئاو بەدەم و لەوسیاندا دەچۆڕایەوە، سینگی رووت و زگی هەڵدڕاویانی تەڕ دەکرد، منداڵێکی کەچەڵ لێکدا لێکدا گازی دەکرد. هۆ پۆڵا، ئەرێ پێت نەگوتین ئەم شتە خۆشە ناوی چیە؟ ئاخر کە چوومەوە بە داپیرەم بڵێم چیم خواردوە؟ تەحا کە بە لەزەتە، مرۆڤ لێی تێر نابێ.

دوو منداڵی چکۆلەی ڕووت و قوتیش لەوێندەر بوون. مێشی دنیا لە دەم و کەپوویان هاڵابوو. یەکی قۆخێکی زلیان بە دەستەوە بوو و خێرا خێرا قەپیان لێدەدا.. ..ئەمەیان خەونێکم بوو.

دوا خەویشم بە گوڵە چوالەوە بوو: نەخۆش و بێ هۆش کەوتبووم، کوتوپڕ گوێم بە دەنگێکی ناسك زرینگایەوە. لەگەڵ دەنگەکەدا شەپۆلە بۆنێکی خۆش و ئاشنام بەسەرداهات.

دەنگەکە گوتی:- گوڵە چوالە. وەرە بەرەوە، وەرە بڕێ لەو عەترە بۆن خۆشەت بکە بەم قۆخە جوانەوە، ئەگەر خەبەری نەبۆوە ئەوسا دەست بەسەرو روویا بێنە با بۆنی گوڵ بکا، دەخیلە زوو بێداری بکەوە، چونکە وەختی شین بوون و چەکەرە کردنە، هەموو ناوك و تۆوەکان خەریکن بێدار دەبنەوە.

بۆنی گوڵە چوالە هێند خۆش بوو بە من با قەت هەڵنەستم، بەڵام بە ئاگا هاتمەوە. ویستم دیسان بکەومەوە، کەچی گوڵە چوالەکە پێکەنی و گوتی:- ناز مەکە گیانە، تۆ تۆوی ژیانت لە هەناوتا هەڵگرتووەو بڕیارت داوە بڕوێی و ببی بە درەختێکی گەورەو بەر بگری، وانیە؟

گوڵە چوالە، دەتگوت نۆ بووکەو تارای زیوینی بەفری پۆشیوەو لێوە تەنکەکانی ئاڵ کردووە. من تا ئەو دەمە بەفرم نەدیتبوو، کاتێ کە قۆخ بووم دایکم بۆی باس کردبووم.

دەمویست بزانم گوڵە چوالە پێشتر لەگەڵ کێدا قسەی دەکردو کێ هێنابوویە دیار من. گوڵە چوالە دەستی لە ملم کرد، تێر ماچی کردووم ، بە پێکەنینەوە گوتی:- چەند خرپنی، لە باوەشما جێت نابێتەوە.

پاشان گوتی:- بەهاریش لێرەبوو، دەیگوت وەختی شین بوون و چرۆ کردنە .

کە گوێم لە ناوی بەها بوو، دڵم داخورپا و ڕاچڵەکیم، لە من وابوو بەهار هاتووەو رۆییشتووەو من هێشتا قاوغەکەم نەتەقاندووە، بەم خەیاڵە پەرێشانەوە لە خەو ڕاپەڕیم. سەیرم کرد خاکی تاریك و تەڕ چەشنی دایکیکی دڵسۆز لە هەمێزی گرتووم و دەملاوێنێ.

قاوغەکەم لە دەرێ ڕا خووسا بوو و لە ناوەوە ئارەقی کردبووەوە، تنۆکە ئاو بەسەرما دەڕژان. بەملاو ئەولای لەشما دادەچۆڕان و دەچوونە ژێرم و ناو خاکەکە. چەند گیاکەڵەیەك لە دەوروبەرم بوون و خەریکی ریشە داکوتان بوون. یەکێکیان چەکەرەی کردبوو، ڕەگ و ریشاڵە ناسکەکانی سەریان بەملاوبەولادا دەگێڕا، خۆراك و ئاویان هەڵدەمژی و کۆیان دەکردنەوەو پەیتا پەیتا دەیان ناردنە سەرەوە. رووەکێکی بێگانەی دیش لە تەنیشتمەوە ڕەگێکی بچکۆلەی دەرکردبوو، سەری دانەواندبوو و بەکاوەخۆ بە زەویدا رۆ دەچوو و وردە وردە بەرز دەبۆوە، بڕیاری دابوو بە دوو رۆژی دی چاو بکاتەوەو یەکەم تیرۆژی هەتاو ببێنێ.

ریشاڵێکی تازە لە ژێرمەوە ڕەت دەبوو، کە بەرە بەرە درێژتر دەبوو، ختووکەم پێ دەکەوت، پێدەچوو ریشاڵی دار چوالەکەی قەراغ جۆگەکە بێ، ڕەگی چوالەکەش بەوپەڕی تواناوە شێی زەویەکەو گەردیلە خۆراکەکانی هەڵدەمژی و دەیبردنە ژوورەوە.

ئەو تنۆکە ئاوەی پێمدا دەڕژا، چۆڕاوگەی بەفری سەر زەوی بوو، پاش چەند رۆژێك بڕا. رۆژێ گوێم لە خشە خشێك بوو. دوای تۆزێك هەندێ مێروولەی هاروهاج گەیینە من و دەستیان بە گاز لێگرتنم کرد، مێرووەکان گەرمای هەتاو وبۆنی هەوای بەهاریان لەگەڵ خۆدا هێنابووە ژێر زەوی. بە گاز گرتنەکەیانا بۆم دەرکەوت کە خەریکی کون کردنن. ماوەیەك تێم وڕوکان، کە دیتیان دەرەقەنم نایەن و ناتوانن کونم بکەن ڕێگەکەیان گۆڕێ و لە شوێنێکی دییەوە کەوتنە کون کردن. ئیدی نەم دیتنەوە تا ئەو کاتەی خۆم هاتمە سەر زەوی و بووم بە درەخت.

ئەوەندەم ئاو هەڵمژی بوو، تەواو ئاوسابووم، ئان ئاخیری درز کەوتە توێکڵەکەم و، ئەوسا لەو درزەوە ریشاڵێکی باریکی سپی چەشنی داوە دەزووم ناردە دەرێ تا لە خاك رۆچێ و نەشونما بکا و ببێ بە ڕەگێکی ئەو تۆ کە بتوانم لەسەری ڕابوەستم و بالا دەربکەم .چەکەرەکەم دەرکرد، فێرم کرد کە سەری دابنەوێنێ و بەرەو سەرێ زەوی ببڕێ و بالا دەربکا و بڕوا هەتاو بدۆزێتەوە. سەری چەکەرەکەم، چرۆیەکی وردی پێوە بوو، تا ئەگەر هاتمە سەر زەوی و بووم بە لاسك بیکەم بە گەڵا، تا ڕەگەکەم ببێ بە ڕەگی تەواو و خواردن کۆ بکاتەوە، لەو خواردنەی کە لەناو خۆما هەڵم گرتبوو، دەرخواردی ریشەکەم و چەکەرەکەم دەدا، تا لە ژێر خاکا نەتاسێم و گەرمای هەتاویش بێتە ژوورەوە.

تەواو ئیسراحەتم کردبوو. پێشتر لەناو خۆما گەشەم کردبوو و خۆم لەبەین بردبوو، بوو بووم بەشتێکی دیکە. هەڵبەت ئەو دەمەی ناوك بووم، ناوکێکی تەواو بووم و نەمدەتوانی چیدی بجووڵێم و گەشە بکەم. بەڵام ئێستا کە دەمویست ببم بە درەخت، درەختێکی یەکجار نا تەواو بووم و نەشونما و بزاڤێکی زۆرم لەبەر بوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە رەنگە جیاوازی ناوکی تەواو لەگەڵ درەختێکی ناتەواوا ئەمە بێ کە ناوکی تەواو گەییووەتە بن بەست و ئەگەر نەگۆڕێ دەپوکێتەوە، بەڵام درەختی ناتەواو داهاتوویەکی چاکی لەبەر دەمە.

دیارە هەموو شتێك سات بە سات دەگۆڕێ، وەختێ ئەم گۆڕانانەش کەڵەکە بوون و گەیینە رادەیەکی دیاری کراو دەبینین کە ئەو شتە، شتەکەی جاران نییە و بووە بە شتێکی دیکە. بۆ وێنە من ئێستا ناوك نەبووم، بەڵکو شێوە درەختێك بووم. ڕەگ و لاسکم هەبوون. چرۆ و وردە

گەڵا زەردەکانم لە هەردوو گوپمەوە دەرێنا بووو لەسەر سەری خۆم کۆ کردبوونەوەو بەردەوام بەرز دەبومەوە. دەمویست کاتێ کە هاتمە سەر زەوی گەڵاکانم بدەمە بەر هەتاو تا هەتاو سەوزیان بکا. بیری لق و پۆپی پڕ شکۆفەو قۆخی ئاوداروگوڵ بە دەمەم لە مێشکی خۆدا پەروەردە دەکرد. هەرچەند درەختۆکەیەکی شلك بووم، بەڵام داهاتوویەکی پڕشنگدارم لەڕێ بوو.

ورکە بەردێك پێشی گرتبووم و نەیدەهێشت سەربکەوم و سەیرم کرد بۆم کون ناکرێ، بۆیە بە ناچاری پێچم کردەوەو چوومە سەرێ. تا پتر بەرز دەبوومەوە پتر هەستم بە گەرمای هەتاو دەکرد. پتر بەرەو ڕۆژ هەڵدەکشام. ئێستا بە نێو ڕەگ و ریشەی گیایەکی سەر زەیدا دەجولام. ئەنجام گەییمە شوێنێ کە رووناکی هەتاو کەم و زۆر زەوی رووناك کردبۆوە. زانیم تەنیا تەنکە پێستێکم بە سەرەوە ماوە. پاش چەند سەعاتێك تەکانێکم بە سەرم دا، زەویم شەق کرد، رووناکی و گەرمام بینی کە بەرەو پیرم هاتبوون. ئێستا لەسەر زەوی بووم، ئەو زەوییەی کە دایکی دایکم بووو دایکی من و دایکی هەموو زیندەوەرێکی دیکەشە.

دار چوالەیەکی سەراپا سپی لەو دیو گردە خۆڵەکەوە خۆی دابووە هەتاو و دەبریقایەوە. هێند بە کەیف و بە دەماخ بوو ئۆخژنی خستە نێو دڵ و دەروونی منیشەوە، سلاوم لێکرد، دارچوالە گوتی:– سلاو و هەزار سلاو لە روحی مەهوەشت گیانەکەم، بەخێر هاتی بۆ سەر زەوی، دەنگ و باسی ژێر زەوی؟

بنجە گیاکەڵەکان باڵایان دەرکردبوو، سێبەریان پەیدا کردبوو، بەڵام هێشتا تەنێ دوو وردە گەڵام پێوەبوون و هێواش هێواش سەرم قیت دەکردەوە.

ئەو ڕۆژەی پۆڵا و ساحیب عەلی هاتنە دیدەنیم، ١٠–١٢ گەڵای سەوزم گرتبوون، باڵام لە باڵای هەندێ گیا بەرزتر بوو، گیاکەڵەکان زۆر لە ئێستای من بەرزتر بوون.. هێندە بە پەلە باڵایان دەفڕاند لە من وابوو بە چەند ڕۆژێکی دی لە دار چوالەکەش بەرزتر دەبن، بەڵام کە زانیم ڕەگ و ریشاڵیان لە خاکدا قایم نییە، ئیدی دڵنیا بووم کە زوو سیس دەبن و دەمرن. پۆڵا و عەلی بە دیتنم گەشکەیان کرد. بە جووتە گوتیان:– تازە بووین بە خاوەنی درەختی خۆمان. چەند مستە ئاوێکیان لە جۆگاکە هێنا، ئاویان دام و ڕۆیشتن. پێدەچوو باخەوانەکە خەریکی ئاودانی دێراوەکانی ئەو نزیکانە بێ، چونکە دەنگی بێڵەکەی دەهات.

ئاخرو ئۆخری بە هار بوو. سەیرم کرد بنجە گیاکەڵەکان لە سیس بوونان، تۆوەکەیان بەرە بەرە دەوەری و هێواش هێواش زەرد دەبوون.

هاوین هات، هەرچەندە باڵام بە قەد باڵای وان بوو، بەڵام رووت و قوت چ لقێکم دەرنەکردبوو، دەمویست تۆزێکی دی باڵا دەربکەم و ئەوجا لق باوێم.

پۆڵا و ساحیب عەلی زوو زوو سەریان دەدام. هەندێ جار بەدیارمەوە دادەنیشتن و دەکەوتنە باسی ئایندەی من و نەخشەکانی خۆیان. ڕۆژێکیش سوورە مارێکی بریقەداری کوژراویان لەگەڵ خۆدا هێنابوو. نیومەترێك هێروەی من چاڵێکیان هەڵکەند و تیایاندا ناشت.

پۆڵا دەستەکانی دان بەیەکا و گوتی:– بۆ خۆی چ کەیفێ دەکا!

هەڵبەت مەبەستی من بوو.

ساحیب عەلی گوتی:- هەر ماریێك بەرانبەر بە چەند بار پەین و زبڵە.

پۆلا گوتی:- پێموایە ساڵێکی دی نۆبەرەکەی دەخۆین.

ساحیب عەلی گوتی:- بڵێم چی، ئێمە قەتمان دار قۆخ نەبووە..

پۆلا گوتی:- من بیستوومە کە قۆخ و هەڵوژە زووتر دێنە بەر.

من بە خۆیشم ئەمەم دەزانی. دایکم بە دوو ساڵ بەری گرتبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە کاتێ قۆخەکانم پێبگەن چ دیمەنێکم دەبێ! حەزم دەکرد زووتر بێمەبەر تا بزانم قۆخەکانم چۆن چۆنی شیلەی گیانم دەمژن. حەزم دەکرد قۆخەکانم هێند زل و درشت بن کە لقەکانم دابێنەوە و سەریان بگاتە عاردی.

هاوین رۆیی و پایز هات.

لوولەی باریك باریکم لە نێو لەشما دروست کردبوون. ریشاڵەکانم هەر چییەکیان لە زەوی هەڵمژیبا بەو لوولانەدا دەیان ناردە سەرێ. لە ناوەڕاستی پایز لە چەند شوێنێکەوە لوولەکانم گرتن و ریشاڵەکانم ئیدی شیلەیان نەدەناردە سەرێ. گەڵاکانم کە خۆراکیان پێ نەدەگەیی وردە وردە کەوتنە زەرد بوون. منیش کلکی هەموویانم قرتاند. ئیدی با هەڵی کردو هەمووی وەراندن و رووت بوومەوە. گرێیەکی بچوکم لە شوێنی کلکی هەر گەڵایەکدا بوو.

بە تەمابووم لە بەهاری ئایندەدا هەر یەکێك لەم گرێیانە بکەم بە چرۆ و ببن بە لق. تەگبیری نۆبەرەکەشم کردبوو. دەمویست بچمەوە سەر دایکم و لە دوو ساڵیدا بەر بگرم. چوار پێنج گرێم لە پۆپەمدا هەڵگرتبوو تا بیانکەم بە خونچەو گوڵ. دایمە بیرو خەیاڵم لای گوڵەکانم بوو.

هەرچەندە دنیا ساردتر دەبوو، پتر خەو دای دەگرتم وەختێ بەفر کەوت و زەوی بەستی، من لە غوڕابی خەودا بووم.

پۆلاو ساحیب عەلی دەوریان کەڵەکەچن کردبووم و پارچە گونیەیان تێوە پێچا بووم. ئاخر هێشتا شلك و ناسك بووم، بە تایبەتی لە سەهۆڵ بەندانی زستاندا چاترین خواردنی کەروێشکان بووم. لەوەش بوو سەرما بمبا و ئەوجا لە بەهارا بە ناچاری سەر لە نوێ تێ هەڵچمەوە و لە ژێرەوە بڕوێمەوە. کە بەهار هات، هەوەڵ کەڕەت ڕەگوڕیشەکانم بێدار بوونەوە. ئەوجا شیلە گەییە قەدم و ئەویش بێدار بووەوە، چرۆکانم جمان و کەمێ هەڵئاوسان. ئەو ئاوەی لە زەوییەوە دەمگەیشتێ ئازای ئەندامەکانی بێدار دەکردمەوە و دەیخستنە جوڵە. لە نێو چرۆکاندا گەڵای ورد وردم دروست دەکرد تا هەرکە چرۆکان پشکوتن، گەڵاکان گەورەو پان بکەم. خونچەکانم بە حاڵ لە دەنکە جۆیەك باخۆشتر بوون. تەنێ سێ خونچەم بۆ مابوونەوە، ئەوانی دی چۆلەکەیەکی چاو برسی خواردنی.

سێ گوڵم دروست کردن، سەیرم کرد بۆم بەخێو ناکرێن و نابن بە قۆخ، یەکێکیان سیس بوو، وەری. خواردنم لە دووەمیشیان گرتەوە و ئەویش بە دەردی یەکەمیان چوو. ئیدی خۆم تەرخان کرد کە قۆخێکی هێند بێ وێنەو بێ هاوتا پەروەردە بکەم هەر کەسێك ببینێ ئەبڵەق ببێ، هەر کەسێك بیخوا ئیدی دەم لە میوەیەکی دی نەدا.

چەند رۆژێک پاش گوڵ کردن، پەڕەی گوڵەکەم وەراندو کەوتمە هەڵپێچانی نۆبەرەکەم. نۆبەرەکەم لە نێو کاسی گوڵەکەدا بەخێو دەکرد. پاش هەڵپێچانی نۆبەرەکەم، کاسەکە شەقی بردو نۆبەرەکە بە ئەندازەی چەقالەیەک دەرکەوت. نۆبەرەکەم زۆر لە بەرزی بوو. تۆزێک لە خوار پۆپەمەوە بوو. بۆیە هەر لە بچووکییەوە کەمو زۆر دەی هەژاندمو لاری دەکردمەوە.

منیش هەر لە بیری ئەوەدا بووم کە ئەگەر بمەوێ قۆخێکی بە دڵی خۆ بگرم، دەبێ پشت چەمانو تەنانەت پشت شکانیشم بەلاوە گرنگ نەبێ، بۆیە نەدەبوو لەبەر هەندێک زەحمەت دەستبەرداری نۆبەرەکانم ببمو بێڵم بوەرێ. راستیت دەوێ بڕیارم دابوو لە ساڵانی داهاتوودا هەزار قۆخ بگرم. بۆیە دەبوو لە یەکەم هەنگاوو لە یەکەم قۆخەوە خۆم بچەڕبێنمو بخارێم. ئەو مارەی منداڵەکان لە تەنیشتمەوە ناشتبوویان ئاوێتەی خاکەکە بووبووو زەویەکەی بە پیت کردبوو. لە سایە بەرەکەتی ئەو مارەوە بوو بووم بە خاوەن لقو پۆپی باش.

ماوەیەک بوو پۆلاو ساحیب عەلی کەمتر سەریان دەدام. پێموایە دەچوونە مەزراو لە گێرەو درەو هۆشیدا یاریدەی بابیان دەدا. رۆژێک دوو بە دوو هاتن، دار دەستێکیان لە پاڵمەوە چەقاندو پێوەیان بەستم، وا بزانم هەر ئەو رۆژە بوو کە پۆلا لەنکاودا گوتی:- ساحیب عەلی.

ساحیب عەلی گوتی:- ها دەڵێی چی؟

پۆلا گوتی:- دەڵێم نەکا ئەو باخەوانە سەگبابە درەختەکەمان بدۆزێتەوە.

ساحیب عەلی گوتی:- بیدۆزێتەوە. جا چییە، چی دەکا؟

پۆلا هیچی نەگوت. ساحیب عەلی گوتی:- هیچی پێناکرێ، خۆمان ناشتوومانەو بەخێومان کردووە، بەرەکەشی هی ئێمەیە.

پۆلا لەفکران ڕاچوو بوو. ئەوجا گوتی:- خۆ زەویەکە هی ئێمە نییە.

ساحیب عەلی گوتی:- ئەوجاش هیچی پێناکرێ، زەوی هی ئەو کەسەیە ڕەعەمەلی بێنێ، ئەمێ بستە زەوییەی ئێمە دارەکەمان لێناشتووە هی ئێمەیە.

پۆلا گەشایەوەو گوتی:- وایە، هی ئێمەیە. هەر ناماقوڵیەک بکا هەموو باخەکەی بۆ ئاگر دەدەین.

ساحیب عەلی دەستی کێشا بە سینگی رووتو تاوە گازی خۆیاو گوتی:- ئەم لەشە داڕزێ گەر بیەڵم بحەوێتەوە. باخەکە ئاگر دەدەینو فیرار دەکەین.

پێموایە گەر ئەو رۆژە پۆلاو ساحیب عەلی دارەکەیان نەدابا پاڵم ئەو بایە توندەی شەوێ دەیشکاندم. بەیانی کە تەمەشای دار چوالەکەم کرد دیتم چەند لقێکی شکاوە.

رۆژان تێدەپەڕین. منیش بێ درێغی کەوتبوومە بەخێوکردنی نۆبەرەکەم، دەمدایە بەر تیشکی هەتاو تا ئاڵ بێو گەرما بچەژێ. کیژە قشتەکەم هێند بە توندی خۆی پێوە قرساندبوومو هەڵی دەمژتم، هەندێجار لەشم دەکەوتە ژان، بەڵام هەرگیز لێی تووڕە نەدەبووم. ئاخر تازە بوو بووم بە دایکو خاوەنی کیژێکی قشتیلانە بووم.

ساحیب عەلیو پۆلا هێند سەرگەرمی من بوون، درەختەکانی دیکەیان لەبیر چوو بوو. وەکو ساڵانی رابردوو بۆ قۆخەکانی دایکم لە بۆسە نە دابوو. من خۆم بە موڵکی وان دەزانیو هەقم

دەدانیٚ کە هەر کاتیٚ نۆبەرەکەم بە تەواوی پیٚگەیی بیکەنەوەو وەکو ئەو رۆژەی کە خۆمیان خوارد بوو بە تامو لەزەتەوە بیخۆن.

سەرەتای پایز بوو، پۆلاٚ رۆژیٚك بە تەنیاو خەمبار هاتە کنم. ئەمە یەکەم جار بوو کە یەکیٚکیانم بە تەنیٚ دەبینی. پۆلاٚ بەر لە هەموو شتیٚك ئاوی دام. ئەوجا لەسەر گیایەکان دانیشت. وردە وردە کەوتە دواندنی منو نۆبەرەکەمو گوتی:- ئەی دار قۆخەکەم، قۆخە قشتیلەکەم، دەزانی چی قەوماوە؟ دەزانی بۆ ئەورۆ بە تەنیام؟ ویٚناچیٚ بزانی . ساحیب عەلی مرد. مار پیٚوەی دا.

(دایە مەنجوقی پیریٚژن) شەویٚکی تەواو بە دیاریەوە بوو، ئەویش چ کاریٚکی لە دەست نەهات. هەر دەرمانیٚکی داوا کرد، منو بابی ساحیب عەلی لە دەشتو کیٚوان بۆمان هیٚنا، بەلاٚم ساحیب عەلی هەر چاك نەبۆوە. بەستەزمان ساحیب عەلی! ئاخر بۆ کۆچت کردو منت بە تەنیٚ جیٚ هیٚشت؟.

پۆلاٚ دایکورکاند. دیسان کەوتەوە قسان:- چەند رۆژیٚ لەوەو پیٚش وەختیٚ نیوەڕۆ لە دەشت دەگەڕاینەوە لەسەر گردەکە تووشی یەکدی بووین. بڕیارمان دا بچین ماریٚك بگرینو وەکو پارەکە لە تەنیشت تۆوە بینیٚژین، تا خاکاکەی ژیٚرت بە قوەت بیٚ. چووین بۆ دۆلٚی ماران، دۆلٚی ماران ناوەکەی بەخۆیەوەیە، یەکپارچە مارە. دیویٚکی دۆلٚەکە کیٚویٚکی بەردەلاٚنی هەزار بە هەزارە. کیٚوەکە یەك پارچەی سافو لووس نییە، نەخیٚر هەمووی تاویٚری زلو بچووکەو بەسەر یەکا کەوتوون. مارەکان لە بەینی بەردەکانا هیٚلانەیان کردووە، کە گەرمایان لیٚدەدا دیٚنە دەریٚ.

زەوی ئیٚمەو هاوسیٚکەمانو خالۆزاکەی ساحیب عەلیو چەند مالٚیٚکی دیکەش لە دۆلٚی مارانە. ئەو زەویانە پڕن لە مار.

منو ساحیب عەلی لە بناری کیٚوەکەدا بە دووی مارا دەگەڕاین، دار دەستەکانمان بە کونەکانا دەکرد تا ماریٚکی قەلٚەو و چەورت بۆ بکوژین. هەردووکمان رووتو قووت یەکی پانتۆلٚیٚکمان لەبەر دا بوو. پشتمان وا داغ بوو بوو هیٚلکەت لەسەری دانابا دەبرژا. بە دەمگەڕانەوە ئەم تاویٚرو ئەو تاویٚرمان دەکرد. لە پڕ ساحیب عەلی خزیو بە پشتا بەر بۆوەو یەك بە خۆی قیژاندی.

تومەز بە پشتا کەوتبوو سەر تاویٚریٚكو ماریٚك لەسەر ئەو تاویٚرە پەپکەی خواردبوو. ساحیب عەلی هاواری دووەمی کردو بەرەو نیٚو دۆلٚەکە تل بۆوە. ئیدی بواری مارەکەم نەدا، داریٚکم بەسەریا کیٚشا، ئەوجا بەناوقەدیا و جاریٚکی دی بەسەریا. دوو مشكو چۆلەکەیەکی لە سکا بوو.

ساحیب عەلی بورابۆوە. داردەستەکەی پەڕی بوو. جیٚ کەلٚبەی مارەکە سوور سوور بوو بۆوە. ئەگەر بە لاقییەوە یا بە دەستییەوە دابا دەمزانی چی لیٚبکەم. بەلاٚم چی لە گازەرای پشتی بکەم؟ ناچار ساحیب عەلیم دا بە کۆلٚما و هیٚنامەوە بۆ گوندی. (دایە مەنجوقی پیریٚژن) بەیانی لەسەر قەبران بە دایکی گوتبووم ئەگەر من زووتر ساحیب عەلیم گەیەندبا کن ئەو نە دەمرد. ئاخر چۆنم دەتوانی ساحیب عەلی بگەیەنمە کنی. ئەی دار قۆخەکە تۆ بۆ خۆت دەزانی ساحیب عەلی لە من قورستر بوو. ئەگەر ولاٚخم پیٚبوایەو دووام خستبا ئەوا دایکە منجوق هەقی بوو بلٚیٚ دووام خستووە. ئاخر لەوەی پتر چ کاریٚکی دیکەم لە دەست دەهات؟

پۆلا دیسان دەستی بە گریان کردەوە. من ئێستا دەمزانی کە ساحیب عەلی و پۆلام زۆر خۆشویستوون. وەختێ ئەوەم هێنایە بەرچاوی خۆم کە چیدی ساحیب عەلی نابینم خەریك بوو لە خەفەتاندا هەموو گەڵاکانم بوەرێ و بە یەکجاری وشك ببم و چیدی چرۆ نەکەم.

پۆلا لە گریان کەوت و گوتی:- من ئیدی ناتوانم لە گوندی وەمێنم. روو دەکەمە هەر شوێنێ شێوەی ساحیب عەلی دێتە بەرچاوم و خەفەت دەخۆم. کە دەچمە کێوی، بزنە رەش دەبەمە لەوەڕ کە دەست بەسەر سەگەکەما دێنم، کە بەسەر تەپاڵەو سەرگینا دەڕۆم، کە لەگەڵ منداڵانی دیدا دەچینە کولوگرتن و مارمێلکە کوشتن، کە دەچمە گیا دورین، کە دەچمە سەربانان، هەمیشە شێوەی ساحیب عەلیم لەبەر چاوە. لە من وایە هەمیشە گازم دەکا: پۆلا!... پۆلا!...

بەڵێ دار قۆخەکە من ناتوانم ئەو دەنگە بژنەوم. دەمەوێت بچمە شاری و لەلای و خاڵۆم ببمە شاگرد بە قالێ. نووکە نازانم چیبکەم تا منیش وەکو ئەو کوتوپڕ نەکەوم و بمرم. من بچکۆلەم، ئەقڵم بە هیچ شتێکا ناشکێ. هەر ئەوەندە دەزانم کە ناتوانم لە گوندا وەمێنم. ئەوا من رۆیم ئەی دار قۆخەکە. نۆبەرەکەشت بۆ خۆت.

کە دیتم پۆلا لەسەر ڕۆیشتنە، قۆخەکەم خستە بەر پێی. قۆخەکەی هەڵگرت، بۆنێکی پێوە کرد، ئەوجا بە دەست خۆڵەکەی لێپاك کردەوەو دەستی نازی بەسەر مندا هێناو لێیدا رۆیی.

ساڵی داهاتوو، تەواو بالام رفاندبوو، لق و پۆپی چاکم هاویشتبوو. بیست دانە گوڵم کردبوو. دەمتوانی لە گردۆڵکە خۆڵەکەوە سەر هەڵبڕم و سەیری ئەوبەری باخەکە بکەم.

رۆژێ باخەوانەکە هەستی بە سەرە تاتکێی من کردو خۆی گەیاندمێ، لە خۆشیا نەدەحەوایەوە. بە شێوەو رەنگ و گەڵاو گوڵا بۆی دەرکەوت کە منداڵی کێم. دار قۆخێکی رەسەن لە باخەکەی دا ڕوا بوو بێئەوەی چ زەحمەتێکی پێوە کێشا بێ. زۆرم پێ ناخۆش بوو کە کەوتمە دەستی باخەوانێك بە خۆی نۆکەری ئاغا بوو، لەبەر خاتری پارە خەڵکی گوندەکەی کردبوو بە دوژمنی خۆی.

١٠- ١٥ قۆخم گرتبوو، بەلام کە بیرم لەوە دەکردەوە ئەم قۆخانە بۆ کێ دەبن رقم لە خۆ دەبۆوە. پۆلاو ساحیب عەلی منیان ناشتبوو، گەورەیان کردبووم. هەق وابوو ئەوان قۆخەکانیان خواردبام.

رۆژێك بیرێکم بە مێشکا هات و ئیدی لەو رۆژەوە کەوتمە هەڵوەراندنی قۆخەکانم. باخەوانەکە وەختێ بینی قۆخەکانم وەریون. وایزانی شوێنەکەم خراپە، بە دەنگی بەرز گوتی:- قەیدی نییە ساڵێکی دی شوێنەکەت دەگۆڕم تا بتوانی ئاوی باش بخۆیتەوەو قۆخی درشت و جوان بگری.

بەهاری ساڵی ئایندە، وەختێ ریشاڵەکانم بێدار کردنەوە، دیتم هەموویان تێکچوون، هەندێکیان بە یەکجاری وشك بوون، هەندێکیان هەڵبزڕکاون. هەڵبەتە گەلێ ریشەی ساغیشم مابوون. یەکەمجار ڕیشە ساغەکانم بەرەو ناخی زەوی ناردن. ئەوجا ڕیشەی نوێم دەرکرد، پاشان کەوتمە بیری چرۆکردن و گەڵاو شکۆفە دەرکردن. دایکی خۆم ناسییەوە.

لەو ساوە تا ئێستا کە نازانم تەمەنم چەند ساڵە باخەوانەکە تاقە قۆخێکی لێ سفتاح نەکردووم و لە ئێستاش بە دوواوە نایکا.

چونکە بە مەیلی وی ناکەم. هەنووکەش جاریٚ هەڕەشەی بڕینـەوەم لیٚدەکا و جاریٚ بـە قوربـان و سەدەقەم دەبیٚ...

هاوینی ١٣٤٧=١٩٦٨

## ماسییه ڕەشه بچكۆلەكه

شـەوی چله بـوو. ماسییەكی پیر لـه بنـی دەریـادا، (١٠– ١٢) هـەزار بێچـووڵەی خـۆی لـه دەوری خۆی گرد كردبۆوه، نەقڵی بۆ دەگێڕانەوه.

یەكێ بوو، یەكێ نەبوو، ماسییەكی ڕەشی چكۆله هەبوو لەگەڵ دایكیا له جۆبارێگا دەژیا. ئەم جۆباره له نێو تاوێری سەختی كێوانەوه هەڵدەقولاو به دۆڵێدا دەكشا. ماڵی ماسییه بچكۆلەكەو دایكی له بن بەردێكی ڕەشی قەوزه گرتوودا بوو. شەوان دوو به دوو لەبن قەوزەكاندا دەنووستن.

ماسییه ڕەشه به عەزرەتەوه بوو گەر بۆ جارێكیش بووه هەتاو له ماڵەكەیانا بدینێ!.

دایـكو بێچـوو ڕۆژ تـا ئێـوارێ بـه دووی یەكـەوه بـوون، جارجـاریش تێكـەڵاوی ماسـی دی دەبوونو خێرا خێرا خۆیان به شوێنێكا دەكردو دەگەڕانەوه. ئەم بێچووه، تاقانه بوو. دایكی ١٠ هەزار هێلكەی كردبوو تەنها ئەمی لێهاتبووه بەر.

چەند ڕۆژێك بوو ماسییه چكۆل له گڕ فكران ڕاچوو بوو، زۆر به كەمی داخاوت. زۆریـش لـه دایكی جێدەما. دایكی پێی وابوو منداڵەكەی بڕێك بێتاقەتو نەساغەو زوو چاك دەبێتـەوه، بـەلاّم دەردی ماسییه ڕەش شتێكی دی بوو.

ڕۆژێكیان ماسییه چكۆل، سپێدە زوو دایكی له خەو هەستاندو گوتی:– دایكه دەمـەوێ چـەند قسەیەكت لەگەڵ بكەم.

دایكـی به خەواڵووییـەوه گـوتی:– جا ڕۆڵـه گیـان نووكـه وەخـتی قسانه! قسـەكەت هـەڵگره بۆ پاشی، بچینه گەڕانی چاتر نییه؟

ماسییه چكۆل گوتی:– نا. دایكه من تاقەتی گەڕانم نەماوه، دەبێ لێره بڕۆم.

دایكی گوتی:– یانی هەر دەبێ بڕۆی ؟

ماسییه چكۆل گوتی:– بەڵێ دایكه هەر دەبێ بڕۆم.

دایكی گوتی:– ئاخر بەم بەیانییه زووه كێوه دەچی؟

ماسـییه ڕەشـه چـكۆڵ گـوتی:– دەمـەوێ بـڕۆمو كۆتـایی جۆبارەكـه بدۆزمـەوه، دەزانـی دایكـه! ئەوه چـەند مانگێكـه لـه خولیـای ئەوەدام بزانم كۆتـایی جۆبارەكه لـه كوێنـدەرەو، ئێسـتا و ئێسـتا ئـاقڵم بـه هـیچ كـوێ ڕانەگـەیی، لـه دوێـنێ شـەوەوه خـەو نەچـووەته چاومو هـەر بـیرم كردۆتـەوه، ئەنجام بڕیارم به خۆم دا بڕۆمو كۆتایی جۆبارەكه بدۆزمـەوه، حەزدەكـەم خەبـەرو باسـی شـوێنانی دی بزانم.

دایكـی پێكـەنیو گـوتی:– مـنـیش كـه مـنـداڵ بـووم، زۆرم بـیر لـەو شـتانه دەكـردەوه، ئـاخر بەرخۆڵەی دایكێ! جۆبار سەرەتاو كۆتایی نییه، هەر ئەوەیه كه دەیبینی، جۆبـار بـەردەوام دەڕواو ناگاته هیچ شوێنێ.

ماسییه ڕەشه چكۆل گوتی:– ئەدی دایكه گیان، هەموو شتێك كۆتایی نییـه؟ شـەو دوایـی دێ. ڕۆژ دوایی دێ، هەفته، مانگو ساڵ...، دواییان دێ.

دایکە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:- واز لەم قسە زلانە بێنە. هەستە با بچینە گەڕانێ، هەنووکە وەختی گەڕانێیە نەك ئەم قسانە.

ماسییە ڕەشە بچکۆل گوتی:- نا دایکە، لەم جۆرە گەڕانانە وەڕز بووم، دەمەوێ بڕۆم و بزانم لە شوێنانی دی چ خەبەرو باسە. ڕەنگە بڵێی یەکێك ئەم شتانەی خستووەتە مێشکی ماسییە چکۆلەوە، بەلاّم دڵنیابە، خۆم دەمێکە لەم بیرەدام، هەڵبەتە زۆر شتیش لەم و لەوەوە فێر بووم، بۆ وێنە ئەمەم زانیوە کە زۆربەی ماسییان وەختێ پیر دەبن گازاندە دەکەن کە ژیانیان بە فیڕۆ چووە. هەمیشە ناڕەزایی دەردەبڕن و گلەیی لە هەموو شتێك دەکەن. ڕاستییەکەی من دەمەوێ بزانم ژیان هەر ئەمەیە کە بەردەوام لە یەك شوێنان بی تا پیر دەبی و تەواو، یا دەکرێ لە دنیادا بە شێوەی دیکەش بژی ؟

وەختێ ماسییە چکۆل قسەکانی تەواو کرد. دایکە گوتی:- رۆڵە گیان! ئەوە تۆ تێکچووی؟ دنیا!... دنیای چی؟ دنیا ئەم شوێنەیە کە ئێمە تێیداین، ژیانیش ئەمەیە کە ئێمە هەمانە.

رێك لەم کاتەدا ماسییەکی گەورە لە ماڵی ئەوان نزیك بووەوەو گوتی:- هاوسێ! ئەوە مشتومڕی چیتانە، دەڵێی ئەوڕۆ نیازی گەڕانتان نییە؟

دایکە ماسی بە دەنگی دراوسێکەیەوە، لە ژوور وەدەرکەوت و گوتی:- چ زەمانێ تێی کەوتووین، ئەوجا نۆرەی ئەوەیە منداڵان دەرسی دایکیان دابدەن!

دراوسێکەیان گوتی:- چۆن؟

دایکە ماسی گوتی:- تۆ بزانە ئەو بستە منداڵە دەیەوێ کێوە بچێ! دایمە دەڵێ دەمەوێ بڕۆم بزانم لە دنیا چ خەبەرو باسە ! تۆ بنۆڕە ئەم قسە زلانە .

هاوسێکەیان گوتی:- بچکۆل! ئەوە لە کەنگێوە بوویە زاناو فەیلەسوف و بەئێمەت نەگوتووە؟!

ماسییە چکۆل گوتی:- خانم من نازانم تۆ بە چ دەڵێی (زاناو فەیلەسوف) من هەر ئەوەندەی دەزانم لەم گەڕانەی وەڕزم. نامەوێ بە گەڕانی بێهودەو خۆڕایی دڵی خۆ خۆش بکەم و کاتێ بەخۆ بزانم پیرو کەلەلا بووم و هەر هەمان ماسی چاوو گوێ نەکراوەم.

دراوسێ گوتی:- ئەیەڕۆ!... لەم قسانە!

دایکی گوتی:- قەت باوەڕم نەدەکرد تاقانەکەم بەمجۆرە دەربچێ. نازانم چ نارەسەنێك چووتە بن کلێشەی بێچووە نازدارەکەمەوە.

ماسییە چکۆل گوتی:- نەخێر کەس لە خشتەی نەبردووم، بە خۆم ئاقڵ و هۆشم هەن، تێ دەگەم، چاوم هەن و دەبینم.

دراوسێ، بە دایکی ماسییە چکۆلی گوت:- خوشکێ بۆی مەگەڕێ! ئەو هێلکە شەیتانۆکە پێچ پێچەیە، لە بیرتە؟

دایك گوتی:- ڕاست دەکەی، زۆر دەورو خولی بێچووەکەی دەدام. دەك خوا... نازانم چی لێ بکا!.

ماسییە چکۆل گوتی:- بەسە دایکە ! ئەو هاوڕێم بوو.

**دایکی گوتی:– نۆبەتی ئەو قەوانەیە. گەییومەتە ئەم تەمەنەو هاوڕێیاتی ماسی و هێلکە شەیتانۆکەم نەبیستووە!**

**ماسیيه چكۆل گوتی:– منیش دوژمنایەتی ماسی و هێلکە شەیتانۆکەم نەبیستووە، بەلاّم ئێوە سەری ئەو بەلەنگازەتان بە فەتارەت دا.**

**دایك گوتی:– بەسە، کای کۆن بە با مەکە.**

**ماسییە چکۆل گوتی:– بە خۆتان ئەو مەسەلەیەتان هێناوە گۆڕێ.**

**دایکی گوتی:– مستەحەقی کوشتن بوو، بیرت نەماوە کە لەملاو لەولا چ قسەگەلێکی دەکرد؟**

**ماسییە چکۆل گوتی:– کەواتە منیش بکوژن، چونکە منیش هەمان ئەو قسانە دەکەم.**

**سەرتان نەیەشێنم! ماسییەکانی دیکەش بە دەنگی مشتومڕەکەوە هاتنە وێندەر. قسەکانی ماسییە چکۆل هەموویانی توڕە کردبوو.**

**یەکێك لە ماسییە پیرەکان گوتی:– چما پێت وایە ڕۆحمت پێدا دەکەین؟**

**یەکێکی دی گوتی:– بەشی یەك زللەیە!**

**یەکێکی دی گوتی:– خانم. کە منداڵت وەکو پێویست تەربیەت نەدەی دەبێ سزاکەش بدەی.**

**دراوسێکە گوتی:– من پێم شەرمە دراوسێی ئێوەم.**

**یەکێکی دی گوتی:– تا کار لە کار نەترازاوە با بینێرینە کن هێلکە شەیتانۆکە پیرەکەی.**

**هەرکە ماسییەکان کەوتنە خۆ تا ماسییە چکۆل بگرن. دۆستەکانی دەوریان گرت و لە شەڕەکەیان دوورخستەوە. دایکی ماسییە ڕەش بە سینگ کوتان و گریانەوە دەیگوت:– وەیەڕۆ منداڵەکەم لە دەست دەچێ، جا من چ بکەم! چ هەشێ بەسەر خۆدا بکەم؟**

**ماسییە چکۆل گوتی:– دایکە بۆ من مەگری، بۆ ئەم ماسییە داماوانە بگری.**

**یەکێك لە ماسییەکان لە دوورەوە هاواری کرد:– قسەی زیاد مەکە فیسقە گولە.**

**دووەم گوتی:– بڕۆ، بەلاّم کە ژێوان بوویەوە وەرت ناگرینەوە ها.**

**سێیەم گوتی:– ئەمە کەش و فشی تاڤی گەنجییە، نەڕۆی!**

**چوارەم گوتی:– چما ئێرە عەیبی چییە؟**

**پێنجەم: گوتی:– چ دنیایەکی دی لە گۆڕێ نییە، دنیا هەر ئێرەیە، بگەڕێوە!**

**شەشەم گوتی:– ئەگەر ئاقڵ بی و بگەڕێیتەوە، ئەوسا باوەڕ دەکەین کە بەڕاستی ماسییەکی فامیدەی.**

**حەوتەم گوتی:– ئاخر ئێمە لەگەڵ تۆدا ڕاهاتووین...**

**دایکی گوتی:– بەزەییت بە مندا بێتەوە، مەڕۆ، مەڕۆ!**

**ماسییە چکۆل چ قسەیەکی دی لەگەڵدا نەکردن، چەند دۆستێکی هاوتەمەنی خۆی تاکو تاڤگەکە بەڕێیان کردو گەڕانەوە. ماسییە چکۆل وەختێ لەوان جیا بۆوە گوتی:– دۆستان بە هیوای دیدار. لەبیرم مەکەن.**

دۆستەکانی گوتیان:- چۆنت فەرامۆش دەکەین؟ تۆ ئێمەت لە کەروێشکە خەو خەبەر کردەوە، شتی وات فێرکردین کە پێشتر بیریشمان لێنەکردبۆوە، بە هیوای دیدار ئەی دۆستی زاناو چاو نەترس.

ماسییە چکۆل لە تاڤگەکە هاتە خواریێو کەوتە نێو گۆلاوێکەوە، هەڵەوەجار پەشۆکا، بەڵام پاشان کەوتە مەلەکردن و گەڕان بە دەوری گۆلاوەکەدا، تا ئەو ساتە قەتی ئەوەندە ئاو لە یەك جێدا نەدیبوو، هەزاران سەرە مێکوتە لە نێو ئاوەکەدا دەخولانەوە، کە ماسییە چکۆلەیان دی، کەوتنە پەلار هاویشتن و تانەو توانج، تۆ تەماشای سەرو فەساڵی! ئەریێ تۆ چ گیانلەبەرێکی؟

ماسییە چکۆل تەواو دیقەتی دان و گوتی:- تکایە قەشمەری مەکەن، من نێوم ماسییە ڕەشە چکۆلە، ئەنگۆش نێوی خۆتانم پێ بڵێن با یەکدی بناسین. یەکێك لە سەرەمێکوتەکان گوتی: - ئێمە بە یەکدی دەڵێین سەرەمێکوتە.

یەکێکی دی گوتی:- رەسەن و نەجیب و خانەدانین.

یەکێکی دی گوتی:- لە دنیادا لە ئێمە جوانتر نییە.

یەکێکی دی گوتی:- وەکو تۆ شەپڕێوو بەدفەساڵ نین.

ماسییە چکۆلە گوتی:- پێم وانەبوو ئەوەندە خۆپەسندو بوغرا بن، بەڵام قەیدی نییە، من دەتان بورم، چونکە ئەم قسانە لە ڕووی نەزانینەوە دەکەن.

سەرەمێکوتەکان تێکڕا گوتیان:- یانی ئێمە نەزانین؟

ماسییە چکۆل گوتی:- ئەگەر نەزان نەبان دەتانزانی لە دنیادا گەلێکی دی هەن و سەرو فەساڵی خۆیان بەلاوە جوان و شیرینە! ئەنگۆ کە ئەوەندە لە خۆ ڕازین تەنانەت ناوەکەشتان هی خۆتان نییە.

سەرەمێکوتەکان زۆر تووڕە بوون، بەڵام کە دیتیان قسەی ماسییە چکۆل ڕاستە، قسەکەی خۆیان گۆڕی و گوتیان:- تۆ بە خۆڕایی خۆت ماندوو دەکەی، ئێمە هەموو رۆژێ لە بەیانییەوە تا ئێواری دنیا دەگەڕێین، لە خۆمان و باب و دایکمان بەولاوە کەسی دی نابینین. خۆ وردە کرم چ نین و قەپان نایان خوێنێتەوە. ماسییە چکۆل گوتی:- ئەنگۆ کە بە بست لەم گۆلاوەی دوور ناکەونەوە ،چۆن دەم لە دنیاگەڕی دەکوتن؟

سەرە مێکوتەکان گوتیان:- چما بێ لەم گۆلاوە دنیایەکی دی هەیە ؟

ماسییە چکۆل گوتی:- هەر نەبێ پێویستە لە خۆ بپرسن کە ئاوی ئەم گۆلاوە لە کوێوە دێ، لە دەرێی ئەم گۆلاوە چ هەن؟

سەرە مێکوتەکان گوتیان:- دەرێی گۆلاوەکە؟ ئێمە هەرگیز دەرێی گۆلاوەکەمان نەدیتووە... ها ها... هاها.. تۆ تێکچووی بابە؟

ماسییە چکۆل پێکەنی، ڕاما، دیتی ئەگەر سەرەمێکوتەکان بەجێ بێڵێ و بڕوا زۆر چاترە، پاشان بیری کردەوە کە واچاکە دوو قسەش لەگەڵ دایکیان بکا، گوتی:- ئەرێ دایکتان لە کوێیە؟

دەنگی نزمی بۆقێك ڕایچڵەکاند. بۆقەکە لە قەراغ گۆلەکەو لەسەر بەردێك مت بوو بوو، بازێکی دایە نێو ئاوەکەو هاتە بەردەم ماسییە چکۆڵ و گوتی:- ئەوەتام ئەمرکە ؟

ماسییە چکۆڵ گوتی:- سەلاو ، خانمی گەورە!

بۆقەکە گوتی:- هەنووکە کەی وەختی خۆ نواندنە، هەی نارەسەنی نانەجیب، منداڵەکانت بە گیر هێناوەو قسەی زلیان بۆ دەکەی! من ئەوەندەم تەمەن رانیوە کە دڵنیابم دنیا هەر ئەم گۆلەیەو بڕایەوە، چاکتر وایە بە دووی کاری خۆتا بڕۆی و منداڵەکانی من لە ڕێ دەرنەکەی.

ماسییە چکۆڵ گوتی:- هەزار ئەوەندەی دیکەش بەمجۆرە بژیت هەر بۆقێکی نەزان و داماویت.

بۆقەکە تووڕە بوو، خۆی بەرەو ماسییەکە هەڵدا. ماسییەکە راپەڕی و وەکو بروسکە بۆی دەرچوو، قوڕە لیتەو کرمی بن گۆمەکەی شلەقاند.

دۆڵەکە پڕ بوو لە پێچ و دەورە. ئاوی جۆبارەکە زۆر زیادی کردبوو، بەڵام ئەگەر لەسەر کێوەکەوە سەیرت کردبا لە تۆ وایە داوە دەزوویەکی سپییە. لە شوێنێکا گا بەردێك لە کێوەکە گل بوو بووەوەو کەوتبووە ناوەندەی چۆمەکەوەو ئاوەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە. مار مێلکەیەکی زلە، بە ئەندازەی ناو لەپێ، زگی نووساندبوو بە گا بەردەکەوەو خۆی دابووە هەتاو ،دەیڕوانییە ئەو قرژاڵە پانکۆڵەیەی کە لەسەر چەوو زیخی بن ئاوەکە وەستا بوو و سەرگەرمی خواردنی ئەو بۆقە بوو کە ڕاوی کردبوو. ماسییە ڕەشە چکۆڵ کە چاوی بە قرژاڵەکە کەوت ترساو سڵەمییەوە. لە دوورەوە سڵاوی لێکرد. قرژاڵەکە خێسەیەکی لێکردو گوتی:- چ ماسییەکی ئاقڵ و بە ئەدەبی! وەرە بەرەوە بچکۆڵ، وەرە!

ماسییە چکۆڵ گوتی:- دەچمە گەڕان تا دنیا ببینم و ناشمەوێ ببم بە نێچری جەناب عالیت.

قرژاڵەکە گوتی:- بۆ ئەوەندە بە گومان و ترسنۆکی ماسییە چکۆڵ؟

ماسییە چکۆڵ گوتی:- من نە بە گومانم و نە ترسنۆك، ئەوە دەڵێم کە چاوم دەیبینێ و مێشکم دەرکی دەکا.

قرژاڵەکە گوتی:- زۆر چاکە، فەرموو بزانم چاوت چی بینی و مێشکت چی دەرك کرد کە پێت وابێ من قەستی ڕاوکردنی تۆم هەیە.

ماسییە چکۆڵ گوتی:- ئیتر، خۆت دەیزانی!

قرژاڵەکە گوتی:- مەبەستت ئەم بۆقەیە؟ تۆ منداڵی بابە! من لەگەڵ بۆقاندا دوژمنم، بۆیە ڕاویان دەکەم. ئەمانە خۆیان بە تاقە زیندەوەری دنیا دەزانن و بەختەوەریشن. جا دەمەوێ تێیان بگەیەنم کە دنیا هی کێیە؟ ئیدی تۆ چ ترسێکت نەبێ گیانم! وەرە بەرەوە، وەرە!

قرژاڵەکە ئەم قسانەی گوتن و پاشەو پاش بەرەو ماسییە چکۆڵ کەوتە ڕێ. هێند عەنتیکە ڕێی دەکرد کە ماسییەکە کەوتە پێکەنین و گوتی:- ژارۆ! تۆ هێشتا نازانی ڕێ بکەی، ئیدی چۆن دەزانی دنیا هی کێیە ؟

ماسییە ڕەشە نەختێك لە قرژاڵەکە دوور کەوتەوە، سێبەرێك کەوتە سەر ئاوەکە و کوتوپڕ چەپۆکێکی توند قرژاڵەی لە چەوو زیخەکەدا چەقاند. مارمیلەکەکە ئەوەندە بە دیمەنی قرژاڵەکە

پێکەنی کە خزیو خەریك بوو بکەوێتە ئاوەکەوە. قرژاڵەکە لە جێی خۆی چەقیو لە جوڵە کەوت. ماسییە چکۆل سەیری کرد شوانیٚ لە قەراغ ئاوەکە وەستاوەو سەیری ئەو و قرژاڵەکە دەکا. پەزەکەی لە ئاوەکە نزیك بوونەوەو دەمیان نا بە ئاوەکەوە. دەنگی باعە باعو بارەبارِ دۆڵەکەی پڕ کردبوو.

ماسییە چکۆل ڕاوەستا تا مەڕو بزنەکان پاراو بوونو ڕۆییشتن ئەوسا مارمیلەکەکەی گاز کردو گوتی:– مارمێلەکە گیان! من ماسییەکی چکۆلەمو دەمەویٚ کۆتایی جۆبارەکە پەیدا بکەم. پێموایە تۆ زیندەوەرێکی ئاقڵو زانای، بۆیە دەمەویٚ شتێکت لێبپرسم.

مارمێلکەکە گوتی:– چیت دەویٚ بپرسە.

ماسییەکە گوتی:– لە ڕێگادا بە مورغی سەقاو، هەڕە ماسیو ماسیگرە دەیان ترساندم، ئەگەر تۆ شتێك دەربارەی ئەمانە دەزانی پێم بڵیٚ.

مارمێلکەکە گوتی:– هەڕە ماسیو ماسیگرە لەم ناوە نین، بە تایبەتی هەڕە ماسی لە دەریادا دەژی، بەڵام مورغی سەقا، ڕەنگە لەم خوارەوە هەبیٚ، ئاگات لە خۆ بیٚ، نەبا هەڵت بخەڵەتێنیٚو بچیتە کیسەکەیەوە.

ماسییە چکۆڵ گوتی:– کسەی چی ؟

مارمێلکەکە گوتی:– مورغی سەقا لە ژێر دەنووکیا کیسەیەکی هەیە ئاوی تێدەچیٚ، مورغی سەقا لە ئاوا مەلە دەکاو هەندیٚ جار ماسی لێیان تێك دەچیٚو خۆ بەو کیسەیەدا دەکەنو یەکڕاست دەچنە ورگییەوە، دیارە گەر برسی نەبێتو تێر بیٚ ئەوا ماسییەکان لەو کیسەیەدا هەڵدەگریٚو دوایی دەیانخوا.

ماسییە چکۆل گوتی:– باشە ئەگەر ماسی چووە ئەو کیسەیەوە ئیدی دەرفەتی دەرباز بوونی نابیٚ؟

مارمێلکەکە گوتی:– نەخێر مەگەر کیسەکە بدڕیٚ، من خەنجەرێکت دەدەمیٚ کە ئەگەر گیرۆدەی مورغی سەقا بوویت کیسەکەی بدڕە.

مارمێلکەکە خۆی بە قلیشە بەردێکا کردو بە خەنجەرێکی زۆر بچووکەوە گەڕایەوە، ماسییە چکۆل خەنجەرەکەی وەرگرتو گوتی:– مارمێلکە گیان! تۆ زۆر میهرەبانی، نازانم چۆن سوپاست بکەم.

مارمێلکەکە گوتی:– پێویست بە سوپاس ناکا گیانە! لەم خەنجەرانەم زۆرن. وەختیٚ بیٚ ئیش دەبم، دادەنیشم لەلاسکی گیا خەنجەران دروست دەکەمو دەیدەم بە ماسییان ژیری وەکو تۆ.

ماسییەکە گوتی:– چما بەر لە من چ ماسییەکی دی بێرەدا ڕەت بووە.

مارمێلکەکە گوتی:– ئەی مەعنای چی، زۆر بێرەدا ڕەت بوون. هەنووکە بوون بە کۆمەڵو کابرای ماسی گریان تەنگاو کردووە.

ماسییە ڕەش گوتی:– بمبورە وەك دەڵێن قسە، قسان ڕادەکێشێت. ئەگەر نەبیٚ بە بیٚ ئەدەبی لە رووتا. پێم ناڵێی چۆن چۆنی کابرای ماسی گریان تەنگاو کردووە؟

مارمێلکەکە گوتی:– چونکە هەموویان تەبان، هەرکە کابرای ماسیگر تۆڕەکەی هەڵدەدا، تێکڕا دەچنە ناو تۆڕەکەوەو لەگەڵ خۆیانا رای دەکێشن تا بنی دەریا.

مارمێلکەکە گوێی نا بە قلیشی گا بەردەکەوە، هەندێ گوێی هەڵخست و گوتی:– ئیدی من مەرەخەس دەبم. منداڵەکانم هەستاون.

مارمێلکەکە خۆی بە قلیشی بەردەکەیا کرد، ماسییە رەشە بچکۆل ناچار کەوتە رێ، لێکدا لێکدا پرسیاری لە خۆی دەکرد. باشە جۆبار دەڕژێتە دەریاوە؟ مورغی سەقام لێ پەیدا نەبێ؟ باشە هەرە ماسی دڵی دێ هاوڕەگەزی خۆی بکوژێ و بیخوا؟ باشە ماسیگرە چ دوژمنایەتیەکی لەگەڵ ئێمەماندا هەیە؟

ماسییە چکۆل بە دەم مەلە کردنەوە دەڕۆیی و تێدەفکری. لە هەر بستە رێگایەکدا شتێکی تازەی دەبینی و فێردەبوو. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لە تاڤگەو قەڵبەزەکانەوە بکەوێتە خوارێ و مەلە بکا، کە گەرمای هەتاو لە پشتی دەدا ئۆخژنی دەخستە نێو دڵ و دەروونی. ماسییە چکۆل چوو بەسەر ئاسکێکا کە بەپەلە ئاوی دەخواردەوە، سڵاوی لێکردو گوتی:– ئاسکە جوانێ. بۆ پەلەتە؟

ئاسك گوتی:– راوچی راوی ناوەو گوللەیەکیشی لێداوم، ئەوەتا.

ماسییە چکۆلە جێ گوللەکەی نەدی، بەڵام کە هەنگەڵەشەلێی ئاسکەکەی بینی، تەواو باوەڕی کرد، کۆمەڵە کیسەڵێك لە شوێنێکی دیا خۆیان دابووە هەتاوو وەنەوزیان دەدا. لە شوێنێکی دیدا قاسپەی کەو و کەوباڕان دۆڵەکەی دەخرۆشان. بۆنی گیاو گوڵی کێوی شەپۆلی دەداو تێکەڵ بە ئاوەکە دەبوو.

بۆ پاش نیوەڕۆ گەییە  شوێنێ کە چۆمەکە بەرین دەبۆوەو ئاوەکە بە ناوەندی بێشەیەکدا رەت دەبوو. ئاوەکە هێند زۆر بوو بوو، ماسییە چکۆل خەریك بوو لە خۆشیانا شاگەشکە بێ. پاشان تووشی یەك دنیا ماسی بوو – لەو ساوە کە لە دایکی جیا بوو بۆوە ماسی نەدی بوو– چەند وردە ماسییەك دەوریان داو گوتیان:– دەڵێی غەریبی؟

ماسییە رەشە گوتی:– بەڵێ غەریبم و لە رێیەکی دوورەوە دێم.

وردە ماسییەکان گوتیان:– ئەدی بە تەمای کوێی؟

ماسییە رەشە گوتی:– بە تەمام کۆتایی جۆبار بدۆزمەوە.

وردە ماسییەکان گوتیان:– کام جۆبار؟

ماسییە رەشە گوتی:– ئەم جۆبارەی کە مەلەی تێدا دەکەین.

وردە ماسییەکان گوتیان: ئێمە بەمە دەڵێین روبار.

ماسییە رەشە هیچی نەگوت. یەکێك لە وردە ماسییەکان گوتی:– باشە دەزانی مورغی سەقا لە رێگاتە؟

ماسییە رەشە گوتی:– ئا. دەزانم.

ماسییە وردەکە گوتی:– دەزانی و ئەوجاش هەر دەڕۆی؟

ماسییە رەشە گوتی:– بەڵێ، هەرچۆنێ بووە دەبێ بڕۆم.

ئەم هەواڵە خێرا لە نێو ماسییەکاندا بڵاوبۆوە: ماسییەکی ڕەشی چکۆلە لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووەو دەیەوێ بڕوا کۆتایی ڕوبار بدۆزێتەوەو چ منەتی بە مورغی سەقایەش نییە. چەند وردە ماسییەك کەوتنە کەڵکەڵەی ئەوەی لەگەڵ ماسییە ڕەشدا بڕۆن. بەڵام لە ترسی گەورەکان نەیان وێرا چ قسەیەك بکەن. چەند دانەیەکیشیان گوتیان:- ئەگەر لە ترسی مورغی سەقا نەبا لەگەڵت دەهاتین، ئێمە لە کیسەکەی مورغی سەقا دەترسین.

گوندێك لەسەر ڕووبارەکە بوو، ژن و کیژی گوند، ئامان و جلوبەرگیان لەگوێ ڕوبارەکە دەشت. ماسییە چکۆل تاوێك گوێی لە دەنگە دەنگی وان ڕاگرت و قەدەرێکیش تەماشای مەلەوانی منداڵەکانی کردن و ڕۆیی. هەر ڕۆیی ڕۆیی تا شەوی بەسەرا هات ،لای دایە بن بەردێك و لێی خەوت. نیوەشەو خەبەری بۆوە. سەیری کرد تریفەی مانگ داویە لە ڕووبارەکەو هەموو لایەکی ڕووناك کردووەتەوە.

ماسییە ڕەشە چکۆل مانگی زۆر خۆشدەویست. ئەو شەوانەی مانگ هەڵدەهات و دەیدا لە ئاو، بەو بوایە لە ژێر قەوزەکانەوە بێتە دەرێ و چەند قسەیەکی لە تەکا بکا، بەڵام هەموو جارێ دایکی خەبەری دەبۆوە، ڕای دەکێشایەوە بن قەوزەکان و دەی نواندەوە.

ماسییە چکۆل چووە کن مانگ و گوتی:- سڵاوت لێبێ ئەی مانگی نازدار!

مانگ گوتی:- هەزار سڵاوت لێبێ ماسییە ڕەشە چکۆل، تۆو ئێرە کوجا مەرحەبا؟!

ماسییە چکۆل گوتی:- جیهانگەڕی دەکەم.

مانگ گوتی:- جیهان زۆر گەورەیە. ناتوانی هەمووی بگەڕێی.

ماسییە چکۆل گوتی:- قەیدی نییە. هەندی پێم کرا.

مانگ گوتی:- حەزم دەکرد تا سبەینێ لە کنت بم، بەڵام هۆو پەڵە هەورە ڕەشە خەریکە هێرەوە دێ و بەرم دەگرێ.

ماسییە چکۆل گوتی:- ئەی مانگی جوان! من ڕوناکی تۆم خۆشدەوێ. حەزدەکەم هەمیشە لێم بدا.

مانگ گوتی:- ماسییە گیان، من بە خۆم ڕوناکیم نییە، هەتاو ڕوناکیم دەداتێ و منیش دەیدەم بە زەوی، بە ڕاست تۆ بیستووتە ئادەمیزاد بە تەمان تا چەند ساڵێکی دی بفڕن و بێن لەسەرم بنیشنەوە؟!

ماسییەکە گوتی:- ئەمە قەت نەبووەو ناکرێ؟

مانگ گوتی:- ڕاستە کارێکی سەختە، بەڵام ئادەمیزاد هەر کارێکیان بوێ...

مانگ هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە هەورە ڕەشەکە گەییە سەری و دای پۆشی. دنیا دیسان تاریك بۆوە. ماسییە ڕەشە بە تاقی تەنێ مایەوە، بۆ چەند دەقیقەیەك مات و سەرسام ڕوانییە تاریکییەکە، پاشان خۆی خزاندە ژێر بەردێکەوەو لێی نووست.

بەیانی زوو لە خەو ڕابوو، دیتی چەند ماسییەك بە دیارییەوە وەستاون و چپەچپیانە، کە دیتیان ماسییە ڕەشە لە خەو ڕابوو، تێکڕا گوتیان:- ڕۆژباش!.

ماسییە ڕەشە گوتی: ئەوە هاتن!

یەکێك لە وردە ماسییەکان گوتی:- بەڵێ، بەڵام هێشتا ترسمان نەشکاوە.

یەکێکی دی گوتی:- ترسی مورغی سەقا دەستبەردارمان نابێ.

ماسییە رەشە گوتی:- ئێوە زیاتر بیردەکەنەوە، نابێ تەنیا بیربکرێتەوە، هەرکە بکەوینە ڕێ ئیدی بە تەواوی ترسمان دەشکێ.

کە ویستیان بکەونە ڕێ، ئاوەکەی دەوربەریان هەستا و روپۆشێکی بەسەراداو دنیای رووناکیان لێ تاریك بوو، چ مەفەڕێکیان نەما.

ماسییە ڕەشە یەکسەر زانی کەوتوونەتە کیسەی مورغی سەقاوە.

ماسییە رەشە چکۆڵ گوتی:- دۆستان کەوتووینەتە کیسەی مورغی سەقاوە، بەڵام ڕێگای هەڵاتن بە تەواوی نەگیراوە.

وردە ماسییەکان دایان کورکاند، یەکێکیان گوتی:- تازە ڕێی هەڵاتنمان نییە، هەموو خەتای تۆیە، کەوتیتە خشتو پامانو لە ڕێت دەرکردین!

یەکێکی دی گوتی:- ئێستا هەموومان قووت دەداو دەبڕێینەوە.

لە پڕ قاقایەکی سامناك لە نێو ئاوەکەدا دەنگی دایەوە، قاقای مورغی سەقا بوو، پێدەکەنی و دەیگوت: چ وردە ماسییەکم چنك کەوتوون! هاهاهاها بەڕاستی دڵم پێتان دەسوتێ، دڵم نایە بتان خۆم! ها ها هاها...

وردە ماسییەکان کەوتنە پاڕانەوە:- حەزرەتی جەنابی مورغی سەقا! دەمێکە ناو بانگی تۆمان بیستووە، گەر لوتف بفەرمووی، دەنووکی موبارەکت کەمێ بکەیەوەو دەرچین تا ماوین هەر دوعای خێر بۆ جەنابی موبارەکت دەکەین.

مورغی سەقا گوتی:- ئێستا ناتانخۆم، ماسی یەدەکەم زۆرن، سەیری ئەو خوارەوە بکەن..

چەند ماسییەکی وردو درشتی هەڵڕشتبووە ناو کیسەکە. وردە ماسییەکان گوتیان:- حەزرەتی جەنابی مورغی سەقا! ئێمە هیچمان نەکردووە، ئێمە بێ تاوانین، ئەم ماسییە رەشە چکۆڵەیە ئێمەی تەفرە داوە..

ماسییە چکۆڵە گوتی:- ئەی ترسنۆکینە! وا دەزانن ئەم مورغە فێڵبازە سەرچاوەی بەخشینە کە بەم جۆرە دەپاڕێنەوە.

وردە ماسییەکان گوتیان:- تۆ خۆتیش نازانی چی دەڵێی؟ نووکە دەبینی حەزرەتی مورغی سەقا چۆن ئێمە دەبخشێ و تۆ نۆشی گیان دەکا.

مورغی سەقا گوتی:- بەڵێ دەتان بەخشم. بەڵام بە مەرجێ.

وردە ماسییەکان گوتیان:- مەرجەکەتان بفەرموون قوربان.

مورغی سەقا گوتی:- ئەم ماسییە منجڕو سەربزێوە بکوژن، تا ئازادی خۆتان بە دەست بێنن!.

ماسییە ڕەشە چکۆڵ خۆی دایە لاوەو بە وردە ماسییەکانی گوت:- قەبووڵ مەکەن، ئەم مورغە فێڵبازە دەیەوێ بەرمان بداتە گیانی یەکدی، من پلانێکم هەیە..

ورده ماسییەکان تەنیا رزگاری خۆیان بەلاوە مەبەست بوو، بۆیە بەربوونە گیانی ماسییە رەشە چکۆڵ. ماسییە ڕەشە بەرەو کیسەکە دەکشایەوەو دەیگوت: ترسنۆکینە! هەنووکە گیرۆدە بوون و رێگای دەرچوونتان نییە، دەرەقەتی منیش نایەن.

ورده ماسییەکان گوتیان:- چار نیەو دەبێ بتخنکێنین، ئێمە ئازادیمان دەوێ.

ماسییە رەشە گوتی:- ئەوە شێت بوون! منیش بخنکێنن هەر ئازاد نابن، بە قسەی ئەو مەخەڵەتێن!

ورده ماسییەکان گوتیان:- تۆ لەبەر خاتری خۆت ئەم قسانە دەکەی، ئەگینا قەت بیر لە ئێمە ناکەیەوە!

ماسییە ڕەشە گوتی:- کەواتە گوێ بگرن تا رێیەکتان نیشان بدەم. من لە نێو ماسییە مردووەکاندا ڕادەکێشم و خۆم دەکەم بە مردوو، با بزانم مورغی سەقا بەرەڵلاتان دەکا یان نەء . ئەگەر بە قسەم نەکەن بەم خەنجەرە هەمووتان دەکوژم، یا کیسەکە پارچە پارچە دەکەم و بە خۆم دەڕۆم و ئێوەش..

یەکێك لە ورده ماسییەکان هەڵیدایێ:- دەبەسە خۆ ئیتر. من ئەم قسانەم پێ قەبووڵ ناکرێ.. ئوهو.. ئوهو.. ئوهو...

ماسیە رەشەکە، کە چاوی بە گریانی ئەو کەوت گوتی:- مەمکە مژەت ناوێ؟ ئەم منداڵە ساوایەتان بۆ لەگەڵ خۆ هێناوە؟

ئەوجا خەنجەرەکەی هەڵکێشا و لەبەردەم ورده ماسییەکاندا ڕایگرت ، ناچار پێشنازەکەی ماسییە چکۆڵەیان قەبووڵ کرد. بە درۆ هەندێکیان پێکدا کێشا. ماسییە رەشە خۆی کردە مردوو ئەوانیش هاتنە سەرێ و گوتیان:- حەزرەتی جەنابی مورغی سەقا! ماسییە رەشە لاسارەکەمان خنکاند. مورغی سەقا پێکەنی و گوتی:- چاکتان کرد. ئێستاش لە پاداشتی ئەو کارەتاندا هەمووتان بە زیندووی قووت دەدەم تا گەشتێکی چاك لە نێو هەناوما بکەن.

ورده ماسییەکان دەرفەتیان نەما. چەشنی بروسکە بە گەرووی مورغەکەدا ئاودیو بوون و بڕانەوە. بەڵام ماسییە ڕەشە ڕێك لەو کاتەدا بە خەنجەر کیسەکەی دادڕی و هەڵات. مورغی سەقا یەك بە خۆی قیژاندی و سەری دا بە ئاوەکەدا، بەڵام نەیتوانی دوای ماسیە چکۆڵ بکەوێ.

ماسیە رەش هەر ڕۆیی و ڕۆیی تا بوو بە نیوەڕۆ، کێو و دۆڵ تەواو بوو، روبارەکە بە دەشتێکی هەموارا دادەکشا چەند روبارێکی بچوکیش لە ڕاست و لە چەپەوە دەڕژانە نێو روبارەکەوە. ئاوەکەی یەکجار زۆر بوو بوو. ماسییە ڕەشە لە خۆشی ئەو هەموو ئاوە حەجمانی نەبوو، کاتێ هاتەوە سەرخۆی، سەیری کرد ئاوەکە بنی نییە. ئەم بەری کرد، ئەو بەری کرد، نەگەییە هیچ شوێنێ. ئاوەکە هێندە زۆر بوو ماسییە چکۆل گوم بوو بوو.تا توانی مەلەی کرد، بەڵام نەگەییە چ شوێنێك. لە پڕ بینی گیانلەبەرێکی درێژ زلە وەکو بروسکە هێرشی بۆ دێنێ. هەڕەیەکی دوو دەمی بە دەمەوە بوو. ماسییە چکۆڵ لە فیکران ڕاچوو، هاکا هەڕە ماسی پارچە پارچەی بکا، خێرا فریای خۆی کەوت و هاتە سەر ئاوەکە. پاش ماوەیەك چووە بن ئاوەکە تا بنی دەریا ببینێ.

لە رێگادا تووشی گەلە ماسییەك بوو، هەزاران هەزار ماسی بوون!

له یەکێکیانی پرسی:- هاوڕێ من غەریبم، لە ڕێگای دوورەوە هاتووم. پێم نالێی ئێرە کوێیە؟

ماسییەکە، دۆستەکانی خۆی گازکردو گوتی:- سەیرکەن! یەکێکی دی..

ئەوجا بە ماسییە ڕەشەی گوت:- هاوڕێ بەخێر هاتی بۆ دەریا.

ماسییەکی دی گوتی:- هەموو جۆبارو ڕووبارەکان دەڕژێنە ئێرە. هەڵبەتە هەندێکیانیش لێ دەڕژێتە زۆنگاو وگۆلەکانەوە.

یەکێکی دی گوتی:- هەر کاتێ مەیلەت لێبێ دەتوانی بێیە ناو ئێمە.

ماسیە ڕەشە چکۆڵ زۆر شاد بوو بەوەی گەییووەتە دەریا، گوتی:- وا چاکە جارێ پیاسەیەك بکەمو ئەوجا بێم تێکەڵی ئەنگۆ بم. حەزدەکەم ئەمجارە بەشداری بردنی تۆڕی کابرای ماسیگر بکەم.

یەکێك لە ماسییەکان گوتی:- بەم زووانە بە ئاواتی خۆت دەگەی. جارێ بڕۆ پیاسەکەت بکە، بەڵام هەرکە سەرکەوتیتە سەر ئاوەکە ئاگات لە ماسیگرە بێ. چەند ڕۆژێکە لێمان هاربووەو بە هیچ شتێ دانامرکێتەوە، ڕۆژی ٤-٥ ماسیمان لێ ڕاو دەکا.

ماسییە ڕەشە لەوان دوور کەوتەوەو و کەوتە مەلە کردن ، پاش تۆزێك هاتە سەر ئاوەکە، هەتاو گەرم بوو، گەرمی هەتاو ئۆخژنی دەخستە نێو دڵو دەروونی. بە کاوەخۆ خۆی دابووە دەم ئاوەکەو لەبەر خۆوە دەیگوت:- ئێستا مەرگ زۆر بە ئاسانی دەتوانێ بەرەو ڕووم بێ، بەڵام من تا بتوانم بژیم نابێ بچمە پێشوازی مەرگ، هەڵبەتە ئەگەر کاتێ بە ناچاری ڕوو بە ڕووی مەرگ بوومەوە-کە هەردەبمەوە- ئەوا گرینگ نییە، گرینگ ئەمەیە کە ژیان یا مەرگی من چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی خەڵکانی دی هەبێ.

ماسییە ڕەشە چکۆڵەکە لە گەرمەی ئەو بیرو خەیاڵانەدابوو کە کوتوپڕ ماسیگرەیەك پڕی دایێو بردی. ماسییە چکۆڵ لە بەینی دەنووکە درێژەکەی ماسیگرەوە لە قەفرتێی دەکرد، بەڵام خۆی پێ ڕزگار نەدەکرا. ماسیگرەکە هێند بە توندی بڕبڕەی پشتی گرتبوو کە خەریك بوو گیانی دەردەچوو! ئاخر ماسییەکی چکۆڵە چەندێ بە بێ ئاو هەڵدەکا؟ ماسییەکە پڕ بە دڵ حەزی دەکرد ماسیگرەکە قووتی بداو تا بەلای کەمەوە ئاوو ڕتوبەتی ناو زگی ئەو بۆ چەند دەقیقەیەك مەرگی دوا بخا. بەدەم ئەم خەیاڵو خۆزگەیەوە بە ماسیگرەکەی گوت:- بۆ بە زیندووی قووتم نادەی؟ ئاخر من لەو جۆرە ماسیانەم کە پاش مردن ژەهراوی دەبم.

ماسیگرەکە چ قسەیەکی نەکرد لە فکران ڕاچوو:- ئەی حیلەباز! بزانە چ فێڵێکت لە ژێر سەردایە، ناکا بتەوێ بمهێنیە قسان تا ڕابکەی؟

سات بە سات لە وشکایی نزیکتر دەبوونەوە. ماسییە ڕەشە لە فکران ڕاچوو:"ئەگەر بگەینە وشکایی ئیدی تیا دەچم". بۆیە گوتی:- دەزانم بە تەمای بۆ بێچووەکانتم بەری، بەڵام هەر کە بگەینە وشکایی ئەوا دەمرمو ژەهراوی دەبم. بۆ بەزەییت بە بێچووەکانتا نایەتەوە؟

ماسیگرەکە تێفکری:- وریایی کارێکی چاکە، بەخۆم دەتخۆمو ماسی دی بۆ بێچووەکانم دەگرم.. ئەم شتە فێڵێکی تێدا نەبێ؟ نەء چ کارێکت پێناکرێ.

ماسیگرەکە لەم بیرو خەیاڵانەدا بوو کاتێکی زانی بەدەنی ماسیە ڕەشە شلو خاوبۆوەو جووڵەی تێدا نەما. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: یانی مردووە؟ لە کیسم چوو، ئیدی ناتوانم بیخۆم، بە دەستی خۆم ئەم ماسییە نەرمو ناسکەم لە کیسی خۆدا!

ماسیگرەکە بە ماسییە ڕەشەی گوت:- ئەهای بچکۆل! پێم بڵێ بزانم نیوە گیانێکت تێدا ماوە تا بتخۆم؟

بەڵام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکا، چونکە هەرکە دەنووکی کردەوە، ماسیە ڕەشە دەرپەڕیو بەر بۆوە. ماسیگرەکە هەستی کرد هەڵخەڵەتێنراوە. بەپەلە کەوتە دووی ماسییەکە. ماسیەکە وەکو بروسکە لە حەوادا دادەکشا، لە خۆشی ئاوی دەریا ئاگای لە خۆبڕا بوو، دەمی بۆ بای شێداری دەریا گرتبۆوە، بەڵام هەرکە گەییە نێو ئاوەکەو نەفەسێکی تازەکردەوە، ماسیگرەکە هێند بە خێرایی پڕی دایێو قووتی دا ماوەیەك گێژ بوو، نەیزانی چ قەوماوە.

هەستی کرد هەر چوار دەوری شێدارو تاریکە، ڕێگای دەرچوون نییە، دەنگی گریان دێ، کە چاوی بە تاریکییەکە ڕاهات، سەیری کرد ماسییەکی یەکجار ورد لە سوچێکا کزکۆڵەی کردبووو بۆ دایکی دەگریا. ماسییە ڕەشە لێی چووە پێشەوەو گوتی:- بچکۆل هەستە بیر لە چارەیەك بکەوە.. بە گریانو دایەڕۆ چ دەکرێ؟

ماسییە وردەکە گوتی:- تۆ کێی؟.. ئەدی نابینی خەریکە دەمرم؟ ئوهو.. ئوهوو.. دایکە.. من چیدی ناتوانم لەگەڵ تۆدا بێمو تۆڕی کابرای ماسیگر بەرینە بنی دەریاوە.. ئوهو.. ئوهوو!

ماسییە ڕەشە چکۆل گوتی:- بی بڕەوە بابە، ئابڕووی هەموو ماسییەکت برد!

کاتێ ماسییە وردەکە لە گریان کەوت، ماسییە ڕەشە چکۆل گوتی:- من دەمەوێ ماسیگرەکە(مورغی سەقا) بکوژمو هەموو ماسییەکانی لێ ڕزگار بکەم، بەڵام دەبێ لە پێشا تۆ بنێرمە دەرێ تا ئابڕومان نەبەی.

ماسییە وردەکە گوتی:- تۆ خۆت کەوتوویتە حاڵی مردنێ، ئیدی چۆن ماسیگرەکە(مورغی سەقا) دەکوژی؟

ماسییە ڕەشە چکۆلەکە خەنجەرەکەی نیشان داو گوتی:- هەر لێرەوە زگی دەدڕم، تۆ گوێ بگرە بزانە چت پێ دەڵێم:- من دەست بە گینگڵ دانو ئەم دیوو ئەو دیو دەکەم تا ماسیگرەکە ختووکەی بێتێ، هەرکە دەنووکی کردەوەو لە قاقای پێکەنینی دا تۆ دەرپەڕە دەرێ.

ماسییە وردەکە گوتی:- ئەدی خۆت؟

ماسییە ڕەشە چکۆل گوتی:- خەمی منت نەبێ، تا ئەم ناڕەسەنە نەکوژم نایەمە دەرێ.

ماسییە ڕەشە ئەمەی گوتو کەوتە جینگڵ دانو ختووکەدانی ماسیگرەکە. ماسییە وردەکە حازرو ئامادە لەبەر دەرکی گەدەی ماسیگرەکەدا وەستا بوو. هەرکە ماسیگرەکە دەنووکی کردەوەو دەستی بە قاقای پێکەنین کرد، ماسییە وردەکە لە دەمی ماسیگرەکەوە دەرپەڕییە دەرێو دوای تۆزێك شڵپ کەوتە نێو ئاوەکە. هەر چەند چاوەڕێی کرد چ خەبەرێك لە ماسییە ڕەشەوە نەبوو. لە پڕ دیتی لەنگەری ماسیگرەکە( مورغی سەقا) تێك چووەو هاوار دەکاو بەرەو

خـواریٚ دادەکشـێ. تـا شـڵپ کەوتـە ئاوەکـەوە. هەنـدێ لەقـەفرتێی کـردو سـارد بـۆوە. بـەڵام چ هەواڵێك لە ماسییە رەشە چکۆلەکەوە نەبوو، تا ئێستاش هەر نییە.

ماسییە پیرە نەقڵەکەی تەواو کردو بە ١٠– ١٢ هەزار بێچوو نەوەکەی گوت:– منداڵینـە، ئیـدی وەختی نووستنە، هەڕون بنوون.

بێچوو و نەوەکان گوتیان:– داپیرە پێت نەگوتین ماسییە چکۆلەکە چی بەسەر هات.

داپیرە گوتی:– با بمێنێ بۆ سبەی شەو، هەنووکە وەختی نووستنە، شەوتان باش.

یازدە هەزارو نۆسەدو نەوەدو نۆ ماسی چکۆلە (شەوباش)یان لـە داپیرە کردو چوون نووستن. داپیرەت خەوت، بەڵام ماسییەکی سووری چکۆلە، هەرچی کـردو کۆشا خـەوی لێنەکەوت، تـاکو بەیانی هەر لە بیری دەریادا بوو.

*– مورغی سەقا(ماسیگرە): جۆرە باڵندەیـەکی بەلـەش و پـێ کوڵـە دەنووکی لـە چاو لەشیا تا ڕادەیـەك درێژو پانە، لە ژێر دەنووکییەوە کیسەیەکی ناو لینج هەیە بۆ هەڵگرتنی ئەو وردە ماسـییانەی کـە دەیـان گـرێ، مەلـەوانێکی یـەکجار لێهـاتووە، لـە دەریاچـەو روبـارو گـۆلاو وکـەناری دەریـادا بـە کۆمـەڵ دەژیـن و قاتیلی گیانی ماسین.

*– هەڕە ماسی: جۆرە ماسییەکی درێژکۆڵەیە، کاجێری سەرەوەی لە هەڕە( مشار) دەچێ.

## یۆڵدزو بووکەڵەی قسەوێژ

**پێشکەشە بە هەموو منداڵانی قالی چنی دنیا.**

### وتەی بووکە شووشە

منداڵینـە، سـڵاوتان لـێ بـێ. مـن بووکەڵـەی یوڵـدز خـانم. ئەوانـەی کتـێبی یوڵـدزو قـەلانیان خوێندۆتەوە منو یوڵدز باش دەناسن. سەربهوردو نەقڵی منو یوڵدز لە نەقڵو چیرۆکی قەلەکان کـۆنترە. دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو سـەروبەندەی کـە باوەژنەکـەی یوڵـدز ١-٢ سـاڵێك بـوو گوازرابـووە. یوڵدز ٤-٥ ساڵان بوو، ئەوسا من قسەم نەدەزانی. دایکی یوڵدز بە کۆنە لەچكو عەبایەکی خـۆی دروستی کردبوومو بە پرچی خۆی ئاخنی بوومی.

شەوێك یوڵدز لەبەردەم خۆیدا دایناموو هەر قسەی کرد، هەر قسەی کردو دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتم، قسەکانی هێند دڵتەزێن بوون هێنامیانە زمان. ئیدی فێری قسەکردن بوومو ئەو فێر بوونەی فێر بووم لە بیرم نەچۆوە.

نـەقڵی مـنو یوڵـدز گـەلێك دوورو درێـژە. کاکـە (بهـرەنگ) ئـەو نەقڵـەی لـە دەمـی یوڵـدزەوە ژنەوتبوو و کردبووی بە چیرۆك. چەند رۆژێك بەر لە ئێستا نووسینەکەی هێنایە کن منو گوتی: -بووکەڵەی قسەوێژ، من سەربهوردو نەقڵی تۆو یوڵدزم کردووە بە چیرۆكو دەمەوێ چاپی بکەم، حەز دەکەم تۆش پێشەکیەکی بۆ بنووسیت.

سەر لەبەری نووسنەکەی کاك بهرەنگم خوێندەوە، ئەلهەقی چیرۆکێکی چاکی نووسی بوو، بـەڵام هەنـدێ رستـەی نووسـینەکەی لـە بـاری دەسـتووری زمـانی فارسـییەوە ناڕێكو لـەنگ بـوون. ئیـدی دەسـتم دایـە قەڵـەمو ڕسـتەکانم بـۆ ڕاسـت کردنـەوە، هەنووکـە گـەر هەڵەیـەك، شـتێك لـە رستەبەندیو وشـەڕۆنانو چـۆنێتی بـەکارهێنانی ئـامرازی پێوەنـدیو ئیزافـە بـەدی بکـرێ، ئـەوا خـەتای منـەو گلـەیی لـەو بەلـەنگازەی مەکـەن کـە بـۆ فارسـی نـازانێ، ڕەنگـە ئـەویش حەزنـەکا بـە زمانێك چیرۆك بنووسێ شارەزای نەبێ، بەڵام چار چییە ها؟

دوا قسـەم ئەمەیـە کـە هـیچ منـداڵێکی روح زلو لـە خـۆڕازی بـۆی نییـە نـەقڵی مـنو یوڵـدز بخوێنێتـەوە، بـە تایبـەتی ئـەو منداڵـە دەوڵەمەندانـەی کـە سـواری ترومبێلـەکانیان دەبـن، پـۆز لێدەدەنو خۆیـان لـە منـداڵانی دەربـە دەرو کـەنار شـەقامەکان بـە زیـاتر دەزانـنو چ حسـێبێك بـۆ منداڵانی کرێکار ناکەن. کاك بهرەنگ بەخۆی گوتویەتی چیرۆکەکانی بۆ منداڵانی کرێکارو هـەژار دەنووسێت.

هەڵبەتە منداڵانی خراپو لە خۆ ڕازیش ئەگەر بیرکردنەوەو ڕەفتاری خۆ بگۆڕن بۆیان هەیە چیرۆکەکانی کاك بهرەنگ بخوێننەوە. خۆی پێی گوتووم.

دۆستی هەموو منداڵانی ژیرو فامیدە

بووکەڵەی قسەوێژ

## *- بووکەڵەکە فێری قسان دەبێ

دنیا تاریك و روون بوو، یوڵدز لە گەنجینەکەدا دانیشتبوو. بووکە گەورەکەی لەبەردەم خۆ دانا بوو. هێواش هێواش قسەی بۆ دەکرد.

- راستیت دەوێ بووکەخان، من لە دنیادا هەر تۆ شك دەبەم. دایکم؟ من بیرم نایەت، دراوسێکەمان دەڵێ دەمێکە بابم تەلاقی داوەو ناردوویەتییەوە بۆ گوندی بو کن بابی. باوەژنەکەم؟ خۆشم ناوێ. چونکە دڵ ئاوێنەی دڵە، لەوەتەی هاتۆتە ئەم ماڵە بابیشی لێ زەوت کردووم، من لەم ماڵەدا تەنیای تەنیام. دوێنێ چێڵەکەشیان کوشتمەوە. چێڵەکە بەینی دەگەڵ منا خۆش بوو. من قسەم بۆ دەکردو ئەویش دەستی دەلستمەوەو شیری دەدامێ. ئەگەر چاوی بە منەوە نەبا نەیدەهێشت کەس بیدۆشێت. هەر لە بچووکیەوە لە ماڵی خۆمان گەورە بووبوو. دایکم بە خۆی گەورەی کردبوو....

بووکەخان ئەگەر تۆ قسە نەکەی من دڵم شەق دەبا!.... بەڵێ وەکو پێم گوتی دوێنێ چێڵەکەمیان کوشتەوە. دەزانی بۆ؟ باوەژنەکەم بێزوو دەکاو مەیلی چووەتە سەر گۆشتی چێڵەکەی من. هەنووکە خۆیو خوشکەکەی لە ئاشخانەکەدا دانیشتوونو چاوەنۆڕن گۆشت بکوڵێو بیخۆن. ژارۆ چێڵی من!.... دەزانم هەنووکە لەسەر ئاگر قوڵپ دەدەی. بووکەخان ئەگەر تۆ قسە نەکەی من دڵم شەق دەبا! دیق دەکەمو بە داخەوە دەمرم... باوەژنەکەم لەوەتەی کەوتووەتە بێزوو چاوی بە منا هەڵنایەت. دەڵێ: - بە دەستی خۆم نییە کە تۆ دەبینم دڵم تێك هەڵدێ.

منیش ناچارم دایمە لە گەنجیینەکەدا وەمێنم تا باوەژنەخان نەمبینێو دڵی تێك هەڵنەیەت. بووکەخان گەر تۆ قسە نەکەی دڵم شەق دەبا!... من بیرم نایە لەکەیەوە تۆم هەی، کە چاوم کردووەتەوە تۆم دیتوە، ئەگەر تۆش رووم لێگرژ بکەی ئیدی نازانم چیبکەم. بووکەخان گەر تۆ قسەنەکەی دڵم شەق دەبا!.... دیق دەکەم... بووکەخان... بووکەخان!... خەریکە دڵم شەق دەبا.. قسە بکە... قسە..

یوڵدز لە پڕ هەستی کرد کە دەستێك روندکی چاوەکی دەسڕیو بە ئەسپایی دەڵێ:- یوڵدز، بەسە، مەگری، مەترسە، دیق ناکەی، ئەوە نییە هاتوومە زمان.... گوێت لە دەنگمە؟ گوێ بگرە ئەوا بووکە خانت هاتووەتە قسان، ئیدی تۆ تەنیا نیت.

یوڵدز قژەکەی لەسەر چاوی لادا، سەیری کرد بووکەکەی هاتۆتە بەردەمی ئەو و فرمێسکەکانی بۆ دسڕێ. گوتی:- بووکێ، ئەوە قسەت کرد؟!

بووکە خان گوتی:- بەڵێ، خەمت نەبێ، تازە زمانی تۆ فێر بووم.

دنیا تاریك بووبوو. یوڵدز بە زەحمەت بووکەکەی دەبینی. بە پەلەکوتێ لە گەنجینەکە وەدەر کەوتو رۆیی بۆ لای تاقەکە تا شقارتە بدۆزێتەوەو چرا دابگیرسێنێ. شقارتەی لێنەبوو.

چراکەی لە عاردی داناو لە تاقێکی دی شقارتەیەکی هەڵگرتو هێنای، لە پڕ پێی لە چراکە هەڵکەوتو چرا قلپەوە بوو، شووشەکەی شکاو نەوتەکە رژایە سەر رایەخەکە. بۆنی نەوت

تاریکی ژوورەکەی پڕکرد، لە دەرگا درا. یولْدز شپرزە بوو. بووکەخان کە هاتبووە بەر دەرکی گەنجینەکە گوتی:- یولْدز وەرە ژوورەوە، وا چاکە خۆت نەکەی بە خاوەنی هیچ و بلْێی لە گەنجینەکە نەچوویە دەرێ.

دەرگای حەوشە کرایەوە. دەنگی بابەو باوەژن هات. باوەژن لە پێشەوە بوو، دەیگوت لە موبەق بووم، چراکەم هەلْنەکردووە، هەنووکە هەلْی دەکەم.

بووکەخان هەمدیس بە یولْدزی گوت:- خێراکە وەرە ژوورەوە.

یولْدز گوتی:- نا، بووکەخان دەبێ پێیان بلْێم شووشەکە شکاوە. دەنا پێ بە وردە شووشەکانا دەنێن، خراپ دەقەومێ.

وەختێ باوەژن پێی نایە ناو دەرکی ژوورەوە، یولْدز دەنکە شقارتەیەکی پێکردو گوتی:- دایە، ئاگات لە خۆ بێ، چراکە کەوت و شووشەکەی شکا.

بابە دوا بە دوای باوەژن وەژوورکەوت. باوەژن دەستی هەلْبڕی بوو لە یولْدز بدا. بابە دەستی گرت و بە ئەسپایی پێی گوت:- پێم گوتیت چەند رۆژێ وازی لێبێنە.

وەختێ چێلْەکەیان کوشتبۆوە، یولْدز ئەوەندە گریا بوو، هەموو گوتبوویان لە خەفەتاندا دەمرێ. دوێنێ شەویش شیوی نەخواردبوو و تا بەیانی بە دەم گریانەوە وڕێنەوە مانگابۆڕی کردبوو. بۆیە بابە، باوەژنی راسپاردبوو کە تا چەند رۆژێك واز لە یولْدز بێنێ و ئەوەندە سەر نەخاتە سەری.

باوەژن هەر ئەوەندەی گوت:- مندالْی ئەوەندە بێ دەسەلاّتم نەدیوە، نازانێ چرایەك هەلْبکا، لاکەوە لەبەرچاوم دەی!

یولْدز خۆی تەپاندە گەنجینەکەوە. باوەژن چرایەکی دی هەلْکردو بە شووەکەی گوت:- وەیش پیاوەکە بۆنی نەوت دلْم تێك دەدا.

هاوین بوو. پەنجەرەکە واز بوو.، باوەژن لە پەنجەرەکەوە سەری بردە دەرێ. بابە جلەکانی گۆڕی بوو، خەریك بوو وردە شووشەکانی خڕ دەکردەوە، کە خوشکەکەی باوەژن بە پەلە وەژوور کەوت و گوتی:- باجی خان، گۆشتەکە هێند تالْە دەلْێی ژەهری مارە.

باوەژن قەدی راست کردەوە و گوتی:- چی؟ گۆشتەکە تالْە؟

پەری پلە گۆشتێکی بۆ درێژ کردو گوتی:- تۆ لێی بچێژە.

باوەژن پلە گۆشتەکەی لە پەری وەرگرت و تەپاندییە دەمییەوە. گۆشتەکە هێند تالْ و ناخۆش بوو کە دلْی باوەژن هەمدیس تێك هەلاّت.

سەرتان نەیەشێنم، بابەو باوەژن و پەری بە پەلە چوون بۆ ئاشخانەکە. یولْدزو بووکەخان لەبەر ئەو تروسکە رووناکییەی کە لە گەنجینەکەی دەدا سەرگەرمی قسان بوون. یولْدز دەیگوت: -بووکەخان گوێت لە پەری بوو؟ گوتی گۆشتی چێلْەکە تالْ بووە.

بووکەلْەی قسەوێژ گوتی:- وا دەزانم گۆشتەکە تەنیا بۆ وان تالْەو چێلْەکە بە ئانقەست ئەمەی کردووە، لە دەمی تۆدا تالْ نابێ. یولْدز گوتی:- لێی دەخۆم.

بووکەخان گوتی:– شتێکی ئەم چێڵە هەڵبگرە، هەر بە کەڵکمان دێ، ئەم جۆرە چێڵە خەسێتی زۆریان هەیە.

یوڵدز گوتی:– بە ئاقڵی تۆ کوێی هەڵگرم؟

بووکەخان گوتی:– مەسەلە لاقی..

*- تاڵ بۆ باوەژن

*- شیرین بۆ یوڵدز

باب و باوەژن و پەری دەوری کوانووەکەیان دابوو، یەکە یەکە پلە گۆشتەکانیان تام دەکرد و تفیان دەکردەوە. هێشتا گۆشتێکی زۆر بە دارەوە بوو، دایان نابوو سبەینێ هەمووی بەسەریەکەوە بکەنە قاورمە. بابە پلێکی لێ بڕی و تامی کرد، گۆشتە خاوەکەش هەر تاڵ و ناخۆش بوو. گوتی:– ڕەنگە بەر لە کوشتنەوەی شتێکی خواردبێ بۆیە وای لێهاتووە.

باوەژن گوتی:– هیچی نەخواردووە، چەتیوە هێند چاوی لە دووی بوو تا وای لێکرد، نەگریسی چەپەڵ.

بابە گوتی:– بە خۆڕایی چێلەکەمان خەسار کرد، چەندم پێ وتیت:– ئافرەت با لە قەسابخانە گۆشتت بۆ بکڕم، قەبوڵت نەکرد و نەکرد.

باوەژن گوتی:– ئێستا چش لە چێڵەکە، من خۆم خەریکە دەمرم، بۆن بۆگەنی کوشتمی.

پەری بازووی گرت و گوتی:– وەرە بچینە دەرێ.

باوەژن خۆی دا بەسەر شانی پەری داو چوو لە قەراغ باخچەکە دانیشت و گوتی:– یوڵدز گازکە بابێ ئەم گۆشتە بەرێ بۆ ماڵی کەلسووم، بۆن بۆگەنی ماڵەکەی پڕکردووە.

کەلسووم دراوسێی دەستە چەپیان بوو، مێردەکەی لە تاران عەمەلەی(ڕۆژانە ئیش) دەکرد، عەمەلەی کورەخانە بوو، یەشاری کوڕی لە قوتابخانە بوو. کەلسوومیش بە زۆری جلشۆری ماڵانی دەکرد.

پەری بەرەو ژوورەکە غاری داو گازی کرد:– یوڵدز، یوڵدز دایە کاری پێتە، وەرە بچۆ بۆ ماڵی یەشار.

یوڵدز خەریك بوو باسی یەشاری بۆ بووکەکەی دەکرد، کە دەنگی پەری قسەکەیانی بڕی.

بووکە خان گوتی: ئەگەر حەزدەکەی خەبەری قسەکردنی منیش بە یەشار بڵێ.

یوڵدز گوتی:– ئا، ئا دەبێ پێی بڵێم.

ئەوجا چووە نێو حەوشە. تیشکی گڵۆپی کۆڵان لە نێو حەوشەی دەدا. باوەژن دانیشتبوو، هێڵنجی دەداو دەڕشایەوە. بابە قاپلەمەکەی هێنابووە بن دارتووەکە، نێو لەپی نابوو بە تەوێڵی باوەژنەوە.

پەری گوتی:– ئەو قاپلەمە گۆشتە بەرە بۆ ماڵی کەلسووم.

باوەژن گوتی:– نەچی لەگەڵ ئەو هەتیوە خوێڕییەدا بکەوێتە چەنابازی و ماتەڵ ببی.

یوڵدز گوتی:– دایە ئەدی بۆ خۆت گۆشتەکە ناخۆیت؟

باوەژن بەبێ تاقەتیەکەوە گوتی:- چما پەمووت ئاخنیوەتە کەپووتەوە، بۆنی ناکەی؟ هەڵیگرە بیبە دەی.

پەری بە باوەژنی گوت:- باجی گیان، ئەم چێڵە بە زیندوویش خۆین تاڵ و عەبوس و حەیوانێکی نانەجیب بوو.

بابە هیچی نەدەگوت، وەختێ ئاوڕی دایەوە، دیتی یوڵدز خێرا خێرا پلە گۆشتان دەردێنێ و بە تاسووقەوە دەیخوا، یەکسەر هاواری لێکرد:- نەیخۆی کچێ نەخۆش دەکەوی.

هەموو ئاوڕیان دایەوە، کە یوڵدزیان بەو حاڵەوە بینی لە سەرسامیدا ئەبڵەق بوون.

بابە دیسان گوتی:- مەیخۆ کچێ، تفی کەوە.

یوڵدز گوتی:- بابە زۆر بە تام و خۆشە، بۆ نەیخۆم.

پەری گوتی:- وەیەڕۆ! عەینی لاشەخۆران هەرچی بەر دەست بکەوێ دەیخوا.

باوەژن گوتی:- خۆ بنیادەم نییە.

یوڵدز پلێکی دی هاویشتە دەمی و گوتی:- کە بەلەزەتە.

باوەژن دڕۆدۆنگ بوو، پەری رووی ترش کرد. بابە واقی ورما.

یوڵدز هەمدیس گوتی:- چ بۆنێکی خۆشی هەیە! تامی کەرەو گۆشت مریشك و ئەم شتانە دەدا، دایە..

باوەژن تازە لە دەست و دەموچاو شتن ببۆوە، هەستاو بەرەو ژوورێ رۆیی و گوتی:- ئەوەندە بخۆ تا دەدڕێی، من هەقم چییە.

بابە گوتی:- بەسە کناچە، نەخۆش دەکەوی، بیبە بۆ ماڵی کەلسووم.

یوڵدز گوتی:- با یەك دوو پلی دیکەش بخۆم.

بابەو پەریش چوونە ژوورەوە. باوەژن دەستی نابووە سەر دڵی و بەناڵ و نك بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. کە بابەو پەری وەژوور کەوتن، باوەژن گوتی: - بۆن بۆگەنی هەموو شوێنێکی پڕ کردووە.

پەری گوتی:- بۆنی نەوتە باجی خان.

باوەژن گوتی:- یانی هێند کەرم بۆنی نەوت نەناسمەوە؟ وای دڵم!.. هەناوم دەرهات.. ئا..خ!..

پەری دەستی باوەژنی گرت و بردیە نێو حەوشە. یوڵدز هێشتا بە دیار قاپلەمەکەوە دانیشتبوو. خێرا خێرا پلە گۆشتی دەپەستیە دەمییەوە و قامکەکانی دەلستنەوە. باوەژن هاواری لێکرد:- عەمرت کورت بێ، ئینکەبەرایەتی من دەکەی! پێم وتی ئەم بۆنە بۆگەنیەمان لە کۆڵ بکەوە!..

یوڵدز گوتی:- بۆنی بۆگەنی چی دایە؟

باوەژن لەقەیەکی بە قاپلەمەکەدا کێشاو هاواری کرد: گۆشتی چێڵە گڕوێکەی تۆ دەڵێم، دەهەستە بیبە دەرێ، خەریکە جەرگ و هەناوم دەردێ.

یوڵدز گوتی:- دایە با چەند پلێکی دیش بخۆم، برسیمە.

باوەژن چنگی لە قژی یوڵدز ناو بۆڵاندی:– ئیزکەبەرایەتی من دەکەی توتەڵە سەگ!

بابە گوێی لە دەنگی وان بوو، لە پەنجەرەکەوە سەری کێشاو گوتی:– دیسان چییە؟

باوەژن گوتی:– تۆش هەر بە منی کلۆڵ دەوێری، دایمە دەنووکت لەسەرمە کە هەقم بەسەر ئەم سیسەمارەیەوە نەبێ، بڕۆنە چ ڕقەبەرایەتیەکم دەگەڵ دەکا.

یوڵدز قاپلەمەکەی هەڵگرت و بەرەو دەرکی حەوشە چوو. قاپلەمەکەی لەبەر دەرگایەکە دانا، پێی لە پشتێنەی دەرگاکە توند کردو پێیدا هەڵزنی، دەرگاکەی کردەوەو دابەزی، قابلەمەکەی هەڵگرت و لە حەوشەی وەدەرکەوت. باوەژن لە دوواوە هاواری لێکرد دەرگا دانەخەی!...

*– گفتوگۆی سادەو دڵسۆزانە

ئەوە شەوە بابەو باوەژن و پەریی لە حەوشێدا نووستن. یوڵدز گوتی:– من لە ژوورەوە دەنووم.

بابە گوتی:– تۆ دایمە دەتگوت دەترسی بە تەنێ لە گەنجینەکەدا بنووی، خێرە وا ئەوشۆ بە تەنێ دەنووی؟

یوڵدز گوتی:– ئاخر سەرمام دەبێ

پەری گوتی:– دنیا بەم گەرمییەو دەڵێ سەرمام دەبێ، شا بە تاقەتت باجی خان! هەقتە خۆشیت پێدا نایەت.

باوەژن گوتی:– وازی لێبێنە با سەگ تۆپ بکا، خۆ بنیادەم نییە. گۆشتی بۆگەنیو دەخواو دەڵێ بەلەزەتە.

وەختێ غەڵبە غەڵب و دەنگە دەنگ نەما، یوڵدز بووکەخانی گازکردە کن خۆی، بووکەخان بە خنەخن خۆی بە ژێر لێفەکەی یوڵدزا کرد، دوو بە دوو کەوتنە قسان.

بووکەخان پرسی:– یەشارت بینی؟

یوڵدز گوتی:– بەڵێ، باوەڕی نەدەهات کە تۆ فێری قسان بووی، دەبێ ڕۆژێ بە سێ قۆڵی دانیشین و...

بووکەخان گوتی:– هە نووکە هاوینە، یەشار ناچێتە قوتابخانە، دەتوانین لە بەیانیەوە تا ئێوارە پێکەوە گەمە بکەین و بگەڕێین.

یوڵدز گوتی:– ئاخر یەشار دەستی بەتاڵ نییە، دەچێتە قالیچنین.

بووکەخان گوتی:– ئەدی بابی؟

یوڵدز گوتی:– چووەتە تارانێ، لە کوورەخانەی خشت سازیدا کاردەکات.

بووکەخان گوتی:– یوڵدز لە بیرت نەچێ لاقی چێڵەکە هەڵگری، ئەو چێڵە، چێڵی ئاسایی نەبووە.

یوڵدز گوتی:– منیش پێموایە، هەر کەسێ تامی گۆشتەکەی دەکرد ،دڵی تێك هەڵدەهات، کەچی بۆ من تامی کەرەو هەنگوین و گۆشت و مریشکی دەدا. یەشارو دایکیشی لایان خۆش بوو. بەلەزەتەوە خواردیان.

بووکەخان گوتی:- یەشار باش بوو؟

یوڵدز گوتی:- کەڵەموستی بڕاوە، ناتوانێ داوی پێ گرێ بدا.

کوتو پڕ باوەژن هاواری لێکرد:- بیبڕەوە چەتیوەی سەر ڕشکن!... ئەوە شێت بووی! توخوا بە خۆتیش دەزانی چ دەڵێی!

بابە گوتی:- خەو دەبینێ.

باوەژن گوتی:- خەوسەری بخوات.

بووکەخان گوتی:- وا چاکە بخەوی.

یوڵدز لە بن لێوانەوە گوتی:- خەوم نایەت، حەزدەکەم قسەت لەگەڵ بکەم، گەمان بکەین، تۆ نەقلان دەزانی؟

بووکەخان گوتی:- جارێ تاوێ بنوو، پاشان بە خۆم خەبەرت دەکەمەوە، دەمەوێ تۆو یەشار بەرم بۆ لێڕەوار .

یوڵدز بێدەنگ بوو، بە پشتا ڕاکشاو لە پەنجەرەکەوە چاوی بڕییە ئاسمان تا سەیری ئەو ئەستێرانە بکا کە ناو بە ناو ڕادەخوشین.

* - شەوی لێڕەوار

*- شەوی خەون ئاسا

*- تەقڵەلێدانو ئاسمان

نیوەشەو بوری بوو، هەیڤ هێدی هێدی هەڵدەهاتو بەرز دەبۆوە، هەوای سەر زەوی کپ بوو، بەڵام لە سەرووتر شنەیەکی سازگاری دەهات. سێ کۆتری سپی بە دەم ئەو شنەیەوە دەفڕینو ئاسمانیان دەبڕی. شار لە ژێریاناو لەبەر تریفەی مانگ خەوتبوو، یەکێك لە کۆترەکان شاپەڕێکی شکا بوو و بە دەزوو بەستبوویان. هەندێ لە سەربانەکان خەڵکیان لەسەر خەوتبوون. منداڵێك خەبەری بۆوەو بە دایکی گوت:- دایکە تۆ بڕوانە وان کۆترانە ، دەڵێی ڕێیان گوم کردووە.

دایکی لە غوڕابی خەوا بوو و خەبەری نەبۆوە، منداڵەکە چاوی لە کۆترەکان نەگواستەوە، بە دەم تەماشاکردنەوە خەوی لێکەوتەوە.

مانگ بەرز تر دەبۆوە، سێبەران کورت تر دەبوون. کۆترەکان زۆر لە شار دوورکەوتبوونەوە. کۆترە پەڕ شکاوەکە بە کۆترەکەی ناوەڕاستی گوت:- بووکی قسەوێژ، لێڕەوار زۆر دوورە؟

کۆتری ناوەڕاست وەڵامی دایەوە:- نەء یەشار گیان، لە ناوەندی ئەو کێوانەیە کە مانگەکە لە پشتیانەوە هەڵهات، ناکا ماندوو بووبی.

یەشار، واتە کۆترە پەڕ شکاوەکە گوتی:- نەخێر، بووکەخان، حەزم لە هەڵفڕینە، هەر چەندی بفڕم ماندوو نابم، هاوینان خەو دەبینمو لە من وایە سواری قاقەز قوشییەکەم بوومەوەو دەفڕم.

کۆتری سێیەم گوتی:- منیش هەموو شەوێ خەو بە باڵو فڕینەوە دەبینم.

کۆتری ناوەڕاست - بووکەڵەی قسەوێژ- گوتی:- چۆن؟

کۆتری سێیەم گوتی:- شەوێك لە خەوما قوتووە هەنگوینەکەمانم خوارد، باوەژنم پێی زانیو بە تیرۆگێکەوە دوام کەوت، هەرچەند غارم دەدا، لاقم لە دووم نەدەهات، کەمۆکەیەکی مابوو

باوەژن بمگاتێ. لە پڕ کەوتمە باڵەفڕێو بەم سەربانو بەو سەربانداو بۆی دەرچووم و باوەژنیشم لە خوارەوە بە هەڕەشەو گوڕەشە دوام کەوت.

یەشار گوتی:- ئاخری ؟

یوڵدز گوتی:- باوەژن لە ناکاو دەستی درێژ کردو هەردوو لاقی گرتم و رایکێشامە خوارەوە، لە ترسانا یەك بە خۆ قیژاندم و خەبەرم بۆوە، سەیرم کرد بەیانییەو باوەژن نووکی پێی گرتووم و تەکانم دەداو دەڵێ:- هەستە! وا نیوەڕۆیە، خانمی خەوخۆش!

یەشارو بووکە قسەوێژەکە پێکەنینو گوتیان:- خەوێکی سەیرە!

بووکەخان گوتی:- ئاخر تۆ چ خراپەیەکت بۆ باوەژن بووە کە لە خەویشا وازت لێناهێنێ؟

یوڵدز گوتی:- چوزانم، ڕۆژێکیان بە بابمی دەگوت تا من لەم ماڵەی بم ئەوی خۆش ناوێ... بابیشم سەد سوێندی بۆ دەخوارد کە هەردووکمانی خۆش گەرەکە.

یەشار گوتی:- دڵم تەقڵە لێدانی دەوێ.

بووکەخان گوتی:- هەرسێکمان تەقڵە لێدەدەین.

ئەو شەوە هەموو شوانانی شەو بەکێوی ئەو ناوە سەیری ئاسمانیان دەکردو دەیان بینی سێ کۆتری یەکجار سپی لە قوڵایی ئاسمانا دەفڕنو تەقڵە لێدەدەنو قسان دەکەنو هەر دەڕۆنو ماندوو نابن.

لە پڕ یەشار گوتی:- سەبربکەن، زامەکەم کولایەوە.

بووکەخانو یوڵدز سەیریان کرد پەڕەشکاوەکەی خوێنی لێدەتکێ، بووکەخان هەندێ پەڕی نەرمی لەسەر سینگی خۆی هەڵکەندو برینەکەی یەشاری بەستو گوتی:- هەرکە گەیشتینە لێڕەوار، برینەکەت چەور دەکەینو زوو چاك دەبێتەوە.

گەیبوونە بناری کێوەکان، یەکەمجار دۆڵێکی تەنگ دەرکەوت، شاخەکان لەبەر زارکی دۆڵەکە سەریان وێك هێنا بۆوە و هێندەی دی تەسکیان کردبووەوە، کۆترەکان خۆیان بە دۆڵەکەدا کرد. یەشار لە بووکەخانی پرسی:- بووکەخان تۆ پێت نەگوتین بۆچی دەچینە لێڕی!... بووکەخان گوتی:- دەچینە ئاهەنگی بووکەڵان، ئەوشۆ هەموو بووکەڵەکان دێنە لێڕەواری. هەر چەند مانگ و جارێك ئەم کۆبوونەوەو ئاهەنگەمان هەیە.

یوڵدز گوتی:- بۆ کۆ دەبنەوە؟

بووکەخان گوتی:- بۆیە کۆ دەبینەوە تا وەزعو حاڵی کوڕیژگەو کچۆڵان بزانین، ئەمە جگە لەوەی ئێمەش جەژنو خۆشیمان دەوێ.

دۆڵەکە تەواو بوو. لێڕەوار دەستی پێکرد. درەخت چوو بوون بە حەلحەی ئاسمانداو لەبەر تریفەی مانگدا دەورینجانەوە.

ماوەیەك بەسەر درەختەکاندا ڕۆیین تا گەیینە ناوەندی لێڕەکە، دەنگی گفتوگۆ هاتە گوێ. ناوەندی لێڕەکە رووتەنێکی پانو گەورە بوو. حەوزە ئاوێك بە پشت درەختەکانا دەسووڕایەوە، چواردەوری حەوزەکە درەختی هەمە جۆرو بەرز بەرز بوون. باڵندەی رەنگاو رەنگیان پێوە هەڵنیشتبوونو سەرگەرمی ئاواز خوێندنو گفتوگۆ بوون. ئاگرێکی گەورە لە تەنیشت حەوزەکە

بوو، بڵێسەی سووری هەموو لایەکی روناك دەکردەوە. سەدانو هەزاران بووکە شووشەی وردو درشت لە هاتووچۆدا بوون، یا لە دەوری یەك خڕ ببوونەوەو قسانیان دەکرد. بووکە شووشەی گەورەو بچووك، پۆشتەو شڕۆڵە، کوڕو کچ تێکەڵ بوون.

گیانلەبەرانی لێرەکەش کە چاویان بەم هەموو بووكو باڵندەو گیانلەبەرانە کەوت، ئۆخژن کەوتە نێو دڵو دەروونیان. هیچ منداڵێك شتی وای بە خەویش نەدیوە. تریفەی مانگ، دیمەنی درەختو باڵندەو بڵێسەی ئاگر لە ئاوی حەوزەکەدا دیار بوون. هەموو شتێك جوانو دڵگیرو دڵڕفێنو مایەی خۆشەویستی بوو، هەر هەموو شتێك، هەموو هەموو..

## *- تاوسی چەنەباز

تاوسێك بە تاقی تەنێ کلکی شۆڕ کردبۆوەو لەسەر درەختێك هەڵنیشتبوو. بووکەڵەی قسەوێژ (بووکەخان) بە یەشارو یولدزی گوت:- وەرن بابتان بەم بۆ لای تاوسو قسەی دەگەڵ بکەن، من دەچمە کن سارا، هەر کە گازم کردن خێرا وەرن بۆ لای بووکە شووشەکان.

یولدز گوتی:- سارا کێیە؟

بووکەخان گوتی:- سارا گەورەو دەمڕاستی ئێمەیە.

بووکەخان منداڵەکانی بە تاوس ناساندو بە خۆی چوو بۆ کن دۆستەکانی. تاوس گوتی: - کەواتە ئێوە دۆستی بووکەخانی قسەوێژن.

یولدز گوتی:- بەڵێ، بۆ ئێرەی هێناوین، تا جەژنو ئاهەنگی بووکەشووشان ببینین.

یەشار گوتی:- تاوس ، تۆ چەند جوانی!

تاوس گوتی: -جارێ چیتان دیتوە، سەیری کلکم بکەن...

یەشار و یولدز روانیانە کلکی تاوس کە بەرە بەرە بەرز بۆوەو چەشنی چەترێکی گەورە کرایەوە. پەڕی پیرە تاوس لەبەر تریفەی مانگو بڵێسەی ئاگردا دەورینجانەوەو هەزارو یەك رەنگی دەنواند، منداڵەکان لە سەرسامیدا دەمیان داچەقی بوو.

تاوس گوتی:- بەڵێ وەکو بە خۆتان دەبینن، من باڵندەیەکی یەکجار جوانم، سەیری ئەو تاقە بکەن کە بە کلکم لێم داوە، منالان بە عەزرەتی تاقە پەڕێکمەوەن، تەواوی شاعیران بە جوانیو ناسکی منیاندا هەڵگوتووە، بۆ وێنە سەعدی شیرازی دەڵێ: عیللەتی جوانییە کە منداڵ مەیلی هەڵکەندی پەڕی دەکا. تەنانەت لە کتێبێکی کۆندا خوێندومەتەوە کە ئەبو عەلی سینای زاناو حەکیمی گەورە زۆر ستایشی گۆشتو پیوی منی کردووەو گوتوویەتی دەرمانی زۆر دەردانە. شاعیران خۆر بە من دەشوبهێننو پێی دەڵێن تاوسی ئاگرین. لە هەندێ کتێبی کۆندا بە ئەبولحەسەنیش ناویان بردووم، من تەنانەت لە هاولفەکەی خۆیشم جوانترم.

یەشار لە چەنەبازی تاوس بێزار بووبوو، بەڵام چونکە بە تەمابوو داوای یەکدوو پەڕی لێبکا، گوێی بۆ قسەکانی رادەدێراو چاوەڕێی دەرفەت بوو. ئان ئاخری قسەکەی بە تاوس بڕی و گوتی: - تاوس گیان یەکدوپەڕی جوان دەدەیە منو یولدز، دەمەوێ بیخەمە توێی کتێبەکانمەوە.

تاوس راچڵەکی و گوتی:– نەء  من ناتوانم دەست بەرداری پەڕە بە نرخەکانم بم، چونکە بەشێکن لە بەدەنی من، باشە تۆ دەتوانی چاوت دەربێنیٚ و بیدەیە من؟

یوڵدز زیاتر دڵی لای بووکە شووشەکان و گیانلەبەرەکان بوو و کەمتر گوێی بۆ قسەکانی تاوس دەگرت، بۆیە بەر لە یەشار گوێی لەگازکردنی بووکەخان بوو. بووکەخان کەوڵەکەی داماڵی بوو و لە پێستی کۆتر هاتبووە دەریٚ.

یوڵدز سەیری کرد یەشار زۆر نیگەرانە، گوتی:– یەشار هەڕە بچینە خواریٚ، بووکەخان گازمان دەکا.

دوعاخوازیان لە تاوس کردو لە شەقەی باڵیانداو چوونە خواریٚ.

تاوس تا ئەو کاتەش لە جێی خۆی نەبزوا بوو، نەوەك لاقە ناشرینەکانی دەرکەون، کە دیتی منداڵەکان لەسەر ڕۆیشتنن گوتی:– خێر هاتن، هیوادارم چوونە هەر شوێنیٚ باسی جوانی من بکەم.

## *– ناسینی ساراو بووکەڵەکانی دی

بووکەخان دەستێکی بە سەروچاوی یەشارو یوڵدزدا هێناو لە پێستی کۆتری دەرهێنان. بووکە شووشەیەکی ئەندام وردیلەی باڵاکولٚ لەسەر تاوێرێك دانیشتبوو.

بووکەخان پێی گوت:– سارا، ئەمانەن دۆستەکانم، یوڵدزو یەشار.

یەشارو یوڵدز سلاّویان کرد. سارا لەبەریان هەستا. منداڵەکان بە ڕێزەوە سەریان دانەواندو تۆقەیان دەگەلٚ کرد.

سارا گوتی:– خێر هاتن بۆ ئاهەنگ و داوەتی ئێمە، بە ناوی خۆم و هەموو بووکەکانەوە خێرهاتننتان دەکەم، زۆر بە خێر هاتن.

یەشار گوتی:– ئێمەش شانازی بەوەوە دەکەین کە توانیومانە خۆشەویستی و مەحەبەتی بووکەخان بە دەست بێنین، زۆر خۆشحاڵین کە میواندارییتان کردووین و وەکو دۆستی خۆتان ڕەفتارمان لەگەلٚ دەکەن، سوپاسی هەمووتان دەکەین.

سارا گوتی:– سوپاسی خۆتان بکەن کە بە ڕەوشتی جوان و ڕەفتاری دڵسۆزانە، بووکە شووشەکەتان هێناوەتە زمان و ئێرەتان دۆزیوەتەوە.

ئەوجا ڕووی کردە بووکەڵە–ی قسەوێژو گوتی: منداڵەکان بەرەو بە بووکەکانی دییان بناسێنەو پێیان بڵیٚ با هەموویان بێنە لای من، چەند قسەیەك دەکەین و پاشی دەست بە ڕەقس و سەما دەکەین.

بووکە شووشەکان کە بیستبوویان بووکەخان دۆستەکانی دەگەلٚ خۆی هێناوە جون جون لە منداڵەکان خڕ دەبوونەوەو خێرهاتنیان دەکردن و قسەی خۆش خۆشیان دەکرد.

## * –خۆ پەسەندان

قامکی یەشار دابۆیە ژان، دەستی بووکە خانی گرت و گوتی:- قامکم زۆر دێشێت، تەگبیرێکم بۆ بکە.

بووکەخان گوتی:- بیرم چوو بوو، باش بوو بیرت خستمەوە.

بووکێکی گەورە هاتە بەرەوەو گوتی:- ئەوە چییە بریندار بووی یەشار.

یەشار گوتی:- بەڵێ، کەڵەموستم چەقۆ بڕیویەتی.

یوڵدز گوتی:- لەکارخانەی قالی چنین دا...

بووکە گەورەکە گوتی:- وەرە با بچینە لێڕەکەی، من مەڵحەمێك پێدەزانم بە چەند سەعاتێك برینیان سارێژ دەکا، وەرە.

ئەوجا دەستی یەشاری گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی.

بووکەخان گوتی:- بڕۆ یەشار، بووکێکی میهرەبانە، گیادەرمانی چاك دەناسێت. دوو بە دوو بە نێو بووکەکاندا ڕەت بوون و گەیینە بن درەختەکان.

گیاندارانی لێڕەوار ڕێیان بۆکردنەوە. کەروێشکێکی سپی خڕپن سەری ژەندبووە لاسکە گیایەك. بووکەکە پێی گوت:- هاوڕێ کەروێشك دەتوانی بچی لەوسەری لێڕەکە یەکدوو گەڵای پان و نەرمم بۆ بێنی؟

کەروێشکەکە گوتی:- ئەمجارەیان بۆ زامی کێیە؟

بووکەکە گوتی:- زامی یەشار. ئێمە لێرە لە بن دار چنارەکە دادەنیشین.

کەروێشکەکە قەڵەمبازێکی داو لە پێچ و پەنای لێڕەکەدا ون بوو، بووکەکە چەند جۆرە گەڵاو گیایەکی کۆکردەوەو هاتەوە بن دارچنارەکە، بەردێکی پانی هەڵگرت و کەوتە کوتانیان.

بووکەکانی دی لێرەوە نەدەبینران، جار جارێ بڵێسەی ئاگر لە نێوان لق و پۆپی درەختەکانەوە دەبینرا.

یەشار گوتی:- بووکێ تۆ تاوس دەناسی؟

بووکە گوتی:- چاکی دەناسم، زۆر بە فیزو دەعیەیە، دایمە خەریکی پۆز لێدانە.

یەشار گوتی:- بووکەخانی خۆمان ئێمەی بردە نك وی تا بڕێك قسانی دەگەڵ بکەین کەچی بە بەشان و باڵی خۆیدا هەڵدەگوت.

بووکەکە گوتی:- بۆیە بووکەخان ئێوەی بردووەتە نك وی تا بە چاوی خۆتان خۆپەسەندان بدینن و بزانن چۆنن.

یەشار گوتی:- داوای یەکدوو پەڕم لێکرد تا بیخەمە تویێی کتێبەکانمەوە کەچی ئەوەندە بەخیل بوو نەیدامێ، گوتی پەڕەکانی هێندەش بێبایەخ نین کە من خەیاڵ دەکەم.

بووکە گەورەکە بەدەم کوتینی گیاو گەڵاکانەوە گوتی:- فشە دەکا، لەم ڕۆژانەدا پەڕەکانی هەڵدەوەرن و چەندت دەوێ بیبە.

یەشار گوتی:- بەڕاست؟

بووکەکە گوتی:- ئاخر هەموو ساڵێ لەم سەروبەندەدا پەڕی تاوسان دەوەرن.

یەشار گوتی:- باشە کە پەڕەکانی هەڵوەرین چی لێدەردەچێ؟

بووکەکە گوتی:– شتێکی یەکجار ناشیرین و کرێتی لێدەردەچیٚ. بەتایبەتی کە ئیدی ناتوانیٚ لاقە ناشیرینەکانی داپۆشێت.

*– شەوانی تاریك و لێرەوارو گوڵە ئەستێرە

یەشار دەیڕوانییە تاریکی نێو لێرەکە، لە پڕ تروسکاییەکی کزی بەرچاو کەوت، کە بە نێو گیایەکاندا دەهات و بەرە بەرە لە ئەوان نزیك دەبۆوە، بە بووکەکەی گوت:– بووکیٚ ئەو تروسکاییە لەکوێوە دیٚ ؟

بووکە گەورەکە سەری هەڵبڕی و گوتی:– ئەوە گوڵە ئەستێرەیە، کرمێکی میهرەبانە، لە تاریکیدا دەبریسکێتەوە، پێدەچیٚ بێتە نك ئێمە، نایەویٚ لە تاریکیدا بین.

گوڵە ئەستێرەکە گەییە لای وان و سلاوی لێکردن.

بووکەکە گوتی:– سلاوو هەزار سلاو گوڵە ئەستێرە، ئۆغر بیٚ؟

گوڵە ئەستێرەکە گوتی:– کە بە نێو لێرەکەدا دەسوڕامەوە گوێم لە دەنگی ئێوە بوو و لە دڵی خۆدا گوتم:– من کە تۆزقاڵە روناکییەکم هەیە بۆ نەچمە کن وان؟

بووکەکە سوپاسی کرد، یەشاری نیشان داو گوتی:– دەستی یەشار بریندارەو مەڵحەمی بۆ دەگرمەوە، کوڕێکی چاکە، یەکدی بناسن.

یەشارو گوڵە ئەستێرە کەوتنە قسان. یەشار باسی قوتابخانەو قالی چنین و داك و بابی خۆی بۆ کرد. ئەویش باسی لێرەوارو درەخت و شەوانی تاریکی لێڕی بۆ کرد. بووکەکەش مەڵحەمەکەی ساز کرد، ئەوجا چوو میوەیەکی لە دارێك کردەوە، ئاوەکەی گرت و زامەکەی یەشاری پیٚ شت و پاکی کردەوە.

*– تروسکە هەر چەند کەمیش بیٚ

*– هەر رووناکییە

*– پینەی سەر ئەژنۆکانی یەشار

کەروێشکەکە پاش چەند دەقیقەیەك هاتەوە، دوو گەڵای نەرم و پانی بە دەمەوە بوو، دانی بە بووکە شووشەکە، کە چاوی بە گوڵە ئەستێرەکە کەوت سلاوی لێکردو گوتی:– بەه، بەه، چ مەجلیسێکی دۆستانەیە!

گوڵە ئەستێرەکە گوتی:– هاوڕیٚ کەروێشك، من هەمیشە هەوڵدەدەم مەجلیسی تاریکی کەسانی دی روناك بکەمەوە، ئەم لێڕەی روناك بکەم، گەرچی هەندیٚ گیانلەبەر گاڵتەم پیٚ دەکەن و دەڵێن:– بەگوڵیٚ بەهار نایەت، تۆ بە خۆڕایی خۆت ماندوو دەکەی و هەوڵ دەدەی، بەم تروسکە کەمەت لێرەواری تاریك رووناك بکەیەوە.

کەروێشك گوتی:– ئەمە قسەی قەدییمەکانە، ئێمە دەڵێین: –تروسکە هەرچەند کەمیش بیٚ هەر رووناکییە.

بووکەکە، مەڵحەمی لە برینەکەی یەشار نا، گەڵاکەی تێوە پێچا.

کەروێشك گوتی:– بووکیٚ چ کارێکی دیت بە من نییە؟
بووکیٚ گوتی:– تاوس، لەسەر دارەکەی رۆخی حەوزەکە هەڵنیشتووە خۆت دەزانی رۆژو وەختی پەڕوەرینێتی، هەڕو کارێکی وا بکە تا لە پڕ ڕاچڵەکیٚو یەکدوو پەڕی لێبکەویٚ، ئەوجا بیان هێنە دەیدەین بە یەشار. دەیخاتە بەینی کتێبەکانی.
کەروێشك بە هەڵقون هەڵقون رۆیی، گوڵە ئەستێرەکە گوتی:– ئەو تاوسە روح زلە دەڵێی؟
بووکەکە گوتی:– بەڵیٚ.
یەشار گوتی:– زۆر بە پەڕەکانیەوە دەنازیٚ.
گوڵە ئەستێرە گوتی:– هاوڕیٚ یەشار، خۆ دەبینی بووکیٚ چ جلو بەرگێکی رەنگینو جوانی لەبەردایە، هەموو شوێنێکی لە تاوس جوانترە، کەچی زۆر بیٚ هەواو خاکییە، بۆیە ئەگەر ئەم جلانەشی فڕیٚ بدا هەر خۆشمان دەویٚ، هەمیشە هەر لامان جوانە، چ بە جلەوە بیٚ چ بەبیٚ جل.
یەشار لەبەر تاریكو ڕوونی نێو درەختەکانەوە دەستی بەسەر پینەی سەر ئەژنۆکانی خۆیدا هێنا، سەیرێکی قۆڵە هەڵدڕاوو و پێیە خاوسو پاژنە شەقار شەقارەکانی خۆی کردو هیچی نەگوت.
بووکیٚ گوتی:– یەشار، وا نەزانی منیش وەکو ئەو تاوسە دیلی جلی رەنگاو رەنگم، ئەمانەیان لەماڵەوە لەبەر کردووم، ئاخر من لە ماڵە دەوڵەمەندێکا دەژیم، بووکەخانی لەمەڕ ئێوە ماڵەکەمان پێدەزانیٚ.
بووکیٚ، پارچەیەکی لە تەنوورەکەی خۆی دڕیو دەستی یەشاری پیٚ بەست، هەستان بڕۆن، گوڵە ئەستێرە گوتی:– من لێرە دەبم تا هاوڕیٚ کەرۆێشك دەگەڕێتەوەو دەینێرم بۆ لاتان.
بووکیٚو یەشار تازە گەیی بوونە ناوەندی درەختەکان کە کەروێشکەکەیان پێگەیی، دوو پەڕی جوانی تاوسەکەی بەدەمەوە گرتبوو. یەشار پەڕەکانی لێوەرگرتو کەوتنە ڕیٚ.

### *– با شترین سەماو هەڵپەڕکێی دنیا

سارای گەورەو دەمسپی بووکە شووشەکان، لە رەخی حەوزە ئاوەکە وەستا بوو و قسەی دەکرد، بووکەکان سەراپایان بووبوو بە گویٚو موویان لێنەدەبزووت. یوڵدز لە سوچێکا وەستا بوو.
سارا دەیگت:– لەوەی پتر سەرتان نایەشێنم، لە هەوەڵی چلەی بچوکیشا کۆدەبینەوەو ئاهەنگ دەگێڕین، لە کۆتاییدا جارێکی دی سوپاسی میوانە ئازیزەکانمان دەکەم کە بە میهرەبانیو چاکی خۆیان بووکە خانی لەمەڕ خۆیان فێرە قسان کردووە. هەموومان دەزانین تا ئێستا هیچ منداڵێك نەیتوانیوە ئەوەندە باش بیٚ بووکە شووشەی خۆی بێنێتە زمان.... هیوادارم دۆستایەتی یوڵدزو یەشارو بووکەخانیان دۆستایەتی تا سەر بیٚ، ئێستایش بە خۆشی میوانە ئازیزەکانمانەوە سەماو هەڵپەڕکێی گوڵی سوور دەکەین.

هەموو چەپڵەمان بۆ سارا لێداو بڵاوەیان لێکرد. بووکی قسەوێژ منداڵەکانی لەسەر تاوێرێکی بەرز داناو گوتی:- لێرە دانیشن بۆ خۆتان سەیربکەن، سەمای گوڵی سوور چاکترین سەمای دنیایە.

* - سەمای گوڵی سوور

*- سروودی گوڵی سوور

مەیدانەکە چۆڵ بوو. گیانلەبەران ئەڵقاو ئەڵق لەبن درەختەکان دانیشتبوون، باڵندەکان بە درەختەکانەوە هەڵنیشتبوون و چ شتێ نەدەبینرا. ئەوجا دەنگی نەرم و خۆشی مۆسیقا بەرز بۆوە. ١٥- ٢٠ بووکە شووشەی وەنەوشەیی پۆش بە دەم ساز لێدانەوە هاتنە مەیدانەکەو بەرە بەرە هاتن و لە سوچێکا وەستان. ئەوجا قایەخێکی سپیی وەکو بەفر لەوسەری حەوزەکەوە دەرکەوت، لەسەر نەزمی مۆسیقاکە دەجوڵاو دەهاتە پێشێ. دەستەیەك بووکە شووشەی سپی پۆش بە بێدەنگی لەسەر قایەغەکە وەستا بوون، خوڕە خوڕی ئارام بەخشی ئاوەکە پەردەی گوێی دەلەراندەوە. مراوی و قووی سپی لە پشت و پێشەوە قەیاغەکەیان داژۆت. ماسی سووری وردو درشت کۆمەڵێ ماسی سپییان دابووە ناوەڕاست و بەرەو پێش دەهاتن. مانگ لە ناوەندی ئاوەکەدا بوو، کە قایەغەکە گەییە کەنار حەوزەکە بووکە سپی پۆشەکان بە سەماکردنەوە دابەزین. مراوی و قوو و ماسییەکان لە قەراغ ئاوەکە ریزیان بەست. بووکەکان بە دەم شان هەڵتەکاندنەوە سووك سووك سەمایان دەکرد، داوێنی کراسەکانیان بە ئاستەم لە عاردی دەخشا، بەدەم سەماوە لێکدی نزیك دەبوونەوەو بزەیان بە رووی یەکدا دەداو دوو بە دوو، سێ بە سێ هەڵدەپەڕین و سەمایان دەکرد. یەکدوویەکیان دەستیان بە گۆرانی چڕین کرد، وردە وردە ئەوانی دیش تێکەڵیان بوون و دەنگی مۆسیقاو ئاواز لێرەوارەکەی پڕکرد. بووکەکان ئەم گۆرانییەیان دەچڕی.

رۆژێ بوو، رۆژێ نەبوو
لە کەنار ئەم ئاوە شینەدا
گوڵێکی سوور روا بوو
درشت،
جوان،
پەڕ پەڕ،
با هەڵیکرد
باران دایکرد
بوو بە بۆران
بوو بە تۆفان
سۆر گوڵ هەڵکەندرا.
پەڕەکانی هەڵوەرا

کێوە چوون؟

چییان لێکردن؟

مردوون، ماون؟

کەس نازانێ

وای کە سۆرە گوڵێکی چەند جوان بوو؟!....

بووکە سپییەکان بە دەم گۆرانیو سەماوە گردبوونەوەو لە پاڵ بووکە وەنەوشەییەکاندا وەستان. دوای تۆزێك بووکۆکەیەکی قشتیلەی سوور بە سەماکردنەوە لە پشت درەختەکانەوە هات.

بووکە سپی پۆشەکان دەستیان بە گۆرانی کرد:

ئێمە، ئەمە دەناسین

پەڕی سۆر گوڵە

لە کێوە دێ؟

بۆ کوێ دەچێ؟

کەس نازانێ؟

بووکە شووشەکە کەمێك هاتو نەختێك چوو، ویستی لە سوچێکەوە دەرچێ، تووشی بووکە سوورەیەکی دی بوو، تاوێك لێکدی ڕامان، ئەوجا دەستی یەکدیان گرتو کەوتنە سەمایەکی شادو خێرا ، تاوێ هەڵپەڕین، قەدەرێ سەمایان کرد، ئەوجا سۆرە بووکێکی دی هاتە دەستیانەوە، سۆرە بووك سەری کرایەوە، نزیکەی سەد سۆرە بووکی گەورەو بچووك هاتن، دەستە دەستە ئەڵقەیان بەستبوو و دەڕەقسین، ڕەقسێکی شادو خێرا، مانگ ڕێك لەبان سەریان بوو، ئاگرەکە کوژابۆوە.

دەنگی مۆسیقا توندتر بوو، بووکەکان دەستیان بەردا، بڵاوەیان لێکرد، لە کەنار حەوزەکەدا تێکەڵ بوون.

یوڵدز و یەشار لەسەر تاوێرەکە دانیشتبوون، بە جۆرێ ئاوێتەی شایی بووکەکان بووبوون، ئاگایان لە خۆ نەمابوو. یەشار تەنانەت پەرە تاوسەکەشی بیر چوو بوو. لە پڕ دیتیان گوڵێکی سوور، لە قەراغ حەوزەکە دروست بوو. درشت، جوان، پەڕپەڕ. گوڵە سوورەکە دەستی بە سەماو سوڕدان کرد. بووکە سپییەکان کەوتنە خۆ، دەوری گوڵە سوورەکەیان گرتو ئەوانیش کەوتنە سەماو سوڕدان.

نەزمو ریتمی سەماکە بەرە بەرە خێراتر دەبوو، منداڵەکان وا هاتبوونە جۆش هەر هەستانو دەستی یەکیان گرتو هاتنو تێکەڵی بووکە شووشەکان بوون. گیانلەبەرو باڵندەو درەختەکانیش هاتبوونە جۆشو خرۆش.

بووکەکان تا تاقەتیان بوو سەمایان کرد. هەڵپەڕین، سووڕیاندا ئەوجا بڵاوەیان لێکردو دیسان مەیدانەکە چۆڵ بوو. دوای تۆزێك بوکەکان هەموو بەجلی جارانی خۆیانەوە پەیدا بوون.

کاتی ڕۆیشتن بوو، مانگ بەرە بەرە زەرد هەڵدەگەڕا.

## *-هاتووچۆی کۆتران

## *- ئەو مەتەڵەی باوەژن بۆی هەڵنەهات

دنیا روناك بوو بوو. باوەژن چاوی هەڵێنا، بینی سێ کۆتری سپی وەکو چۆڕی شیر لەسەر دار تووەکە نیشتوونەتەوە. برێك سەیری یەکتریان کردو ئەوجا یەکێکیان هەڵفڕی‌و خۆی بە ماڵی یەشاردا کرد. دووەکەی دیش لە پەنجەرەکەوە چوونە ژوورەوە. باوەژن زۆری چاوەنۆڕ کرد کەچی کۆترەکان هەر نەهاتنە دەرێ. خەوی زڕاو، هەستا، چوو لە پەنجەرەکەوە نۆڕییە ژوورێ، دیتی یوڵدزو بووکەکەی دوو بە دوو خەوتوون‌و چ شتێك لە ژوورەوە نییە، زۆری پێ سەیر بوو، هەندێکیش ترسا، نەیوێرا بچێتە ژوورەوە.. چەند دەقیقەیەك لەوێندەر وەستا، ئەوجا هاتەوەو بە نیگەرانییەوە خۆی لە بن پیرە لێفەی هاویشت، چاوی بڕیبووە پەنجەرەکەو گوێی هەڵخستبوو. دوای تۆزێك دەنگێکی نا ئاشنا لە پەنجەرەکەوە هات.

دەنگێك بەچپە وەڵامی دەنگی یەکەمی دایەوە، لە تۆ وایە دوو کەس قسان دەکەن. باوەژن لە ترسانا ئارەقی کردەوە. چاوە ئەبڵەقەکانی لە پەنجەرەکە نەدەگواستەوە. دیسان دەنگی چپەی دووەمی بەر گوێ کەوت. شووەکەی خەبەر کردەوەو گوتی:– هەستە بزانە کێ لە ژوورەوەیە، دەترسم.

بابە گوتی:– ئافرەت بخەوە، کێ بەم بەیانییە دێتە دزی؟

باوەژن گوتی:– دز نییە، شتێکی دیە. جووتێ کۆتر چوونە ژوورەوەو ئیدی نەهاتنە دەرێ.

بابە، لەبەر خاتری ژنەکەی هەستاو چوو لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی کرد، سەیری کرد یوڵدز بووکەکەی لە ئامێز ناوەو نوستووە.

گەڕایەوەو بە ژنەکەی گوت:– چ نییە ئافرەت، خەونت دیتوە! ڕابە سەماوەرەکە پێبکە، ئەم بیرە منداڵانەیە لە مێشکی خۆت دەربکە.

باوەژن هەستا، چوو بۆ ئاشخانەکە تا چای دەم بدا. بابە مەسینەکەی هەڵگرت‌و چوو بۆ ئاودەست. پەری هێشتا خەوتبوو. ئەگەر بەخەبەر بوایە ئەویش ئەو کۆترە سپییەی دەدی کە لە ماڵی یەشارەوە هات‌و لە پەنجەرەکەی ئەمانەوە وەژوورکەوت، پاشان دەنگی چپە دوو هات.

باوەژن ئاگرگەردانەکەی*بە دەستەوە بوو، خەریك بوو لە داڵانەکەوە تێدەپەڕی کە گوێی لە گفتوگۆیەك بوو.

دەنگێك گوتی:– بووکە خان هەستە ئەم کەوڵی کۆترەم لێ داماڵێنە، ئەوجا بخەوە.

دەنگێکی دی گوتی:– باش بوو هاتی، بیرم چوو بۆوە کە بە کۆتری چووبوویەوە ماڵی خۆتان، وەرە پێشەوە با لەو پێستەت دەربێنم.

دەنگی یەکەم گوتی:– دەبێ بچینە ماڵی ئێمە، لێرە نابێ.

دەنگی دووەم گوتی:– راستە لێرە نابێ، بفڕە با بڕۆین.

باوەژن هەر ئەوەبوو شێت نەدەبوو، لە ترسانا یەك بەخۆی قیژاندیو غاری دا بۆ حەوشە. بابە لە نێو حەوشەداو لە قەراغ باخچەکە دانیشتبوو، خەریکی دەستو دەموچاو شتن بوو، ئاوڕی دایەوە، جووتێ کۆتری سپی دیت لە پەنجەرەکەوە هاتنە دەرەوە.

هەندێ بە حەوادا سووڕانەوەو خۆیان بە ماڵی یەشاردا کرد. بە ژنەکەی گوت:– ئەم مەکربازییە چیە ئافرەت؟ لە کۆترەکان دەترسای؟ ئەوە ئەوانیش ڕۆیشتن.

پەری لە دەنگە دەنگی وان خەبەری بۆوەو هەستا. باوەژن ئاگر گەردانەکەی بەدەستەوە بووو لە پاڵ دیوارەکەدا وەستابوو گوتی:– دیسان قسانیان دەکرد. (لەمە چێتر) بوون.

پەری واقی وڕمابوو. باوەژنو بابە هەر دەحکەیان بوو. ئاگایان لەوەنەبوو کۆترێکی سپی لەسەر گوێسەبانەکەیەو دەیەوێ وەژوورکەوێ. تومەز بووکەخان بووو لای یەشار دەگەڕایەوە کە هەستی کرد کەس چاوی لێ نییە خێرا وەژوورکەوت. باوەژن گوێی لە شەقەی باڵی بوو، سەری هەڵبڕیو دیتی، هاواری کرد:– ئەوەتا!. بڕوانە!.. دیسان یەکێکی دی چووە ژوورەوە.

بابە خێرا خۆی گەیاندە بەر پەنجەرەکە، کۆترەکەی دی چووە گەنجینەکەوە. بابە خۆی بە گەنجینەکەدا کرد، بەڵام هیچی نەبینی. خۆی مات دا تا بزانێ ئەم کۆترە نەحلەتییە چی لێهات. لە پڕ بووکەخانی بینی کە لە پشت دەرگاکەوە بە پێوە وەستابوو.

یوڵدز لە غوڕابی خەوێکی ئەوتۆدا بوو لە تۆ وایە چەندین شەوو ڕۆژە نەنووستووەو بەم زووانەش خەبەری نابێتەوە. بابە سەیرێکی کرد، لێفەکەی لەسەر لابرد. دیتی بە تەنیایە. دەویست بزانێ کێ بووکەکەی بردووەتە گەنجینەکەوەو لە پشت دەرگاکەی داناوە.

باوەژنو پەری لەبەر پەنجەرەکەوە زەق زەق دەیانڕوانییە بابە، باوەژن گوتی:– ئەوە بووکەکەی ئەو چەتیوە چی لێهاتووە؟ خۆ کە من هاتم لە تەنیشتییەوە بوو.

بابە گوتی:– لە گەنجینەکەدایەو کۆترەکەش دیار نییە.

باوەژن گوتی:– پێم وایە ئەم بووکە شتێکە، دەترسم بەڵایەکمان بەسەر بێنێ..

باوەژن هەندێ وێردی لە بن لێوانەوە خوێندو فوویەکی بە خۆدا کردو گوتی:– تۆ ئەو سەر بەڕشکە هەستێنە..

بابە، بە نووکە پێیان یوڵدزی جولاندو گوتی:– ڕابە کناچە.

*– یەشار بوو بوو بە نەزەرکردەی ئیمامان.

دایکی یەشار نیوەڕۆ گەڕایەوە، سەیری کرد یەشار هەر نووستووە.

کەلسووم لە بەیانیەوە تا ئێستا لای باوەژنەکەی یوڵدز بوو. جلی بۆ شۆردبوون. گۆشتە بۆگەنیوەکەی بردووو فڕێی دابووە بەر سەگی کۆڵانان.

دنیا گەرم بوو. یەشار ئارەقی کردبۆوەو لێفەکەی لەسەر خۆی لادابوو. بەسەر تەنیشتی چەپا نووستبووو ئەژنۆکانی لەبەر زگیا خڕکردبوونەوە. دایکی سەیرێکی کرد، بینی پەڕۆی سەر برینەکەی دەستی گۆڕاوەو پەڕۆیەکی شینی ئاوریشمی پێوە بەستراوە. کەلسووم یەشاری تەکان دا. یەشار چاوی هەڵێناو گوتی:– دایکە با تۆزێکی دی بخەوم.

دایکی گوتی:– کوڕە هەستە، نیوەڕۆیە، تۆ کەی ئەوەندە تەمبەڵ بووی؟ ئەم پەڕۆ شینەت لە کوێ بوو وا پەنجەت پێ بەستووە؟

یەشار خێرا سەیری پەنجەی کردو لە ناکاودا هەموو شتێکی بیرکەوتەوە. کەمێك پەشۆکا.
دایکی بە دیارییەوە دانیشت. بە چمکی عەباکەی ئارەقەکەی سەر نێوچەوانی سڕی و گوتی:– بە دایەت نەگۆت ئەم پەڕۆ پاك و خاوێنەت لە کوێ بوو؟

یەشار گوتی:– خەونم دی، پیاوێکی نورانی هاتە لام و گوتی:– دەتەوێ برینەکەی دەستت چاك بکەمەوە ڕۆڵە؟ منیش گوتم:– ئەدی بۆ نامەوێ قوربان. پیاوە نورانییەکە مەڵحەمێکی لە گیرفانی دەرهێناو برینەکەی چەورکردم و بەستییەوەو گوتی:– تا تۆ لە خەو هەڵدەستی برینەکەشت چاك دەبێتەوە..

یەشار کەمێك بێدەنگ بووو ئەوجا لەسەری ڕۆیی. پیاوێکی میهرەبان بوو، دەموچاوی ئەوەندە نورانی بوو هەر مەپرسە. کاتێ برینەکەی بۆ بەستمەوە گوتی:– سەیرکە بزانە ئەوە چییە لە پشتەوە؟ ئاوڕم دایەوە هیچ نەبوو، کە ڕووم وەرگێڕایەوە پیاوە نورانیەکە نەمابوو.

دایکی یەشار هێند بە سەرسامی و بێ جووڵە سەیری کوڕەکەی دەکرد کە یەشار هەوەڵجار ترسا، بەڵام وەختێ دایکی هاتەوە قسان هەستی کرد فێڵەکەی تەواو سەری گرتووە. دایکی دووپاتی کردەوە:– وتت دەموچاوی نورانی بوو؟

یەشار گوتی:– بەڵێ دایکە، عەینی ئەوەکەی ئەو ڕۆژە خۆت باست دەکرد کە هاتبووە خەونی داپیرەوەو لاقە شەلەکەی چاك کردبووە، ئەها برینەکەی منیش ئێشی نەماوە!

گریان لە ئەوکی دایکی یەشار گیرابوو، هەڵبەتە گریانی شادی. کوڕەکەی ڕاکێشایە باوەشی و سەری ماچ کردو گوتی:– تۆ بووی بە نەزەرکردەی ئیمامان، خۆشیان ویستووی. ئای ئەگەر بابت پێ بزانێ!.. وتت پەنجەت ئێشی نەماوە!..

یەشار گوتی:– وەکو پەنجەکانی دیکەمی لێهاتووەتەوە. لە سبەیەوە دەچمەوە سەر کارەکەم. ئەوجا برینەکەی کردەوەو مەڵحەم و گەڵاکەی لەسەر لاداو نیشانی دایکی دا. جێی برینەکە سپی بووبوو، چ کێم و چڵکێك نەمابوو.. سەر لە نوێ برینەکەیان بەستەوە. یەشار هەستا.

لێفەو دۆشەك و سەرینەکەی کۆ کردەنەوەو خستنییە سەر سندوقەکەو گوتی:– دایکە دنیا گەرم بووە، ئەوشۆ لەسەربان دەنووم. دایکی تەماشایەکی کردو هیچی نەگوت. یەشار چووە نێو حەوشە تا دەست و چاوی بشوا. کەلسووم لە ژوورەوە وێردی دەخوێند وشوکرانەی دەکرد. یەشار تازە بیری کەوتەوە کە پەڕە تاوسەکانی لە لێڕەکەدا جێ هێشتوون.

## *–مێروولە

یەشار لە قەراغ باخچەکە وەستابوو و میزی دەکرد. چاوی بە لاقە چێڵێك کەوت کە لە پاڵ دیوارەکە کەوتبوو. پشیلەیەکی ڕەشیش لەسەر دیوارەکە هەڵتوتا بووو چاوی تێبڕی بوو. یەشار هەندێ داما و ئەوجا بیری کەوتەوە کە دوێنێ شەو یوڵدزو بووکەخان چیان پێگوتبوو.

دوێنـێ شەو لە کاتی گەڕانەوەیان لە لێڕەوار، یوڵدز پێی گوتبوو سبەی کە دایکت هات بۆ ماڵمان، لاقە چێڵەکەی پێدا دەنێرم، با لای تۆ بێ، باش مقەیەتی بکە.

یەشار گوتبووی:- بۆ؟

بووکەخان وەڵامی دابۆوە: چونکە چێڵێکی ئاسایی نەبووە. لاقی هەڵدەگرین، بە کەڵکمان دێ. هەرکاتێ تووشی گۆڵمەزێك بووین دەتوانین داوای یارمەتی لێبکەین.

یەشار لە گێژاوی ئەم بیرانەدا بوو کە لە پڕ قیژەو زیڕەی یوڵدز رای چڵەکاند. یەك بەخۆی دەیقیژاندو دەیگت:- نەکەی دایە!.. غەڵەتم کرد.. پورە پەری فریام کەوە!.. ئاخ خەڵکینە!.. یەشار گێژو کاس لە جێی خۆ وەستا بووو نەیدەزانی چ بکا، لە پڕ بەرەو لاقە چێڵەکە غاری دا، هەڵی گرتو بە ئەسپایی گوتی:- باوەژن خەریکە یوڵدز دەکوژێ، نووکە چ بکەین؟ دەنگێکی کز هاتە گوێی یەشار:- هەڵم بدە سەربان، وریای پشیلە رەشیش بە.

یەشار پشیلە رەشی دەرکرد، ئەوجا لاقە چێڵەکەی هەڵدایە سەربان. دایکی گوێی لە تەپەی لاقە چێڵەکە بوو، هەر لە ژوورەوە گوتی:- یەشار ئەوەچی بوو کەوتە سەربان؟

یەشار گوتی:- چ نەبوو، ئەو لاقە چێڵە بوو کە بۆت هێنابووم، هەڵمدایە سەربان، تا وشك بێتەوە.

دایکی گوتی:- ئەوە یوڵدز بۆی ناردیت. باشە تۆ لاقی چێڵت بۆچییە؟

یەشار گوتی:- دایکە پێدەچێ دیسان باوەژن لە یوڵدز بدا، بۆ ناچی سەرێ بدەی؟

دایکی گوتی:- ئێمە هەقمان چییە ڕۆڵە گیان، هەرکەسە کاری خۆی چاکتر دەزانێ.

یەشار گوتی:- ئاخر دایکە.

دایکی گوتی:- خێرا دەستو چاوت بشۆو وەرە نێوەڕۆژەکەمان بخۆین.

یەشار چیدی ماتەڵ نەبوو، بە قەڵدرمەکانا سەرکەوتە سەربان.

لاقە چێڵەکە گوتی:- (١٥-٢٠ ) مێرووولەی لوق درێژم ناردووە بۆ گیانی باوەژن، مقەیەتی پشیلە رەش بە، دەترسم ئاخری رۆژێك زەفەر بێنێو بمفڕێنێ.

یەشار روانیە ئەو ناوە، سەیری کرد پشیلەیەکی رەش بە ماتە مات دێتە پێشەوە، کەستەکێکی لەو ناوە هەڵگرتو سرەواندییە پشیلە ڕەش، پشیلە قەڵەمبازێکی داو هەڵات.

*- بیبەر تامی چی دەدا؟

*-مێرولە فریای یوڵدز دەکەون.

ئێستا بۆ وەی بزانین یوڵدز بۆ هاواری دەکرد نەختێ دەگەڕێینەوە بۆ دواوەو دەچیینە کن یوڵدزو باوەژنەکەی.

ماڵی بابی یوڵدز بریتی بوو لە دوو ژووری روو لە قیبلەو دالانێك لە بەینی هەردوو ژوورەکەدا.

ژووریکیان کە گەنجینەیەکیشی لەگەڵدا بوو هی دانیشتن بووو ئەوی دیکەیان ژووری میوان بوو. ئاشخانەیەکی بچکۆلەش لە دالانەکەدا بوو. ئاودەست و تەنوورخانێکیش لەو سەری حەوشەکە بوو.

قالدرمەیەك بە تەنیشت ژووری میوانا دەچووە سەربان.

ئەو رۆژە کە دایکی یەشار چوو بۆ ماڵی وان باوەژن لە ئاشخانەکەدا هێلکەو رۆنی بۆخۆی دەکرد. پەری لە پشت دەرگاکەوە دانابوو. تا سووسەی یوڵدز بکاو بزانێ چ دەکا.

باوەژن لەو بەیاینییەوە هەستی بەوە کردبوو کە شتێك لە نێوان یوڵدزو بووکەکەی دا هەیە. پەری بە بێدەنگی لە پشت دەرگاکەوە گوێی هەڵخستبوو، لە درزی دەرگاکەوە تەماشای دەکرد. بابە هێشتا لە دایەرە نەگەڕابۆوە. یۆڵدز تا ئەو کاتە بۆی رێك نەکەتبوو لەگەڵ بووکە خاندا قسە بکا. بابەو باوەژن زۆریان هەوڵ دابوو قسەی لێدەربێنن.. بەڵام نەیان توانی بوو. یوڵدز خۆی گێل کردبوو، کە دڵنیا بوو لەوەی کەس سووسەی ناکا، هەستاو چوو بەلای بووکەکەیەوە.

گوتی:- وێدەچێ باوەژن سووسەی شتێکی کردبێ.

بووکەخان گوتی:- وا چاکە چەند رۆژێك لێکدی دوور بین.

یوڵدز گوتی:- پورە پەری خراپ نییە، بەڵام ئامان لە دەست باوەژن خۆ ئەگەر بزانێ بووکەکەم قسە دەکا، یەك دەقە بەند نابێ، خێرا تەنور دادەخاو دەتخاتە تەنوورەکەوەو دەتسووتێنێ.

پەری، لە ناوەڕاستی ئەم قسانەدا هەستاو چوو باوەژنی ئاگادار کردەوە. باوەژن خاکەناس بە دەست خۆی گەیاندە پشت دەرگاکە، چ دەنگێك نەدەهات. لە درزی دەرگاکەوە ڕوانی. یوڵدز دەرگای گەنجینەکەی داخست و هات لەبن دیوارەکە دانیشت و کەوتە ژماردنی پەنجەکانی. باوەژن دەرگاکەی کردەوەو گوتی:- ئەوە لەگەڵ کێدا قسەت دەکرد؟.. خێرا پێم بڵێ ئەگینا دەستت دەرزی ئاژن دەکەم، چەتیوی بێ حەیا!

یوڵدز دڵی داخورپا، ویستی شتێك بڵێ، زمانی تێك ئالاو کەوتە منجە منج. باوەژن دەرزییەکی لە بەرۆکی دەرهێناو کردی بە دەستی یوڵدزا. یوڵدز هاوارو فیزاحی پێکەوت. باوەژن دەست بەردار نەبوو. یوڵدز کەوتە لەقەفرتێ و ویستی رابکا. پەری توند مەچەکی گرت و لەبەر دەستی باوەژندا رایگرت. باوەژن دەرزیەکی بە دەستەکەی دیکەشیان کردو گوتی:- ئەو بابەت مرد جارێکی تر بە درۆیان قایلم بکەی، منیش بابت نیم تەفرەم بدەی. پێم بڵێ بزانم ئەو بووکە چەپەڵە چییە؟ چی لە ژێر سەردایە؟ پێم دەڵێی یا بیبەرت لە دەمی بکەم؟

یوڵدز بە دەم گریانەوە گوتی:- من هیچ نازانم دایە... ئاخر من چوزانم!...

باوەژن رووی کردە پەری و گوتی:- پەری خێرا بچۆ ئەو شووشە بیبەرەم بۆ بێنە، مەگەر بیبەر ئەم بێ حەیایە بێنێتە قسە.

پەری بەغار شووشە بیبەرەکەی هێنا. باوەژن هەندێ بیبەری خستە ناو لەپی خۆیەوە و ویستی یوڵدز بگرێ. یوڵدز لە دەستی دەرپەڕی و خۆی گەیاندە سوچی دیوارەکە. باوەژن بە پەری گوت. ئا تۆ وەرە دەستیم بۆ بگرە، تا تێی بگەیەنم باوەژن یانی چی؟

پەری و باوەژن یوڵدزیان خستە سەر پشت. باوەژن خۆی دا بەسەر لاقەکانیاو پەریش توند هەردوو دەستی گرت. باوەژن دەمی یوڵدزی داپچڕی و ویستی بیبەرەکە بکاتە دەمییەوە. یوڵدز زەندەقی چوو، بە جۆرێ دەیقیژاند دەنگی دەگەییە حەوت گەڕەکان، یوڵدز هاواری دەکرد و دەیگوت:– تۆبە غەڵەتم کرد، تۆبە پورە پەری فریام بکەوە.

پەری هیچی نەگوت. باوەژن پێی گوت:– تا راستیم پێ نەڵێی وازت لێ ناهێنم. یوڵدز بە دەم گریانەوە گوتی:– هیچ نازانم... وازم لێ بێنن!... هاوار خەڵکینە!... ویستی خۆی دەرباز بکات. باوەژن بیبەرەکەی لە زاری کردو گوتی:– دەبخۆ دەی، بیبەر بخۆ بزانە تامی چی دەدا؟! یوڵدز کۆکە کۆکی پێکەوت، پرژی تفەکەی چوو بە سەروچاوی باوەژنا. بیبەرەکە چووە چاوییەوە. پەری لە پڕ قیژاندی و راپەڕی، دەستی بۆ پشت ملی برد، مێروولەیەکی لۆق درێژ بە هەموو هێزییەوە دەمی ژەنی بووە ملی، ئەوجا مێروولەیەکی دی پوزی باوەژنی گەست.

مێروولەیەکی دی چزەی لە قۆڵی پەری هەستاند. ئەوجا یەکێکی دی گازەرای پشتی باوەژنی گەست. وایان لێهات ناچار غاریان دایە نێو حەوشە. ئەنجام بە تاکە پێڵاو کەوتنە گیان مێروولەکان، جێ گازی مێروولەکان بە رادەیە دەسووتایەوە کە پەری گریانی پێکەوت. یوڵدز دەمەو روو لە ناوەندی ژوورەکەدا کەوتبوو، بە هەردووک دەستان دەمی گرتبوو، هەنسکی هەڵدەداو دەنوزایەوە. بۆنی خواردنی سووتاو لە ئاشخانەکەوە هات.

*– میوانەکانی باوەژن و پەری

خۆر لە زەردەی ئێوارە بوو. یەشار جێگاکەی لەسەربان راخستبوو، هاتبووە قەراخ سەربانەکە، لاقەکانی شۆڕ کردبوونەوەو تەماشای خۆر ئاوابوونی دەکرد. زەردەی خۆرئاوا، رەنگی ئاسۆی رۆژئاوابوون و کلکە هەوری ئاڵی ئێوارانی بەلاوە دڵگیرو جوان بوو، کە دنیا تۆزێك تاریك بوو. ئەستێران هەڵهاتن، تاك و تەرا لێرەو لەوێ، کزو رەنگ زەرد– کە وردە وردە دەکەوتنە گرشەگرش سەرەتاتکێیان دەکرد.

دەنگی پەری ڕایچڵەکاند. پەری لەبەر پەنجەرەکەدا وەستا بوو و بە دایکی ئەوی دەگوت: – کەلسووم، وەرە بۆ ماڵی ئێمە نامەی مێردەکەت هاتووە.

دوای چەند دەقیقەیەك کەلسووم و یەشار گەیینە نك بابی یوڵدزو چاویان بڕیبووە دەمی ئەو. پەری و باوەژنیش لە ژوورەوە بوون. یوڵدز دیار نەبوو.

بابی یەشار بە ئەدەرسی بابی یوڵدز نامەی دەنارد. لە نامەکەیدا نووسی بووی بڕێك نەخۆشەو ناتوانێ کاربکا، لەم رۆژانەدا دەگەڕێتەوە کن ژن و منداڵەکەی.

بابی یوڵدز گەیبووە ئاخرو ئۆخری نامەکە، لە دەرگا درا، چەن میوانێك خۆیان بە ژووریدا کرد. براو براژنەکەی باوەژن بوون و بارامی کوڕیشیان لەگەڵ خۆدا هێنا بوو. لە ڕێیەکی دوورەوە هاتبوون، لە شارێکی ترەوە. دانیشتن و سەری قسان کرایەوە. باوەژن کەلسوومی گل دایەوە، شیویان بۆ لێبنێ.

یەشار جاریٚ دەچووە ئاشخانەکە بۆ لای دایکی و جاریٚ دەهاتە بەر پەنجەرەکە. چ قسەیەکی نەدەکرد، هەڵبەتە زۆری قسان پێبوو، بەڵام نەدەهاتنە گوتن. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد هەقیان بە سەرییەوە نەبیٚو بۆ خۆی بچێتە کن یوڵدز

براژن بەدەم قسەو پێکەنیەوە بە باوەژنی گوت:- هاتووین بە شوێن تۆو پەریدا، بەیانی سەفەر دەکەین.

باوەژن گوتی:- دەزگیرانەکەی پەری گەڕاوەتەوە!

براژن گوتی:- بەڵیٚ سبەینیٚ شایی دەست پێدەکا.

ئەوجا تەماشایەکی پەری کردو بە رویا پێکەنی.

*- ئایا دەشێت کەسێك بزانێت

*- باوەژن چ بەڵایەکی بەسەر یوڵدزا هێناوە؟

پاش شیو خواردن باوەژن هەستاو کەوتە کۆکردنەوەی جلوبەرگو تەدارەکی سەفەر، کە دەرگای گەنجینەکە کرایەوە، یەشار چاوی بە یوڵدز کەوت. بە پشتا خەوتبوو و پەڕۆیەکی لە دەمو کەپووی ئالاندبوو.

دایکی یەشار گوتی:- ئەو کچۆڵەیە چییەتی؟ خۆ شیویشی نەخوارد.

باوەژن گوتی:- نەخۆشە، هیچ نەخوا باشترە.

کەلسووم:- چییەتی؟

باوەژن گوتی:- دەمی خراپ بووە.

کەلسووم و باوەژن لە گەنجینەکەدا قسانیان دەکرد. براکەی باوەژن لای دەرکی گەنجینەکەوە دانیشتبوو. گوێی لە قسەکانیان بوو. بە ئاستەم دەرکەکەی کردەوەو یوڵدزی بینی. ئەوجا روویکردە بابەو گوتی: ئەوە ئەو کچۆڵەیە هێشتا لێرەیە؟ وام دەزانی...

بابە قسەکەی بڕی و گوتی:- بەڵیٚ هێشتا لای خۆمانە.

براو براژنەکەی باوەژن تەماشایەکی یەکدیان کردو هیچیان نەوت.

*- کیٚ لە تاریکی دەترسێت؟

*- شەوانی سەربان چۆنە؟

شەو درەنگ بوو. کەلسووم لە ئاشخانەکەدا خەریکی ئامان شتن بوو. ئەوانی دی سەرگەرمی قسان بوون. بارام بە دایکی گوت:- دایە میزم دیٚ.

دایکی گوتی:- دەبڕۆ بمیزە ڕۆڵە گیان.

بارام گوت:- ئاخر دەترسم.

باوەژن رووی کردە یەشارو گوتی:- کوڕك لەگەڵ بارامی بڕۆ...

یەشاریش دەمیٚ بوو میزی دەهات، بەڵام تەمەڵی دایگرتبوو ونەدەچوو بمیزیٚ. دوو بە دوو هەستانو چوونە دەریٚ. بە دەم میزکردنەوە وەستابوون.

بارام گوتی:– تۆش دەچییە قوتابخانە؟ من پۆلی چوارەم.

یەشار گوتی:– بەڵێ. منیش.

بێدەنگ بوون. یەشار حەوسەڵەی قسەکردنی نەبوو، ئەوجا بارام گوتی:– من یەکەمی پۆلەکەمانم، باوکم وەعدی داومەتێ پاسکێلم بۆ بکڕێ، ئەدی تۆ؟

یەشار گوتی:– من. نەء ..

کاتێ ویستیان بگەڕێنەوە بارام چاوی بە قاڵدرمەکە کەوت و پرسی:– ئەم قاڵدرمەیە بۆ چییە؟

یەشار گوتی:– دەچینە سەربان، حەزدەکەی بچینە سەربان و تەمەشای دنیا بکەین؟

بارام گوتی:– ئاخر من لە تاریکی دەترسم با بچینە ژوورێ.

یەشار گوتی:– من لە پێشا سەر دەکەوم و پاشان تۆ وەرە.

بارام دوو دڵ بوو گوتی:– تۆ لە تاریکی ناترسیت؟

یەشار گوتی:– نەء ، من شەوانە بە تەنێ لەسەربان دەنووم و هیچ ناشترسم.

بارام گوتی:– شەوێ سەربان چۆنە؟

یەشار گوتی:– گەر بێیتە سەربان بە خۆت دەیبینی.

یەشار ئەمەی گوت و بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوت. بارام هەندێك بە دوو دڵی وەستاو ئەوجا هێواش هێواش سەرکەوت. یەشار دەستی گرت و بردیە ناوەڕاستی سەربانەکە، ئاسمان یەکپارچە ئەستێرە بوو، دەتگوت بەبار ئەستێرەی پێوەرکراوە، ملیۆنان ملیۆن ئەستێرە.

یەشار گوتی:– دەبینی؟

ئەستێرەیەك لە ئاستی ئەوانەوە ڕاخوشی. یەکێکی دی لە دوور هەڵپڕیوا. چەند سەگێك بە حەپە حەپ بێدەنگی شەویان هاڕوژاند و دوورکەوتنەوە. پەپوولەیەك بەرەو روناکی گڵۆپی کۆڵانەکە دەفڕی. شەمشەمە گوێرەیەك پڕی دایێ، گرتی و لە تاریکیەکەدا ون بوو.

ئەستێرەیەکی دی ڕاخوشی و هێڵێکی روناکی سپیواژی بە دووی خۆیا ڕاکێشا، بۆنی گەوڕو تەویلەی ماڵانی دەوروبەر دەهات.

یەشار "رێگای مەکە"ی نیشان داو گوتی: ئەم رووناکییانەی ئاستی خۆمان دەبینی؟

بارام گوتی:– ئا.

یەشار گوتی:– بەمە دەڵێن "رێگای مەکە".

بارام گوتی:– یانی حاجییان لەم رێگایەوە دەچنە مەکە؟

یەشار پێکەنی و گوتی:– نە بابە، خەڵکی نەخوێندەوار پێی دەڵێن رێگای مەکە. ئەمانە ئەستێرەی وردو درشتن کە بە تەنیشت یەکەوەن... وەنەبێ پێکەوە نووسابن. بەڵکو زۆریش لێکدی دوورن، بەڵام لە دوور ڕا بەم جۆرە دەنوێنن.

بارام گوتی:– ئەدی بۆ خەڵکی پێی دەڵێن رێی مەکە؟

یەشار گوتی:– مەعلوومە ئیتر، خەڵکانی قەدیمە کە لە زانست و زانیاری بێ خەبەر بوون، ئیدی هەرچیەکیان نەزانی بێ ئەفسانەیەکیان بۆ هەڵبەستووە، ئەمەش یەکێکە لەو ئەفسانانە.

بارام بە دوو دڵییەوە گوتی:– تۆ ئەم قسانە لە گیرفانی خۆتەوە دەرنایەنی؟

یەشار گوتی:– گیرفانی خۆمی چی! لە ماموستاکەمانەوە فێر بووم. چما ماموستاکەی ئێوە ئەم قسانەتان بۆ ناکا ؟

بارام گوتی:– نەء ، ئێمە تەنیا دەرسەکانمان دەخوێنین.

یەشار گوتی:– ئەدی ئەم قسانە دەرس نین؟

ئەستێرەیەکی گەش و پرشنگدار لە سوچێکی ئاسمانەوە بەرز بۆوەو بە خێرایی دەڕۆیی.

بارام بێ وەی وەڵامی یەشار بداتەوە گوتی:– تەماشای ئەو ئەستێرەیە بکە، ئەو کێوە دەچێ؟

یەشار گوتی:– ئەوە ئەستێرە نیە، تەلیستارە، لە زەوییەوە هەڵیانداوە بۆ ئاسمان.

بارام گوتی:– بۆ کوێ دەچێ؟

یەشار گوتی:– بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە.

بارام گوتی:– تۆ هەڵم دەخەڵەتێنی، ئەم قسانە لە خۆتەوە دەکەی.

یەشار گوتی:– لە خۆوە دەیکەم؟ ماموستاکەمان پێی گوتووم، تۆش دەتوانی لە ماموستاکەتان بپرسی؟

بارام گوتی:– ماموستاکەی ئێمە لەم قسانە ناکا.

یەشار گوتی:– دیارە نایزانێ.

بارام گوتی:– نەء . ماموستاکەمان هەموو شتێك دەزانێ، خۆی دەڵێ. تۆ درۆ دەکەی.

بازاڕی قسەو باسیان لە گەرم بوونا بوو کە باوەژن لە نێو حەوشەوە گازی کرد:– بارام، ئەوە لە کوێی؟

منداڵەکان کەمێك ڕاچڵەکین. بارام تاریکە شەوەکەی بیرکەوتەوەو گریان لە ئەوکی گیرا. یەشار دەستی گرت و گوتی:– مەترسە کوڕە من لەگەڵتم.

باوەژن دەنگی یەشاری ناسییەوەو بۆڵاندی:– ئەوە بۆ ئەو کوڕەت بردووەتە سەربان هەی گوێرەکە؟

خێرا سەرکەوتە سەربان، بارامی لە دەستی یەشار سەندو گوتی:– هەی دێ لەبەر چاوم ،خوێڕی!...

یەشار گوتی:– قەحپە...

باوەژن دەهری بوو، زللەیەکی لە بنا گوێی یەشار قایم کردو دەستی بارامی گرت و چوونە خوارەوە. یەشار کەمێك وەستا. قوڕگی پڕ بوو لە گریان و ئان ئاخری خۆی پێنەگیراو دەستی بە گریانێ کرد. چووە سەربانەکەی خۆیان، بە دەما خۆی دا بەسەر جێگاکەیدا.

*– پشیلە ڕەش دەستی خۆی وەشاند.

یەشار بەیانی زوو لە دەنگە دەنگی باوەژن و میوانەکان وەخەبەر هات. هەتاو دابووی لەسەربان و گەرمایەکی خۆشی هەبوو. دایکی جانتاکەی باوەژنی دابوو بە شانیاو لە دوای هەموویانەوە لە ناو دەرگای حەوشە دەرچوو. هەردوو ماڵەکە چۆڵ بوون. یەشار باوێشکی داو

هەستا. بە قاڵدرمەکانا دابەزیو چوو بۆ کن یولْدز. یولْدز پەڕۆکەی لە دەمو کەپووی کردبۆوەو کونو کەلەبەری گەنجینەکە دەگەڕا.

یەشار گازی کرد:- ئەوە لە چ دەگەڕێی یولْدز؟

یولْدز سەری هەڵبڕیو گوتی:- ئەوە تۆی یەشار؟

یەشار گوتی:- ئەریٚ، ئەدی بووکەخان؟

یولْدز گوتی:- نازانم، هەرچی دەگەڕێم دیار نییە.

یولْدز بە کورتی بەسەرهاتەکەی دوێنێی بۆ یەشار گێڕایەوەو یەشاریش نەقڵی لاقە چێڵو مێروولەکانی بۆ گێڕایەوە. ئەوسا دوو بە دوو کەوتنە گەڕان بە دووی بووکەخاندا! نەیان دۆزییەوە. یەشار گوتی:- ناکا باوەڕن لێمانی دزی بیٚ؟

یولْدز گوتی:- جا چمان پێدەکریٚ؟

یەشار گوتی:- مێروولەکان دەتوانن بیدۆزنەوە. ئەگەر لە بنی عەردیشا بیٚ دەتوانن کونی بکەنو سۆراخێکی بووکەخان وەدەست بێنن.

یولْدز گوتی:- کەواتە هەڕو، لاقە چێڵەکە بێنە.

یەشار بەپەلە ڕۆیی، پشیلەیەکی ڕەشی لە سەربان دی کە شتێکی بە دەمەوە بوو و بەپەلە دەڕۆیی. یەشار هاتە خواریٚو چوو سەری کولانە سەگەکە بدا، کە لاقە چێڵەکەی لەویٚ شاردبووە. سەیری کرد لاقەکە نەمابوو. بەپەلە سەرکەوتە سەربان، بەڵام پشیلەکە لەویٚ نەمابوو، دیسان هاتە خواریٚ، هەمدیس سەرکەوتەوە.

بەمجۆرە بە خۆڕایی دەهاتو دەچوو و نەیدەزانی چی بکا. ئەنجام لە دەنگی دایکی وەئاگا هات، دایکی لە قەراغ باخچەکە دانیشتبوو و دەمو چاوی یولْدزی دەشت. یەشاریش چووە کنیان. دایکی گوتی:- یەشار ئەگەر پەنجەت نایەشیت، بچیتەوە سەر ئیشەکەت باشە.

یەشار گوتی:- دایکە تۆ ناچیتە جل شۆردن؟

کەلسوم گوتی:- بابی یولْدز دەڵیٚ لە ماڵی وان بمو ئاگاداری یولْدز بمو نیوەڕۆژەش بۆ وی دروست بکەم.

یەشار گوتی:- ئەوڕۆ بابم دێتەوە؟

دایکی گوتی:- ئەگەر هاتەوە ئاگادارت دەکەمەوە.

***- بووکە شووشەیەکی هاو باڵای یولْدز**

***- گۆرانی منداڵانی قالی چن**

دوای ٢-٣ ڕۆژان بابی یەشار هاتەوە. یەکجار نەخۆش بوو. ڕۆژ تا ئێواری لە جێدا دەکەوتو دەیناڵاند. کەلسوومو یەشار دکتۆریان هێنایە سەریو دەرمانیان بۆ کڕی. دایکی یەشار نەیدەتوانی بچێتە جل شۆری. لە ماڵ دەمایەوەو وریایی مێردەکەیو یولْدزیشی دەکرد. هەندیٚ جاریش لفکەی دەچنی. ژنانی دراوسیٚ دەهاتنو لێیان دەکڕی. یا بە خۆی دەیبردنە گەرماوەکانو دەیفرۆشتن.

یەشار کاری قاڵی چنینی دەکرد. زۆربەی مەسرەفی ماڵ بە ملی ئەوەدا کەوتبوو. کاتی دەست بە تاڵیشی لەگەڵ یوڵدزدا دەقەتاند. چەند رۆژێك داخیان لە بووکەخان خوارد و هیچیان بە هیچ نەکرد. ئەنجام بڕیاریان دا بووکۆکەیەکی دی دروست بکەن، زوو بە زوو کەوتنە کارکردن.

یوڵدز دەرزی و دروومان و بڕین لە دایکی یەشارەوە فێر بوو. پارچە پەڕۆیان لەملاو لەولا کۆکردەوە و کەوتنە کارکردن. یەشار تیسکە خوری و ئەم شتانەی لە کارخانە دێنانەوە تا بیئاخنە دەست و پێی بووکەکەوە. دەیانویست بووکێك دروست بکەن بە قەد بالای یوڵدز بێ. بڕیاریان دا یەشار نەخشی دەموچاوی بکێشێت.

یەك یەك ئەندامی بووکەکەیان دروست دەکرد و لەلایەکەوە دایان دەنا تا دوایی هەموو پارچەکانی لێك بدروون. کۆنە تۆپێکی لاستیکی گەورەیان کرد بەسەری. تۆپەکەیان بە پارچەیەکی سپی داپۆشی. یەشار رۆژێکی هەینی لە بەیانییەوە تا عەسر دانیشت و چاو و دەم و شوێنەکانی دیکەی نەخشاند.

پاش ٢٠ رۆژ بووکەکە تەواو بوو. رێك بە قەد یوڵدز بوو، بەڵام مرومۆن، چارەی بەیەکا دا بوو و بە پارەش پێنەدەکەنی، منداڵەکان دوو بە دوو دانیشتن و بیریان کردەوە کە ئاخۆ بووکەکەیان چیەتی و بۆ رووی گرژ کردووە و پێ ناکەنێ. هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە جلوبەرگی لێدەوێن.

دابینکردنی جلوبەرگ بۆ بووکێکی وا گەورە کارێکی ئاسان نەبوو. پارچەی زۆری دەویست. ئەمە جگە لەوەی بڕین و دورینی جلوبەرگەکەش خۆی لە خۆیدا کارێکی قورس بوو.( ٢-٣ ) رۆژ بەم حاڵەوە تێپەڕی و منداڵەکان ئەقڵیان بە هیچ کوێ ڕانەگەیشت.

یەشار سەری هەموو هەفتەیەك رۆژانەکەی دەهێنایەوە و دەیدا بە دایکی لە هەر "١٠" شاهییەك قڕانێکی بۆ خۆی هەڵدەگرت. رۆژێك بە یوڵدزی گوت:- من پارەکەم کۆ دەکەمەوە و جلوبەرگ بۆ بووکەکەمان دەکڕم. بەڵام وەختێ حسابیان کرد سەیریان کرد بە چەند مانگ ناتوانن جلوبەرگ بۆ ئەو بووکە گەورەیە بکڕن، چەند رۆژێکیش بەم حاڵەوە تێپەڕی. بووکەکە هەروا بە گرژومۆنی بە پێوە ڕاوەستابوو. منداڵەکان چەندیان دەدواند وەڵامی نەدەدایەوە.

رۆژێکیان یەشار لە پشت داری قالییەوە دانیشتبوو و سەرگەرمی کەلگیت کوتان بوو لە پڕ ئەوەی بە بیرداهات کە بووکەکەیان هاوبالای یوڵدزە، کەواتە دەکرێ جلی یوڵدزی لەبەر بکەن. ئەوەندە دڵی بەم بیرە خۆش بوو لە خۆشیانا کەوتە گۆرانی گوتن، شیعری قالی چنانی دەخوێندەوە. ئەوجا کەلگیتەکەی دانا و چەقۆکەی هەڵگرت. لەگەڵ بەکارهێنانی چەقۆکەدا گۆرانی دەچڕی و خۆشحاڵی دەکرد. دوای تۆزێك منداڵەکانی دیش لەگەڵیا کەوتنە گۆرانی چڕین و ئاسمانی تاریك و تۆزاوی کارخانەکە پڕبوو لە ئاوازو گۆرانی منداڵانی قالی چن.

چووم نەبات بکڕم

بیخەمە پیالەوە

دە شاهیشم پێ نەبوو

کەچی کەوتمە تەشقەڵە و خۆ نواندن

* * *

کابرای دوکاندار ئیزرەمێکی هەڵگرت
دای وەشاندو سەرم شکا
خوێنی سەرم نەدەوەستا
ئیدی براکەم گاز کرد

*- هاتنەوەی باوەژن

یەشار ، عەسر گەڕایەوە بۆ ماڵ. دایکی گوتی باوەژن‌و براکەی هاتوونەتەوە. یەشار رەنگی تێك چوو. بۆ ئەوەی دایکی هەستی پێنەکا بەغار خۆی گەیاندە کۆڵان، ئەو شەوە نەیتوانی یوڵدز بدینێ، شەوێ لەسەربان نووست. دایکی لە ژوورەوەو بە دیار مێردە نەخۆشەکەیەوە دەخەوت. یەشار خەبەری بووەوەو سەیری کرد شتێك لە حەوشەی دراوسێکەیانا دەسووتێ‌و دووکەڵ دەکا. باوەژنیش بە قاپێ نەوتەوە بە دیار ئاگرەکەوە وەستاوە. یەشار ماوەیەك بە نیگەرانی سەیری کردو پاشان خەوتەوە. بەیانیش هەستاو چوو بۆ سەر ئیش.

*- ئای بووکە گەورە!

*- بۆ سوتاندیانیت‌و، هیچ نەیانگوت ئاخر ئەو منداڵانە

*- بە دنیایەك ئاوات‌و خۆزگەوە دروستیان کردبووی؟

با تۆزێ بگەڕێینە دواوەو بزانین وەختێ باوەژن گەڕایەوە چی بەسەر یوڵدز و بووکە گەورەکەدا هات.

یوڵدز هەر کاتێ کاری بە بووکەکە نەبا دەیبردە گەنجینەکەو لە پشت نوێنەکانەوە دەیشاردەوە. وەختێ باوەژن هاتەوە هیچی نەبینی. تەنیا ئەوەندەی بینی یوڵدز لە حەوشێ دا دانیشتووەو پەنجەکانی دەژمێرێ‌و کەلسووم حەوشە گسك دەدا. بابە لە ژوورەوە پانتۆڵەکەی ئوتو دەکرد. براکەی باوەژن هەر ئەو عەسرە رۆیشتەوە، بەڵام بەر لەوەی بڕوا هەندێ قسەی دەگەڵ بابەدا کرد. یوڵدز هەستی کرد کە باسی ئەو دەکەن. پێدەچوو باوەژن لەلای کەسووکاری گلەیی‌و گازاندەی لە دەستی یوڵدز کردبێ.

شەوێ، کاتی نووستن شتێکی ناخۆش قەوما، باوەژن کاتێ نوێنەکانی خۆی دادەگرێ، دەبینێ شتێکی زلەو ناشیرین لە پشت نوێنەکانەوە کەوتووە، ئیدی دەمودەست بوو بە هەراو بەزم‌و دەرکەوت کە ئەو شتە زل‌و ناشیرینە بووکی یوڵدزەو بەخۆی دروستی کردووە، باوەژن لە پەنجەرەکەوە بووکەکەی تووڕ دایە دەرێ‌و کەوتە سەرکۆنەکردنی یوڵدز. جوانە مەرگ بیت بۆ خۆت‌و بووك دروست کردنت! پێت نیشان دەدەم کە چۆن چۆنی رقەبەرایەتیم دەکەی. بە هەزار حاڵ خۆم لە بووکەکەی دیت رزگار کرد هەنووکە دەتەوێ ڕێ بۆ (لەمە چێتر) خۆش بکەی، ها؟

بابە دۆش دامابوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم بووکە زلە لە کوێوە هاتووە، باوەڕی نەدەهات یوڵدز دروستی کردبێ، گوتی:- کیژێ کەی ئەمەت دروست کرد، من ئاگام لێ نەبوو؟

یوڵدز زاری هەڵنەدەهات. باوەژن گوتی: -دوعای خێر بۆ من بکە کە ناکرێ بەم بارەوە خۆم تووڕە بکەم، ئەگینا دارکارییەکی وام دەکردیت بە خۆت ئێرە بەجێ بێڵی و جارێکی دی رووی تێ نەکەیتەوە.

بابە بە ژنەکەی گوت:- ئائا تۆ نابێ خۆت سەغڵەت بکەی. بۆ منداڵەکەی ناو سکت خراپە.

باوەژن ئاماژەی بۆ مێردەکەی کردو گوتی:- من لەبەر قسەی ئەمە تۆم لێرە ڕاگرتووە. خۆ باب و براکەم بۆ وەیان نەداومەتێ کارەکەری تۆ بکەم؟

بابە گوتی:- بەسە ئافرەت منداڵەو نازانێ.

باوەژن گوتی:- منداڵە، منداڵ نییە کەیفی خۆیەتی، من بە هەزار شەڕ شەق لەگەڵ خۆیدا هەڵدەکەم کەچی قل قل باجی دادەنیشێ و لەرکی من بووکە شووشان دروست دەکا.

یوڵدز لە پڕ دەستی بە گریان کردو بە دەم هەنسک هەڵدانەوە گوتی:- من.. من بووکە قسەوێژەکەم. م.. م دەوێتەوە!

باوەژن هەرکە گوێی لە نێوی بووکە قسە وێژەکە بوو. تووڕە بوو، چنگی نایە قژی یوڵدزو بای دا: نەخەڵەتابی جارێکی دی ناوی ئەو چەپەڵەم لا بێنێ، حاڵی بووی؟ من نامەوێ منداڵەکەم لە سکما شتێکی لێ بێ، ئەم جۆرە شتانە شوومن، رێگە بۆ (لەمە چێتر) خۆش دەکەن، حاڵی بووی یا بە مشت و تێلا بیخەمە مێشکتەوە؟

یوڵدز لەپڕ خۆی لە دەستی باوەژن دەرباز کرد، رای کرد بۆ نێو حەوشە تا بووکە زلەکەی لە نێو دووکەڵ و ئاگرا دەربێنێتەوە.

باوەژن بواری نەدا لە ئاستانەی دەرگاکە ڕەت بێ.

دوای چەند دەقیقەیەك یوڵدز خرایە گەنجینەکەوە ،دەرگای لەسەر داخرا! دڵی پڕ بوو، فرمێسك وەکو تاوە بارانی بوهار لە چاوانی داباری. باوەژنیش بە قاپێ نەوتەوە، بە دیار بووکەکەوە وەستابووو سەیری چەڕە دووکەڵی دەکرد. بابە هێشتا لە بیری ئەوەدا بوو بزانێ ئەم بووکە زلە لە کوێوە هاتبووە ئەم ماڵە.

*- تەنیایی و خەفەت

*- بە ئومێدی شەوی چلە

رۆژان خێرا خێرا تێدەپەڕین. بابی یەشار سەر لەبەری هاوینەکە نەخۆش بوو. کارو پیشەی دەرمان خواردن بوو.، یەشارو یوڵدز زۆر بە کەمی یەکدیان دەبینی. هەرکەسەو لەلای خۆیەوە داخی بۆ بووکەکان دەخوارد. بەتایبەتی بۆ بووکە قسە وێژەکەی یوڵدز کە بۆی نەبوو لەبەردەم باوەژنا نێوی بووك بێنێ، چما دەکرا بیر لە بووکە قسەوێژەکەی نەکاتەوە؟ چما دەکرا ئەو شەوە خۆشە لەبیر بکا، شەوی لێڕەکە،، لێڕەواری پڕ لە رازو نهێنی؟ قەت دەکرا بیر لە شەوی چلە نەکاتەوە؟ شەوی چلە هەموو بووکە شووشەکان لەوێدا کۆدەبنەوەو ئاهەنگ دەگێڕن. بەڵام ئیدی یوڵدزو یەشار بووکە شووشەیان نەبوو تا بۆ لێڕەواریان بەرێ.

ئاه، ئەی بووکەڵەی قسەوێژ. تۆ بەو تەمەنە کورتەوە هێند چوویتە دڵی منداڵەکانەوە کە تا ماون لە بیرت نەکەن. ڕۆژو هەفتەو مانگ بورین. یوڵدز هەر بە ئومێدی شەوی چلە دەژیا و دەقە بە دەقە حسابی دەکرد. دڵنیا بوو بووکەڵەی قسەوێژ تا ئەو شەوە هەر چۆنێ بێ خۆی دەگەیەنێتە ئەو. باوەژن سکی بەرز بوو بۆوە، زۆر بە منداڵەکەی ناو سکییەوە دەنازی. لەسەر بچوکترین شت یوڵدزی سەرکۆنە دەکرد.

*- هیوای بێهود:

* - شادی لە دەست چوو

ڕۆژێك بابە کارەباچی هێنا، کارەبایان بۆماڵەوە ڕاکێشا، بابە رادیۆیەکیشی کڕی. لەو رۆژە بە دواوە گڵۆپ لە ماڵەوە دەسووتا و دەنگی رادیۆ هەمووشوێنێکی پڕدەکرد.

شەوی چلەش هیوایەکی بێهودەبوو، بووکە خان چ سەرو سۆراخێکی نەما. یوڵدز پاش شەوی چلە بە تەواوی. ئومێدبڕ بوو، هەموو شادیو خۆشیو قسە قوتەکانی فەرامۆش کرد، بوو بە منداڵێکی ماتو مەلوولو کزو داماو، گۆشەگیرو کەمدوو.

یەشار دەچووە قوتابخانەی خۆی. منداڵەکان زۆر بە کەمی یەکدیان دەبینی. باوەژن نەیدەهێشت یەشار هاتووچۆیان بکات.

دەیگوت:- ئەم هەتیوە خوێڕیە خووی کچەکە شەڕەدکا.

*- چیرۆکەکەمان تەواو نابێ

*- یوڵدزو قەلان

دیارە چاوەنۆڕن تا بزانن ئاکامی بووکەخانو منداڵەکان گەییە کوێ.. ئەگەر مەسەلەی (قەلەکان) نەهاتبا گۆڕێ لەوەبوو یوڵدز لە داخا دیق بکا و بمرێ.

بەڵام پەیدابوونی (دایە قەلێ) و دۆستایەتی منداڵەکان لەگەڵ (قەلەکان) دا سەر لەبەری کارەکەی گۆڕی. یوڵدزو یەشار دووبارە کەوتنە سەر شەوقو زەوق، هێند بە دڵو گیان کەوتنە هەوڵدان تا توانیان لە ماوەیەکی کەمدا ڕێگای (شاری قەلان) پەیدا بکەنو سەری بدەن.

وەکو خوێندوتانەوە و دەزانن مەسەلەی (قەلان) بۆ خۆی چیرۆکێکی سەربەخۆیەو لە کتێبی (یوڵدزو قەلان)دا نووسراوە.

چیرۆکی (بووکەڵەی قسەوێژ) لێرەدا تەواو بوو.

*- ئاگرگەردان: تۆڕێکی تەلە، خەڵوزی تێدەکەنو بایدەدەن تا زوو ئاگر بگرێو بگەشێتەوە.

*- شاهی: چەشنە پارەیەکی ئێرانییە.

تێبینی: ئەم چیرۆکانە لە ساڵی ١٩٨٢ دا لە چیا و بە دەم ژیانی پێشمەرگایەتییەوە وەرگێڕدراون..

## گفتوگۆیەك لەگەڵ غولام حسین فەرنود

**سازدانی: علی ئەشرەف دەرویشیان**

**و: حەمە کەریم عارف**

**ع.د: جەنابی فەرنود ئێوە کە ساڵانێك دەگەڵ نەمر سەمەدی بیهرەنگی دا دۆست و هاوکار بوون، یەکەمین بەرهەمی سەمەد چۆن چاپ بوو؟**

غ.ف: کە یەکەمین کتێبی چیرۆکی، نەمر سەمەدی بیهرەنگی((یولدز و بوکەڵەی قسەوێژ)) ئامادەی چاپ بوو، چ بڵاوکەرەوەیەکمان بۆ پەیدا نەکرا. کاك زاخری بەرێوەبەری دەزگای بڵاوکردنەوەی ئیبن سینا لە تەورێز، دەیگوت چاپی ئەم کتێبە، ئەویش بۆ منداڵان، فرۆشێکی ئەوتۆی نابێ و پێشوازی لێناکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا دانیشتین و بیرمانکردەوە کە ئەگەر هەزار دانەی لێ چاپبکەین، نەفرۆشرێ، لە رووی داراییەوە زەرەرێکی زۆر ناکەین، چونکە لە هەزار تمەنێك پتری تێنەدەچوو. لێ چاپی یەکەم لە زەرفی چەند هەفتەیەکدا فرۆشرا و چاپی دووەم گەیيە سێ هەزار دانە. هاتم و بە سەمەدم گوت دەبێ دەعوەتێکی فراڤینم بکەی. گوتی بۆچی؟ گوتم هەزار دانە فرۆشراوەو زاخری دەڵێت دەبێ سێ هەزار دانەی دیکە چاپبکەین. سەمەد بە تورکی گوتی: ((پێم رادەبوێری!)) باوەری نەدەکرد. ئەوجا گوتم با بەرگەکەی باشتر بکەین. یانی زیاتر کار لە بەرگەکەی بکەین. سەمەد دانیشت و هەندێ دەستکاری بەرگەکەی کرد وهەمان ئەو بەرگە جوانە دەرچووکە لە چاپی دووەمدا هەیە. واتە سوودی لە نەخش و نیگاری مافوران وەرگرت. نەخشەکانی لەپاڵ یەکدا ریزکردن و شتێکی جوانی لێدەرچوو. نەخشی بەرگەکە کاری سەمەد خۆی بوو. بەم پێیە یەکەمین کتێبی ئەو، چیرۆکی((یولدز و بوکەڵەی قسەوێژ)) بوو. پاش ئەوە کەوتە سەر رێ و هەڵبەتە ئەمە بۆ ئەو دەستپێکێکی باش بوو، بۆ ئێمەش چاوەنۆر نەکراو بوو. دەبێ ئەوە بڵێم کە هەر لە سەرەتاوە پەییم بە بایەخی کارەکە بردبوو و دەمزانی کە پتر لە چەند هەزار دانەیەکی لێ دەفرۆشرێت و بەرنامەمان بۆی دانا. کتێبەکە لە لایەن گەورانەوە پێشوازییەکی باشی لێنەکرا. بەلام لە لایەن منداڵانەوە باوەرم نەدەکرد بەو جۆرە بە تاسەوە بقۆزرێتەوە و پەسند بکرێت. زەمینە لەبار بوو، منداڵان تینووی خوێندن و فێربوون بوون و ئێمە بەمەمان نەدەزانی و لێی بێ خەبەر بووین، لێ بیهرەنگی هەستی بەو کەش وفەزایە کردبوو. پەی بە حەز و خواستی منداڵان بردبوو.

بە هەرحاڵ چاپی دووەم لە زەرفی بیست رۆژدا لە تاران فرۆشرا. کە کتێبی دووەمی نووسی، وەشانکاران رکابەرییان لەسەر چاپکردنی دەکرد. کتێبی دووەم ((یولدز و قەلان)) بوو. سەمەد روحی زەمانی خۆی دەرك کردبوو. دروست وەك شاعیرێك یان نیگارکێشێك کە شیعر دەڵێت و تابلۆ دەکێشێت و بە خۆیشی نازانێ خەریکە بەرهەمێك دەخوڵقێنێ و پیاو ئاگای لێ نییە کە لە چ قۆناغگەلێك پەریوەتەوە و چ مەسەلەگەلێك کاریان تێکردووە. هەندێ جار ئەم هونەرمەندە

دەبێتــە گــەپجارِ و هەنــدێ جــاریش هــەموو لایــەك دوچــاری حــەیرمان دەكــات. ژمارەیــەك بــە نەباوەرییــەوە دەیانروانییــە كارەكــانی بیهرەنگــی كــە گــەورەترەكان چ گوڵێكیــان لەســەری خــەڵكی داوە كە هەنوكە تۆ دەتەوێ بۆ منداڵان كار بكەی. واتــە گــەورەكان خــەنی بوون! نۆرەی منداڵانــە.
مــن تــا ئێســتا زۆرم بــیر لــەم مەســەلەیە كردۆتــەوە و نــەمتوانیوە كەشــفی بكــەم كــە بیهرەنگــی ئــەم كەرەستە خاوانــەی، یــان هــەر نــاوێكی تــری شایستە بێ لێ بنــەی، واتــە ئــەم شتە نایابانــەی لــە كوێـوە وەرگرتـووە و هـەڵێنجاوە. بێ دوو دڵـی دەتـوانم بڵـێم كـە بـۆ ئـەو پەیوەنـدی نزیـك لەگـەڵ منداڵاندا ئەسڵی مەسەلەكەیە: بـەڵام چۆن و لـە چ ڕێگەیەكەوە توانی ئەوەندە لـە قوڵایی روح و خواســتەكانی منــداڵان نزیــك ببێتــەوە؟ زۆر كــەس لــە گونــدان بوونــە لــێ ئــەم مەســەلە و وردەكارییانەیان نەدیتوەو ئێستاش نایبینن. لەم میانەدا خۆشەویستی پاك و بێگەردی ئەو بۆ منداڵان مەسەلەیەكی گرنگە. ئەم خۆشەویستییە بوو بـووە باعیسـی ئـەوەی كـە زۆر مەسـەلەێن نادیار و پەنهان كەشف بكات و ببینێت.

### ع.د: بۆچی هەندێ لە نووسینەكانی بە ناوی خوازراوەوە بڵاو دەكردەوە؟

غ.ف: لـەو دەورو زەمانـەدا هـەل و مـەرجێن ئازەربایجـان بـە جـۆرێ بـوو كـە هـەموو ئێمـە لـەوە دەترساین ناو دەربكەین و بناسرێین و نموودمان هەبێ. نەمان دەویست بكەوینە بەرچاو. وامان بـیر دەكـردەوە كەوتنـە بەرچاو دەكاتـە ئـەوەی بـبین بـە نیشـانە. كـە بـووی بـە نیشـانە لـە هـەموو لایەكەوە گوللـەت بـۆ دێت. بۆیـە نـەمان دەویست ناوبـانگ دەربكـەین. نـاو دەركردن پەیوەنـدیێن جیاواز دروست دەكات كە هەڵبەتە بە خراپەش سوودی لێوەردەگیرێت. لە پاش مەشروتیەتەوە رۆشـنبیران هـەوڵیان دەدا بـە نەناسـراوی بمێننـەوە. بـە تایبـەتی سـەمەدی بیهرەنگـی لـەم رووەوە هانیدەداین و بـە خۆیشـی دەیویست نووسینەكانی بـە نـاوی نهێنییـەوە بڵاوبكاتـەوە. بـۆ نموونـە داریوش نوواب مەراغەیی یـان چەنگیز مـەراتی و... سـەمەد دەیویست ئـەوەش بڵـێ كـە ئەمـە یـەك كـەس نییـە كـە ئـەم شـتانە دەنووسـێت بـەڵكو ژمـارەی ئـەو كەسـانە زۆرە و یـەك و دووان نییـە. مەبەستی ئەمـە بـوو كـە نەناسـرێ. مـن ئـەو سـەردەمە بابـەتی سینەماییم لـە ((ئادینـە)) بـە نـاوی خوازراوی عەلی سیاپۆس_ەوە بڵاو دەكردەوە. هەندێ كەس وای بۆ دەچوون كە عەلی سیاپۆس سـەمەدە. مـن زنجـیرە ووتـارێكم بـە نـاوی ((درون و بیرون آدمهـا)) نـاوەوە و دەر ەوەی بنیادەمـان، بـە هـەمان نـاوی خـوازراوەوە بڵاوكـردەوە كـە لەوێـدا سـەرۆكی پـەروەردەم دابـوە بـەر تـەوس و توانجـان. رۆژێـك سـەرۆكی فەرهـەنگ سـەمەدی گرتبـوو كـە كـاك بیهرەنگـی ئـەم شـتانە چییە كـە دەیاننووسـی؟ سەمەدیش هات و پێی گـوتم:(بابە واز بێنە، ئەمە ملی منی گرتـووە و وادەزانێت مـن دەنووسـم.)) سـەمەد نووسـینی جـددی وەكـو ئـەدەبیاتی منداڵانی هـەموو بـە نـاوی (بیهرەنگ) ەوە بڵاودەكردەوە. یـانی دەیویسـت( بیهرەنگـی)ش نـەبێ. ئەمـە ناوێكـە لـە نێـوان نـاوی خـوازراوو نـاوی راسـتەقینە. نـاوێكی سـەربەخۆیە. بـەڵام نوسـینە سـەرپێییەكانی بـە نـاوی خـوازراوەوە بڵاودەكردەوە . دەیگوت ئەمانە دەستی یەكەم نین. كەرەستەو یاداشت گەلێكن كە ئەگەر كاریان لەسـەر بكرێت رەنگـە ببن بـە كـاری ئەسڵی و دەسـتی یـەك. بـۆ نموونـە رەزا بەراهـەنی دەیویست خـۆی لـە هـەموو مەسـەلەیەك هـەڵقورتێنێ و لـە هـەموو مەسـەلەیەك دا هـەبێ، لـێ غـوڵام حسـین

ساعیدی خەریکی کاری خۆی بوو. تەنیا نمایشنامەو چیرۆکی دەنووسی، خۆی لە بابەتێن دی هەڵنەدەقورتاند. غولام حسین ساعیدی نمایشنامەکانیشی بە ناوی( گەوهەر مراد)ەوە بڵاو دەکردەوە.

**ع.د: وا دێتە بەرچاو کە پە یوەندێن عاتیفی و دۆستانە لە نێوان غولام حسین ساعیدی و سەمەدی بیهرەنگی دا هەبووبێ.**

غ.ف: ساعیدی بۆ ئێمە مانان، بۆ هەمووان وەکو باوك بوو. بە تایبەتی بۆ بیهرەنگی. دەبێ بۆ دۆزینەوەی جەوهەر و کەسایەتی راستەقینەی سەمەد، لە کەسایەتی ساعیدی دا بۆی بگەڕێی. ساعیدی هەموو خاڵێکی بەهێزی و لاوازی خۆی بە سەمەدی دەگوت و لەوی نەدەشاردەوە. هەموو شتێکی وەکو سەندوقچەیەکی راز دەخستە بەردەستی سەمەد. سەمەد ئەمانەی وەردەگرت و لە هزرو زەینی خۆیدا رێکی دەخست و ئەگەر پێویستی بکردبوایە بە من یان رەیس نیا یان دۆستانی دیکەی دەگوتن. هەڵبەتە پەیوەندی مورید و شێخ نەبوو، بەلام پەیوەندی باوك و کوڕ بوو. سەرچاوەی راوێژ و تەگبیری ئەو ساعیدی بوو. تەنانەت پەیوەندی سەمەد لەگەڵ سیروس تاهباز دا لە رێگەی ساعیدییەوە دروست بوو. بۆ چاپی کتێبی (ماسییە رەشە چکۆلەکە) ئامۆژگاری ساعیدی، سەمەدی رازی کرد کە کتێبەکەی بە بنکەی پەروەردەی فیکری مندالان بدات. بە راوێژی ساعیدی بوو کە سەمەد گوتارەکانی لە بلاوکراوەێن جیاوازدا چاپ و بلاودەکردەوە.

**ع.د: زەمینەی ئەفراندنی چیرۆکی ((ماسییە رەشە چکۆلەکە)) چۆن پێکهات؟**

غ.ف: سەمەد بیرۆکەی نووسینی((ماسییە رەشە چکۆلەکەی)) لە دەریاوە وەرنەگرتبوو، بەڵکو لە ژیانی مێرولە و مێرولەخۆرانەوە وەری گرتبوو. لەو سەر و بەندەدا کە لە( ئاخیرجان) بوو، زۆرجاران بۆ پیاسە دەچووینە دەشت. هەنگاو بە هەنگاو بەدیار کونی مێرولە خۆرانەوە رۆدەنیشت و بە ووردی سەرنجی دەدا و دەیگوت. بزانە ئەم مێرولە خۆرە سەگبابە چ تەلارێکی تایبەتی بۆ خۆی رۆناوەو چۆن بەو خۆڵە خزەی کە لە زەوییەوە دەری دەدات، جۆرە تەڵەیەك دروست دەکات. دەستی دەگرتم و دەیگوت وەرە دانیشە هەست راگرە بزانە چۆن مێرولەی بەدبەخت دەکەوێتە داوی ئەم زاڵمەوە. سەمەد ماوەیەکی زۆر دادەنیشت نیگای دەکرد. پاشان ئەم بیرۆکەیە گۆڕا بە ماسییە رەشە چکۆلەکە بەم جۆرە بوو، و هیچ پەیوەندییەکی بە لیون لیونی، نووسەری ژاپۆنییەوە نەبوو کە هەندێ کەس گوتویانە سەمەد لە ژێر کاریگەری ئەودا بووە. تەنانەت سەمەد کتێبەکانی ئەویشی نەخوێندبوونەوە. ناوی ئەسڵی کتێبەکەش((ماسییە رەشە چکۆلەی دانا)) بوو کە فەیروز شیروانلو ناوەکەی گۆڕی و کردی بە ماسییە رەشە چکۆلە. چونکە خۆی ئەهلی فەن و سیاسەتکار بوو.

**ع.د: ئایا سەمەدی بیهرەنگی بە راستی لایەنگری بزاڤێن چریکی بوو؟**

غ.ف: ئەو سەردەمە هێشتا مەسەلە چریکییەکان لە گۆڕێ نەبوون. هەندێ رێکخراو هەبوون بەلام ناوی خەباتی چەکداری لە ناو ناوان نەبوو. وا دەزانم دوا رستەی کتێبی((بیست و چوار سەعات

لە نێوان خەو و بێداری))ش ڕێکەوت بوو. هیچ مەبەست و مەرامێکی لە پشتەوە نەبوو. سەمەد ئەم ڕستەیەی تەنیا بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە پڕ بە پێستی حاڵەت و ورەی قارەمانی چیرۆکەکەو ئەو ساتەوەختە بووە کە تێی کەوتبوو. واتە بەرجەستەکردنێکی ورە و هەلو مەرجی تایبەتی ئەو ساتەوەختەی منداڵەکەیە.

**ع.د: ئەدی لە ماسیە ڕەشە چکۆلەکەدا؟**

غ.ف: لە ماسییە ڕەشە چکۆلەکەش دا پەنابردنە بەرچەك هەیە، بەڵام ئەویش پەیوەستە بە ڕەوتی پێشڤەچوونی چیرۆکەکە. ڕێکەوتە. ئاساییە کە ماسییە ڕەشە چکۆلەکە لە کاتی هەستکردن بە بەخەتەردا پەرچەکردارێك بنوێنێ. سەمەد خەباتی ڕۆشنبیری پێ پەسندتر بوو. و لە هەموو ژیانیشیدا هەر ئەو کارەی کرد، بەڵام سەبارەت بە خەباتی چەکدارانەو چریکی، باوەر ناکەم سەمەد تەنانەت خەویشی پێوە بینیبێ. لە لایەکەوە دەستپێکی خەباتی چەکدارانەی چریکی، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵ و نیوێك پاش مەرگی سەمەد. با ئەمەش بڵێم و دووپاتی بکەمەوە کە ئەگەر سەمەد لە ساڵی ١٩٦٨ دا نەخنکابوایە، ئەوا لە ساڵی ١٩٧١ دا خۆی لەبەردەم پەتی قەنارەدا دەبینییەوە. ئەگەرچی سەر بەو کاروانە نەبوو، بەڵام رادەکێشرایە ناوی. ساڵی١٩٧١ش بۆ سەمەد دەشیا کۆتایی ژیان بێ. وەکو خاڵی کۆتایی ماسییە ڕەشە چکۆلەکە. یانی نەیدەتوانی لە هەمبەر ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەدا بێ لایەن بێ.

**ع.د: سەمەد د ەربارەی زەوجین چ بیرێکی دەکردەوە و چ بۆچونێکی هەبوو؟**

غ.ف: هەمیشە بە گاڵتەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەم جۆرە مەسەلانە دەکرد و نەدەکرا بزانرێ کە دەیەوێ بزەوجێ یان نا. چ باسێکی ئەم مەسەلانە نەدەکرا. هەڵبەتە جیاوازی تەمەنی من و سەمەد کەم بوو. لێ وەزع و حاڵەکە جۆرێ بوو کە ئەو بابەتە قسانە نەدەکران. ساعیدی ژنی نەهێنابوو. جەلال ئال ئەحمەد ژنی هێنابوو و خا (سیمین) ی دانیشوەر دەست و پێ گیری ئال ئەحمەد نەبوو. بە خۆی کەسایەتییەکی سەربەخۆ و ئازادی هەبوو، ئەگەر مەسەلەیەك بۆ جەلال بهاتبا پێشێ، دەیتوانی خۆی بڕژێنێ. ئێمە لەو سەروبەندەدا زەوجینمان بە بار و بارگرانی دەزانی. هەڵبەتە لە نێو ئێمەدا ئاغای ڕەحیم ڕەیس نیا جیا بوو. ئەو بە یەکەمین موچەی مامۆستایەتی ژنی هێنابوو. من کەسوکارم دەبرد بە ڕێوەو لە بیری ژنهێنان نەبووم. دەمگوت دەبێ لەگەڵ کەسێکدا زەماوەند بکەم کە ئەگەر تووشی ڕووداوێك بووم بتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێت. وەکو کازمی سەعادەتی کە لەگەڵ خوشکی بەهرۆزی دەهقانی دا، واتە لەگەڵ ڕوح ئەنگیزی دەهقانیدا زەماوەندی کرد و دەمان بینی کە حاڵەتێکی وەکو جەلال و سیمین لە نێوانیاندا هەبوو. یانی ڕوح ئەنگیز سەربەخۆ بوو، مامۆستا بوو دەست و پێ گیر نەبوو، ئاقیبەتیش هەردوکیان لە بەین چوون. کازم بەر لە ساڵی ٥٧=٧٨ لە بەین چوو و ڕوح ئەنگێز پاشتر ئیعدام کرا. لەبەر ئەمە دۆستانی ئێمە وەکو بەهرۆزی دهقانی، عەلی ڕەزا نابدل و مەنافی فەلەکی کە پاشان هەر هەموویان لە ڕای ئارمانجی خۆدا گیانیان فیدا کرد، وا بیریان دەکردەوە کە دەرفەتی زەوجین فرەس و لەو دەورو زەمانەدا زەوجین و زەماوەندیان بە کارێکی دەست و پێ گیر دەزانی.

ع.د:   کازمی سەعادەتی کە دەیتوانی خۆی بشارێتەوە بۆچی دوچاری ئەو چارەنووسە بوو؟

غ.ف: ئێمە زۆربەی کات پێکەوە بووین. بەر لەوەی کازم دەستگیر بکرێ و پاشان خۆی بکوژێت، پێکەوە بووین. ئێمەیان پێکەوە گرت و ئەوجا پێکەوە بەریان داین. ساواك لە بەهروزی دهقانی دەگەڕان و دەیانویست لە رێگەی ئێمەوە دەستیان بیگاتێ، بەڵام چونکە نەگەیینە چ ئەنجامێك بەریان داین. هەوەڵجار کازمیان بەردا، دەیانویست بزانن کازم بۆ کوێ دەروات و شوێن پێی بەهرۆز بە سایەی ئەوەوە بدۆزنەوە. بەڵام ئەمەی کە بۆچی کازم پاش دەرچوون لە تەوقیفی ساواك خۆی کوشت دەبێ بڵێم ئەوەندەی من ئەوم دەناسی ئەمە بوو کە کازم دەیویست بە کوشتنی خۆی و بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، بەهرۆز لە وەزعەکە ئاگادار بکات. یانی بەهرۆز رووداوەکە بژنەوێت و نەچێت بۆ ماڵەوە کە لەژێر چاودێری ساواك دا بوو. چونکە کازم بەهرۆزی زۆر خۆشدەویست و لاوێکی یەکجار عاتیفی بوو، وای بیردەکردەوە بە کوشتنی خۆی، رێگە لە هاتنی بەهرۆز بۆ ماڵەوە دەگرێت، هەڵبەتە هەر واش بوو.

ع.د:   رای جەنابتان دەربارەی خنکانی سەمەدی بیهرەنگی لە ئارازدا چییە؟

ع.ف: سەمەد لەرووی بەدەنییەوە بە داروبار و بەهێز بوو. رۆژێك لە بستان اباد لە ئەستێڵی قوتابخانەکە مەلەمان دەکرد. من و رەیس نیا و چەند دۆستێکی دی پێکەوە شەڕە ئاومان دەکرد. لێبراین کە سەری سەمەد وەبن ئاو بخەین. هەرچیمان کرد نەمانتوانی. سەمەد بەرگری دەکرد و دەیگوت ئێوە ناتوانن سەری من وەبن ئاوێ بخەن. لێ سەمەد مەلەوان نەبوو. ئاراز گێژاوی زۆرەو من لەبەر ئەوە هیچ کاتێ لە ئاراز نزیك نابمەوە. ئەو سەردەمە پێمان وابوو کە کاری ساواکەو ساواکمان بە تاوانبار دەزانی، و هەمزەشمان بە تاوانبار دەزانی. بەڵام نا، سەمەد مەلە بەڵەد نەبوو. ئەگەر هەل و مەرجی ئەو زەمانە و مەوقیعیەتی سەمەد و ئەو هەڕەشانەی کە لەلایەن ساواکەوە سەبارەت بە کتێبی ئەلفباکەی لەو کرابوو لەبەرچاو بگرین، ئەوا دەبێ بڵێین تا رادەیەکیش ئەگەری کوشتنی هەیە. نابێ بە تەواوەتی رەتی بکەینەوە. سەبارەت بەمەی کە لەئایندەدا قفڵی ئەم رازە چۆن بکرێتەوە. هەمزە فراهتی کەسایەتییەکی ناکۆکی هەبوو. هەم سوپایی بوو هەم دژە سوپایی. پزیشکی بەیتاڵ بوو و لە سوپادا بوو. رەنگە رۆژێ گرێی ئەم رازە بکرێتەوە و هەمزە دەتوانێ لەم بارەیەوە هاوکاری بکات و بێدەنگ دانەنیشێت.

ع.د:   گوایە فیلمێك لەمەڕ ژیانی سەمەدی بیهرەنگی ئامادەکراوە، ئێوە ئاگاتان لە بەسەرهاتی ئەو فیلمە هەیە؟

غ.ف: بەڵێ، فیلمەکە لە لایەن رەزا عەلامەزادە و زۆر ساکارانە دروستکرا. ئەسڵی فیلمەکە لە بنکەی پەروەردەی فیکری منداڵانە. بیرۆکەی ئەسڵی فیلمەکە من دام و عەلامەزادە تەواوی کرد. پێم گوت تۆ فیلمەکەت ئامادە بکەو مۆڵەتی من بدە کە دوای دیتنی فیلمەکە رای خۆم بڵێم. ناوی

فیلمەکـە ((ژیـانی سـەمەدی بیهرەنگـی)) بـوو. فیلمەکـە دووسـێ لەقتـەی جـوانی تیایـە. رەزا بەخۆیشی فیلمەکەی نییە. بە هاوکاری رەزا لـە شوێنانی جۆراوجۆر فیلمەکەمان گرت. سیرۆس مەلـەك زادە وێنـەی گرتبوو، هەڵبەتـە فیلمسـازێکی بـەرزە. کامێرایـەکی شـاراوەی لەسـەر مـەزاری بیهرەنگی دانا و چاوەنۆڕ بووین بزانین چ کەسێك دێت. لـە دوورەوە منداڵێك هـات کـە کلاوێکـی خـوری لەسـەر بـوو. مەلـەك زادە گـوتی پـێم وایـە ئـەم منداڵـە دێتـە سـەر مەزارەکـەی سـەمەد. کوڕیژگە کە((١٥٠)) شەقاوێك لە گۆرەکەوە دوور بوو، بەڵام دروست هاتە سەر گۆرەکە. تەماشای دەوروبـەری خـۆی کـرد و چـوو گسـکێکی هێنـا و بـەفری سـەر گۆرەکـەی مـاڵی. گسـکەکەی لـە سوچێکدا دانا و پاڵی دا بە تەیمانی دەوری گۆڕەکەوەو کەوتە راز و نیاز لەگەڵ گۆڕەکەدا. تۆزێ گۆرانی گوت، دەستی تەکاندا. پشتی راستکردەوەو خواحافیزی لە سەمەد کرد و رۆیی.

ئەم لەقتەیەم((دیمەنە)) هیچ کاتێك لە یاد ناچێت. زۆری ڕاچڵەکاندم ئەم منداڵە کەی و چۆن سـەمەدی ناسـیوە. ئەمـە سـاڵی ١٩٧٨ بـوو. ئـەو زەمانـە کـەمال خـەڕازی بەرپرسـی بنکـەی پەروەردەی فیکری منداڵان بوو و مۆڵەتی ئامادە کردنی فیلمەکەی بە رەزا دابوو. من نامەکەییم بینی کە بۆ غەروی پارێزگاری تەورێزی نووسیبوو کە ئاغای عەلامەزادەی دەرهێنەر دەیەوێت فیلمێك دەربارەی سەمەدی بیهرەنگی نووسەری گەورەی ئێران ئامادە بکات. لە سنوری توانادا ئاسانکاری پێویستی بۆ فەراهەم بکەن. غەروی لەژێر ئەوەوە نووسیبوی و ئیمزای کردبوو کە رێگە لە کارکردنی نەگیرێت. هەر چیرۆکی ماسییە رەشە چکۆلەکە دەکرا هێڵێك بداتە دەستەوە بۆ نووسینی فیلمەکەو سیناریۆیەکی چاکی لێ دەردەچوو کە دەشیا تا رادەیەك داستانی بێت. جگە لەمـە خـانمێکیش بـەناوی مەهەسـتی بـەدیعی دەیویسـت فیلمێـك لەمـەڕ ژیـانی سـەمەدی بیهرەنگی کـە مـن فیلمنامەکـەیم نووسـی بـەناوی ((رۆژێـك لـە ژیـانی سـەمەدی بیهرەنگـی)) کـە رەشنووسەکەیم دایێ بەڵام پاشان ئامادەی نەکرد.

## ع.د: چ شتێکتان لەمەڕ چالاکی و کارەکانی دیکەی نەمر سەمەدی بیهرەنگی لە یادە؟

غ.ف: لە راستیدا بەرنامەی کاری ئەومان نەدەزانی. رەوش و رێبازێکی تایبەت بە خۆی هەبوو. نەمانـدەزانی چـۆن کـار دەکـات. ٢٩ سـاڵ ژیـا و ئـەم هـەموو کـارە. لـە ماڵـەوە کـاری دەکـرد. لـە قوتابخانـەدا کاری دەکرد. دەچووە چاخانەی جەلیل و شوێنێکی تایبـەتی هـەبوو و لـەوێ کـاری دەکرد. دەچووە کێوان، دەچووە سـەفەران. لـە زانسـتگەش دەیخوێنـد، دەینووسـی. تەرجەمـەی دەکرد. کتێبی بۆ گوندان دەبرد و دەیدان بە منداڵان. بە پێیـان و بە هێز و قوەتێکی لەرادەبەدەر. پـەراوێز نووسیەکی زۆری لـەو کتێبانـەدا کـردووە کـە لێـی بـەجێ مـاون. فەرهەنگـە عامیانەکـەی جەمال زادەی لە ٢٠-٣٠ جێ دا راست کردۆتەوە و پەراوێزی بۆ نووسیوە. ئەم هەموو چالاکییە لەگەڵ تەمەنی ئەودا نەدەگونجا. سەردانی گولیخانەی تەورێزی دەکرد و دڵخۆشی نەخۆشـەکانی ئەوێنـــدەری دەدایـــەوە. ســـەری هـــەموو شـــوێنێکی دەدا. دەربـــارەی گولیخانـــەی تـــەورێز نووسینێکیشی هەیە کە بۆ یەکەمجار لە کتێبی((لەگەڵ سەمەدی برام دا))ی ئەسەدی بیهرەنگی بڵاوبووەتـەوە. زۆر ورد و رێـك وپێـك بـوو. لـە کۆتـایی زۆربـەی کتێبەکانیـدا رۆژ و شـوێنی

نووســــینەکانی دەنووســـی. بــۆ نموونـــە لـــە کۆتـــایی کتـــێبی ((یولـــدز و قـــەلان)) دا نووسیویەتی:((لە ئاخیرجان، چاخانەی جەلیل، پایزی ١٩٦٥ تەواو بوو.))ئەحمەدی شاملو بۆ ماوەی یەك هەفتە هاتە ئازربایجان و لە یەکێك لە دێهاتەکاندا لای سەمەد مایەوە. میوانی سەمەد بوو. فروغی فەروخزادش هاتبووە تەورێز و میوانی سەمەد بوو. سەمەد فروغ و شاملوی خۆشدەویست و هەندێ لە شیعری ئەو دوو شاعیرەی کردبووە تورکی. لەناو کتێبەکانی کتێبخانەکەی سەمەدا گەلێك رۆژنامە هەن کە یەکێك لەوانە رۆژنامەی خاك و خوێنی پزشکپورە کە تیایدا هێرشێکی توند کراوەتە سەر ئادینەی تەورێز و ناراستەوخۆ هێرشیشە بۆ سەر سەمەدی بیهرەنگی.

ع.د: جەنابی فەرنود ئایا وێنەی بڵاونەکراوەی سەمەدی بیهرەنگیت لەلا هەن؟

غ.ف: بەداخەوە وێنەکانی سەمەدی بیهرەنگی کەوتنە لای ئاغای ئیسلام کازمیە بەمەبەستی ئامادەکردنی وێژەنامەی سەمەد. نزیکەی ١٥٠ وینەی هەمەجۆری سەمەد بوو کە لەو گۆڤارەدا سوود لە هەمووی وەرنەگیرا. رەنگە ئەم وێنانە پاش مەرگی ئیسلام کازمییە لای کەسێك مابنەوە یان فەوتابن. من تازە کامیرام کریبوو و وێنەی جۆراوجۆری سەمەدم گرتبوو. بۆ نموونە لە حاڵێکدا کە سەرگەرمی لانەی مێرولان و تەڵەوداوی مێرولەخۆران بوو. لە کاتی گرتنەکانی ئێمەدا گەلێك لە رۆژنامە، کتێب، نامە و وێنەکانی سەمەد فەوتان و لای کەم کەس ماون. هەڵبەتە چەند دانەیەکم لایە دەیاندەم بە تۆ.

ع.د: زۆر سوپاس بۆ ئێوە ئاغای فەرنود.

غ.ف: مەمنونم.

**یادمان صمد بهرنگی**

**علی اشرف درویشیان**

**١٣٧٩**

**ئەفسانەی سەمەد وبابەتی زمان**

**بە بۆنەی چاپی بەرهەمەکانی سەمەدی بیهرەنگییەوە**

**بە زمانی تورکی لە تورکیا**

**ن: رەزا بەراهەنی**

**و: حەمەکەریم عارف**

"١"

سەمەدی بیهرەنگی هەر زوو بوو بە ئەفسانەی میللی ومیللەتی ستەمزەدەی خۆی، بەلاّم چونکە ئەم ئەفسانەیەتیە زۆر بە قوڵی رەگی لە ناو واقیع و رووداوەکانی ژیانی خەڵکی ئازبایجاندا داکوتاوەو واقیع و سەربوورو رووداوێن ژیانی گشت میللەت و گەلێکی ستەمدیدە، لە رووی بونیادو نموونەی ئەپستمۆژی و ڕوانینی هونەرییەوە نزیکییەکی حاشا هەڵنەگریان لێکدییەوە هەیە، بۆیە ئەفسانەی بە ناو ودەنگی سەمەدی بیهرەنگی، لە زەرفی ئەو دە ساڵە پڕجۆش و خرۆشەی بەسەر ولاّتی ئێمە و ولاّتانی زۆر لە گەلانی ستەمزەدەی جیهاندا بوریوە، مەرزی زمانەکان، شارستانییەتەکان، ئایدۆلۆژیا سیاسییەکان، دەزگا فیکری و فەلسەفییەکان و جیهانبینییە کۆن و تازەکانی بڕیوە. وەکو ئەسپ و کۆترەکانی ناو " ئەفسانەی خۆشەویستی"یەکەی، کێو ودەشت، جەنگەڵ و دەریا، کوختە و کۆچك و کۆشکانان ناناسن و تەنێ لە ڕێگەی هەڵبەستنی پردێن خۆشەویستییەوە عەوداڵی دوای ڕامکرن و وەدەستهێنانی دلاّنن، مندالاّنی جیهانی ستەمزەدەی، غەرقی شادمانی و هیواداری بە ئاینده کردووە. سەمەد وەکو چۆن واقیعیترین چیرۆکبێژی زەمانی ئێمەیە، ئاواش پڕجۆشترین "ئەفسانەی خۆشەویستی" سەردەم و رۆژگاری ئێمەیە.

ئەو بابەت و کەرەستە و بونیادانەی کە سەمەدی بیهرەنگی لە کۆمەڵێك کاکڵە بابەتی دڵپەسند و دڵگیر،بەلاّم قۆرخی رۆشنبیریی ناوچەیی و خۆماڵی خۆی، واتە لە کەلتوورو کەلەپووری گەلی ستەمزەدەی ئازربایجانەوە هەڵیهێنجاوەو بە جیهانی نیشانداوە، هێندە بە داروبارو خەیاڵوروژێن، لە هەرەمەی سادەییدا، شکۆدارە. کە بە جوئەتەوە دەکرێت بگوترێ سەمەد دەستی گەیاندووەتە ناخی هیواو حەزو بریاکانی مرۆڤ. واتا کەشفی کردوون، نەك هەر بۆ سەروبەندی کورتی رۆژگاری ئێمە، بەڵکو بۆ تەواوی مێژوو. لەم روانگەیەوە، سەمەدی بیهرەنگی بە سواری باڵی ئازادیخوازی گەلی ئازربایجان و هەموو خەڵکی ئێران، فرینێکی هێندە دیارو جوان و بەرزی هەیە کە لەو بەرزاییەوە، ئیدی سنورێن نێوان میللەتان، گەلان، نەژادان و رەنگەکان هەرگیز نابینرێن. ئەوەی بەڕاسی دێتە بەرچاوان، هەڵسوکەوتی ئاسان، ئازادانە و یەکسانی هەموو خەڵکی جیهانە لەگەڵ یەکدیدا. سەمەد بەڕاستی جیهانیترین چیرۆکبێژو وتیاری مەیە.

"٢"

لیٚ سەمەدیش وەکو هەموو نووسەرانی هاوعەسری خۆی، رۆڵەو پیاوی سەردەمی خۆیەتی. جا ئەم سەردەمە چ ستەم و زۆڵمێکی بەسەر ئەو وهاوعەسرانی ئەودا سەپاند! ئەمە جگە لەو ترس و لەرز و دڵەراوکیٚ و نیگەرانی و پاشاگەردانییەی کە لە سەرانسەری حوکمڕانیماڵباتی چەپەڵی پەهلەویدا هەموو ئێرانی تەنی بوو. پاشاگەردانی و دڵە ڕاوکێیەکی دیکەش بەسەر گەلانی غەیرە فارسی ئێرانەوە سەپابوو. ئەمەیان سەرباری ستەمە گشتییەکە بوو، نەك هەر بڕینی زمانی رۆشنبیریی و شارستانییەت و ئەدەب و هونەرو رۆژنامەوانی و سیاسەت بوو، بەڵکو بڕینی زمانی زکماك بوو. نووسەرانی هەموو گەلانی زوڵملێکراوی ئێران دەبووایە دووجار لە دایك ببن، جارێك لە رێگەی دایکیانەوەو بە هۆی زمانی زکماکی خۆیانەوە، جارێکی دی بەهۆی "دایەنێکی دڵسۆزتر لە دایك!"ەوەو بە هۆی زمانی داسەپاو بەسەر هەموو گەلانی بندەست، واتا بەهۆی زمانی زکماکی خەڵکانی دی، یانی بە هۆی زمانی فارسییەوە. هەر یەکێك لەم نووسەرانە بە پێی هەلومەرجی خۆی دەبوایە بە شێوەیەك مل بۆ ناهەقی و باری گرانی سەردەمی خۆی بدات. لە ئازربایجاندا، هاوسونحانی سەمەد ، جگە لە تاقە ساڵێك لە شەهریوەری ساڵی ١٩٤٥وە بۆ ئازەری ساڵی ١٩٤٦، ئیدی کەس تامی بە رەسمییەت ناسینی زمانی زکماکی خۆی نەچەشتووە. ئەم چەند مانگە ئەگەرچی زۆر کورت بوو، بەڵام کاریگەرییەکی قوڵ و کاراو بروسکە ئاسای هەبوو. نەسلی سەمەد شەیداو ئاشق و رمووەدەی زمانی زماکی خۆی بوو. شکست و کەوتنی فیرقەی دیموکرات، لە ڕاستیدا کەوتنی زمانی خەڵکی ئازربایجانیش بوو. لەوە بە دوواوە، مێژووی غەدار، چوار رێگەی جیاوازی خستە بەردەم نووسەرانی ئازربایجان:

*- یان بە تورکی بنووسن، ونووسینەکانیان هەم لە حکومەتی نەژادپەرست و هەم لە خەڵکیش بشارنەوە. ئەو کارەی کە شاعیران و نووسەرانی بەسەبرو حەوسەڵە و بوێری وەکو سەهەند، حەبیب ساهیر، مەحزوون، عەلی رەزا نابدل "ئوختای" و مەرزییە ئەسکویی "لە شیعردا" و گەنجعەلی سەباحی (لەچیرۆکدا) کردیان.

*- یان کۆچبکەن و بە زمانی توکی بەرهەمی خۆیان بنووسن و دوور لە خوێنەری ئەسڵی خۆیان، واتا دوور لە خەڵکی ئازربایجان، بەرهەمەکانیان بە شێوەیەکی سنووردار چاپ وبلاٌوبکەنەوە،کە لەمبارەیەوە چارەنووسی م.شەبستری، کە یەکێکە لە شاعیرە هەرە بە تواناکانی ئازرباجان نموونەیە.

*- یان بە فارسی و تورکی بنووسن، وەکو شەهریار و مەفتون ئەمینی ( لە بواری شیعردا)، کە بەرهەمە فارسییەکانی خۆیان تا رادەیەك بە ئاسانی چاپدەکرد و شیعرە تورکییەکانیان بە زەحمەت.". لەمبارەیەوە حەیدەربابای شەهریار کە چەندین جار، هەم لە ئێران و تورکیا و هەم لە ئازربایجانی سۆڤیەت چاپکراوەتەوە، ئەفرۆزێکی(ریزپەڕ) شکۆدارو دەگمەنە" چونکە شەهریار بە خۆی لەسەردەمی رژێمی رابردوودا لە تەلەفزیون گلەیی کرد کە مۆڵەتی نادەن شیعرە تورکییەکانی خۆی چاپبکات.

*- یان زمانی فارسی بۆ نووسینی هەموو بەرهەمەکانی خۆیان هەڵبژێرن، تەنانەت ئەگەر لە زمانی زکماکی خۆیانیشدا بالاٌدەست بن و جارجارێك لە ئاستێکی بەرزدا زەوق و سەلیقە

وبەهرەی خۆیانی پێ تاقیبکەنەوە یان ئەگەر لە ئاستی نووسەران و شاعیرانی پیشەییدا هاوتایی بکەن ( وەکو سەمەدی بیهرەگی و بەهرۆزی دیهقانی) بە هەرحاڵ، هەرچییەك دەنووسن، بە زمانێك بێت کە حکومەت و مێژوو وەکو زمانی فەرمی بەسەر سەرانسەری ئێرانیاندا سەپاندووە، واتە بە زمانی فارسی. ژماری ئەمجۆرە نووسەر و شاعیرانە زۆرن و هەندێکیان لە مەیدانی لێکۆڵینەوە، رەخنەی ئەدەبی، مێژوونووسی، شیعر و چیرۆك، لە زمانی فارسیدا خاوەنی شێوەو شێوازی تایبەتین، واتا ئەمانە هەمان کاریانکردوە کە ژمارەیەکی زۆری نووسەرانی رابردووی ئازربایجان، تورکانی ئێرانی، یان نیمچە تورکان کردوویانە: نیزامی، شەمسی تەبریزی، مەولەوی، قتران ، خاقانی تا دەگاتە پەروینی ئیعتیسامی و ئیەرەج میرزا و تەقی رەفعەت تا کەسرەوی، سەمەدی بیهرەنگی، غولام حسەینی ساعیدی، بەهرۆزی دیهقانی و ئەشرەفی دیهقانی.

"٣"

ئەگەرچی یاساو رێسای زمانی و بەیانی و دەستووری، دوو گروپ لە نووسەرانی ئازربایجانی، واتا تورکی نووسان و فارسی نووسان جیادەکاتەوە.بۆ نموونە پاشخان و باکراوندی (سازمین و سوزو)ی (سەهەند) کە لە رووی "نەقڵەوە" لەسەر بناغەی (دەدە قورقود)ی فۆلکلۆری تورکانی ئازربایجان و تورکی ئازەری رۆنراوەو لە رووی قاڵب و ڕواڵەت و شێوەوە لەسەر وەزن و کێشی هیجاییە، پاشخانی غەزەلی شەهریار، وشیعری نوێی فارسی لە ئازربایجان، پاشخان و سوننەتی شیعری کۆنی فارسی، شیعری نوێی نیمایی و تەنانەت شیعری بێ وەزن و قافیەشە، بەلاّم دوو خەسڵەتی زۆر گرینگ، شیعرو پەخشانی ئازربایجانییەکان بە گشتی لە شیعرو پەخشانی گەلی فارس، تەنانەت کاتێ کە ئازربایجانییەکان بە فارسیش دەنووسن، جیادەکاتەوە: یەکەمیان ئەوەیە کە خەسڵەتی فۆلکلۆری زارەکی زاڵە بەسەر ئەم بەرهەمانەدا.لە خەمسەی نیزامییەوە بیگرە تا دەگاتە(حەیدەربابای) شەهریار و (سازمین و سوزو)ی سەهەند بە زەقی دیارەو وەکو هێڵێکی روناك و باریك و تەقریبەن بێوەستان،(دەدەقورقود)ی تورکی و (مەسنەوی مەعنەوی) مەولەوی ، بە (ئەفسانەی خۆشەویستی) سەمەدی بیهرەنگییەوە گرێدەدات. دووەمیان: خەسڵەتی بابەتگەریی و واقیعیەتگەرایی تیمەو ناوەرۆکی ئەم بەرهەمانەیە.بە شێوەیەکی گشتی نووسەرو شاعیری ئازربایجانی و تورك لە شاعیران و نووسەرانی فارس کەمتر زهنیەتگەران. بۆ نموونە (شەرحی شەتەحیات)ی روزبەهان بەقلی شیرازی، لە گوتاو گوتەکانی شەمسی تەبریزی و( مەسنەوی) زەینیترە، بە واتایەکی دی، مەولەوی سەراپا لێکچوون، خواستن، خوازە، تەورییە و، کاراکتەرە.سەراپا هەر پەند وقسەی نەستەقە. وەسفگەراترین و واقیعیترین شاعیری کۆنی ئێرانی، نیزامییە.هەردووکیان لە داستابێژە گەورەکانی جیهانی کلاسیکین، ئەمەش ئەو خەسڵەتی گێڕانەوەیەیە کە ئاماژەمان بۆ کرد. هەردووکیان لە ئەفسانەساز و کاراکتەر خوڵقێنەکانی ئەدەبیاتی کۆنی فارسین. ئەمەش ئەو خەسڵەتە بابەتی و واقیعییەیە کە ئاماژەمان بۆ کرد. جا ئەگەر ئەفسانە و خواستن و کاراکتەر بە کەرەستەی بابەتی و خودی ،واقیعی و زەینی نووسەران و شاعیران بزانین، ئەوا مەولەوی ساراپا کاراکتەر وئەفسانە وخواستنە. هیچ

شـاعیرو نووسـەرێکی نـاو ئـەدەبیاتی کـۆنی فارسـی، لـەم رووەوە لەگـەڵ ئـەودا بـەراورد ناکرێت.مەولەوی وێڕای ئەو سۆفیگەریی و عیرفانە بەربڵاوەشی، کە عادەتەن دەبیٚ زەینی بێت، یەکێکە لـە مـەتریالیترین و بابـەتی تـرین و واقیعـیترین شـاعیرانی جیهـان.مەولـەوی رێبـواری کاراکتەرو شتانە، لە هەمانکاتدا رێبواری چیرۆکانیشە. رێبوارێکە چیرۆك ونەقلأن دەڵێت و لێکدا لێکـدا پەنـد و مەسـەلە دێنێتـەوە..(قسـەی خـەڵکانی دی) مەولـەوی لـە مانـادا لـە هـەوڵی بـە مـادیکردنی شـتە دەرونییەکاندایە،لـە دەرێـی خـودی دەروون وگـەڕان و سـیاحەتە بـە نـاو شـتە بابـەتی و واقیعییـەکان.سـەمەد مەولـەوی نییـە، نیزامـی نییـە، فزولـی نییـە، بـەڵام هەودایـەکی بـەردەوام و هاوبـەش ئـەم شـاعیرانە لـە سـەمەد نزیك دەکاتـەوە. ئەگـەر سـەمەد تەمـەنی درێژبایـە، رەنگـە وەکـو ئـەمانی لێهاتبوایـە.( ئـاراس لەبـەر دوو هـۆ دژمنـی ئێمەیـە، یـەکێکیان ملـی داوە بـۆ جـەبری مێـژوو، و نیـوەی باکوورمـانی لیٚ جیاکردووەتـەوە، دووەم لەبـەر ئـەوەی بـە زندوویـەتی سـەمەدی وەرگرت، بـە مردوویـەتی بۆی گەڕانینـەوە .)بەڵام بونیـاد و بینـای ئـەو هـەودای ئولفەتـە هونـەری و جیهانبینییـە فیکرییـە بـە روونـی و ڕەوانـی لـە بەردەممانداـیە. سـەمەدیش رێبـواری ئەفسانەیە، رێبواری داستانە. بونیادی زەینی سـەمەدیش، بونیادی سـەفەرە. رێبوار، بە واتایەك داسـتانبێژ دەگەیـەنێت، وبـە شـێوەیەکی گشـتی تورکـەکان خـەڵکێکی رێبـوارن. لـەم رووەشـەوە تورکەکان لە فارسەکان جیاوازن.

"٤"

لەوەیـە ئـەم دوو خەسـڵەتە، واتـە گێڕانـەوەکاری و بابەتگـەرایی بەرهـەمێن تورکـان ، لـەم خاڵـەدا بێـت کـە تورکـان نـەژادێك بـوون لـە حـاڵی دوورکەوتنـەوە لـە مەرکـەز بـوون، وفارسـەکان لـە حـاڵی گەڕانـەوە بـۆ مەرکـەز بـوون. تورکـەکان لـە خـاك و وڵاتـی ئابـادو ئـەژدادی خۆیـان وەدەرنـراون و سەفەریان کردو، لە کەنارەکانی دیواری چینەوە، لە رۆژهەڵاتـەوە تـا شـامات، ئـەفریقیای باکوور و دانـوب لـە رۆژاواوە، لـە باشـوورەوە تـا قـوڵایی هینـد، ولـە بـاکوورەوە تـا دەسـەڵات و قەڵـەمرەوی مۆسـکۆی روسـیا.ئەوانـە لـە رێگـەدا و لـە دەورو بـەری خۆیانـدا شـتیان دیتـووەو تەجرەبـەیان کردووە. سەیر ئەمەیە کە قەبیلە جیاوازەکانی تورك، پاش دەرچوون لە وڵاتـی خۆیـان بە دەگمـەن گەڕاونەتەوە تا لەو وڵاتەدا بژین. بە پێچەوانەوە، لە بڕینی روباران، شاران،بنـاری چیایان، دەشـت و دەریایاندا، بڕبڕ وڵاتیان لە پاش خۆ بە جێهێشتووە، کۆمەڵێك دیالێکتیـان لـە زمـانی خۆیانـەوە پـەروەردەکردووە کـە هەنـدێك جـار یـەجگار لـە یەکـدی جیـاوازن. ئـەم سـەفەرە، چـاکی ئـەم دوورکەوتنەوەیە لە مەرکەز، هەستێکی پەڕینـەوەو حەرەکـەتی لە درێـژایی زەمانـدا پێداون. ئەمـە دەکاتە سەلیقەی گێڕانەوەو هەستی چیرۆك، چونکە چیرۆکیش گـەڕان و هەڵسوکەوتی کاراکتـەرە لە درێژایی زماندا.پەخشان هەمیشە لە حاڵی کرانەوەدایە لە ناوەوە بۆ دەرەوەی چەقی قورسایی زمـان، و شـیعر بـە پێچـەوانەوە لـە حـاڵی گەرانەوەدایـە لـە دەرەوە بـۆ چـەقی قورسـایی زمـان. گـەلی فارس ئەگەرچی بۆ شوێنانی دی رۆیی، بابل، یۆنان، دۆڵی دوو روبار، ئەودیوی دەریایـان، میسـر و حەبەشـە، بـەڵام پـاش هـەر سـەفەرێك، داگیرکردنێـك، سـەرکەوتن یـان شکسـتێك، دووبـارە بـۆ سەرزەمین و خاکی باب و باپیرانی خۆیان گەڕاونەتەوە.ئەم سەفەر و گەڕانـەوە خێرایـە لە سـەفەر،

هەستی هەبوونی یەك ولأت، هەستی گەرانەوە بەرەو مەرکەز، هەستێك کە ئەگەر لە زماندا پیادە بکرێت، هەستی شیعری غەزەلییە– بە میللەتی فارس بە خشی.بەلأم تورك ئەمجۆرە وێنایەیان لەمەڕ ولأت و گەڕانەوە لە دوی هەر سەفەرێك بۆ سەرزەمینێکی تایبەتی لە لا نەبوو. ولأت و سەرزەمینی ئەو بوخارا بوو، قەزوین و ئەسفەهان و تەبرێز بوو، ئەستەمولٚ، باکۆ،شام، ئەفریقیای باکووری، ئەورووپای شەرقی و کەنارەکانی دەریای قرم بوو. تورکەکان، بەشی هەرە زۆری ئاسیا، باکوری ئەفریقیا، رۆژهەلأتی ئەورووپایان بۆ ماوەی چەندین سەدە کرد بە ولأتی خۆیان، لە هەندێك لەم دەڤەرە بێگانانە چەندین سەدە مان و مانەوە. سەفەر، رێبوار لەسەر جیهانییەت رادێنێت و توانای وەرچەرخان و گۆڕانی لا دروستدەکات، سەفەر، گیانی هاوبەشی تورکانە. هەر شارێکی ئێران بگریت کۆلۆنییەکی تورکی هەیە. لەوەیە نیوەی دانیشتووانی ئیستای تاران لە کۆلۆنییە تورکنشینەکان پێك هاتبێت، کەچی لە تەبرێزدا، لە سەرانسەری ئازربایجاندا، فارس تاقە یەك کۆلۆنی فارسییان دروست نەکردووە.تەنانەت لە ئەمریکا لە شاری نیویورك، لە چەند میلی نیویورکدا، کۆلۆنییەکی ئازربایجانی هەیە، کەچی وێرای ئەوەی ئێرانیانێکی زۆر لە ئەمریکادا هەن، بەلأم تاقە کۆلۆنییەکی فارس نشین نییە.

هەستی سەفەر، گیانی گێڕانەوەکاری دەخولٚقێنێت، بە رێکەوت هەمان هەستی سەفەر،گیانی ماددی و بابەتیش دەخولٚقێنیٚ.سەفەر لە حالٚی گواستنەوەو گێڕانەوەکاریدا ، لە ناو شتان و بە شتانەوە بەرجەستە دەبێت. هەر لەبەر ئەمەیە،خەسلٚەتی گێڕانەوەکاری و بابەتگەری بەسەر نووسەرانی تورکدا زالٚە،هەر لە (فازیل حسنو داغلاجار) و یەشار کەمال (تورکیایی کورد) کە شیعر و پەخشان بە تورکی دەنووسن تا شەهریار و سەمەدی بیهرەنگی کە شیعر و پەخشان بە فارسی دەنووسن، تەنانەت ئەگەر جیهانبینیان،ئیشراقی و عارفانە بە مانا کۆنەکەی بێت یان ماتریالی و دیالیکتیکی و ئایدۆلۆژیکی– سیاسی بە مانا باوەکەی ئەمرۆش بێت.

"٥"

سەمەد رۆلٚەی ئەم داب و نەریت و کەلەپوور و ئەم تاریخیەتەیە: دابی گێڕانەوەو گێڕنەوەکاری، دابی سەفەر، دابی دیالیکتیك، دابی دلٚەخورپەو نیگەرانی، دابی ئازادیخوازی، دابی فڕین و دوورکەوتنەوە و هەلأتن لە مەرکەز، دابی غوربەت و غەریببوون لە ولأتداو عەودالٚبوونی ولأتی واقیعی، دابی بڕبڕ نیشتمان و ولأتسازی. سەمەد لەمبارەیەوە ڕەهایە. رێك و تەواو وەکو مەولەوی، بەلأم کۆتایی سەمەد بەشێکە لە چارەنووسی قەومی ئەو. سەمەد بالٚی کردۆتەوە بۆ فڕین، دیلی سنوور و مەرز و درز و کەلەبەرانە.کەپیٚ دەنێتە ناو ئاوەکەوە ڕەنگە ویسبێتی بپەڕێتەوە، ئەمە هیچ بە دوور نازانم،تا نیشتمانێکی دی دروستبکات — غەرق دەبێت.تۆ تەمەشای ئەم ناکۆکییە بکە! سەمەد بە ئاسانی ماسییەکانی بە هەزارو یەك خەتەر و مەترسیی سەر رێگاوە دەپەڕێنێتەوە،لیٚ بۆ خۆی لە هەمان ئاودا دەخنکیٚ! بەلأم هەولٚی جازیبەی سەفەر بۆ تورك، شەپەزللەیەکی مێژووییە. نازم حیکمەت، تورکێکی ترە، چەند بە ئاسانی لە هاڤاناوە تا مۆسکۆ تا ئەفریقیا دەگەڕا.کەواتە بۆ سەمەد نەتوانێت؟ و سەمەد دەخنکیٚ! چەند رۆژێك لە ئاودا دەمێنێتەوە، وپاشان لە کێو و قەدپالأنەوە، تەرمەکەی بۆ ئیمامیە دەهێنرێتەوە.بەلأم سەمەد بەر

لەم غەرقبوونە ئاشقی جۆرە ڕۆچوون و غەرقبوونێکی دیکە بوو، چونکە سەفەر بۆ دەرێی ئازربایجان ناکات و ئەگەر سەفەر بکات، یان دەبێ لە زەڵکاوی تاراندا غەرق ببێ یان لە گێژاوی ئاراز، ئەدی چبکات! بست بە بستی خاکی ئازربایجان دەگەرێت، بەڵام ئەمەش بە تەنێ بەس نییە. قەڵەم بە قەڵەم، خواستن بە خواستن،ئەفسانە بە ئەفسانە، وپێ بە پێ لە کەلتووری میللەتی خۆیدا غەرق دەبێت. سەفەر لە وێنەگرتندا، لە بەرددا، لە ئاو و پەری و فریشتە و بنیادەمدا، سەفەر لە خەودا، سەفەر لە شێوەی چوونە پێستی پەیتا پەیتای مانگ و ماسی، کۆترو ئەسپ و ئەستێرە، سەفەر لە هەموو حاڵێکدا،تەنانەت لەو کاتەشدا کە سۆزو میهرەبانی سەمەد یەخەی بنیادەم دەگرێت و ئەسرین لە چاوی دێنێت، سەفەر لە زەماندا. سەمەد، خەونەکانی بەرەو ئایندە دەنێرێت. لێگەڕێ با ئایندە بە سەمەد موفتەلا بێت! جا لەم رووەوە کە سەمەد بابەتگەریی و گێڕانەوەکاری وەکو بالاترین خەسڵەتی نەژادی خۆی لە نێو بیرەوەرییاندا، لە ناو دیالۆگی منداڵاندا،لە زمانی پیرەژنان و پیرەمێردانـدا، لە ناو ئەفسوون و جادوودا، لەگەڵ یاتیلا و قوشماجالاردا، زیندوو دەکاتەوە. کەلەپوورو داب و نەریتان واتا ئەو شتەی کە لە ڕابردووەوە بەرەو ئایندە لە حاڵی جمیندایە. سەمەد لەم رووەوە شۆڕشگێڕێکی سوننەتیە. سەمەد هەر هەموو ئەمە لە چوارچێوەی زمانی فارسیدا بەکار دێنێت، چونکە زمانی ئازربایجانی لێ قەدەغەیە. ئەمە خۆی لە خۆیدا سەفەرێکی دیکەیە. سەفەرێك لە ناو ماناێن زمانی زکماکەوە بۆ ناو قاڵب و چوارچێوەی زمانی (دایەنی دڵسۆزتر لە دایك!) واتا بۆ ناو زمانی فارسی. سەفەر لە زمانێکەوە بۆ ناو زمانێکی دیکە، بە مانای سەفەرە لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی دی. وێنە مانای زمانێك بۆ زمانێکی دی دەگێڕێتەوە.لە تورکییەوە بۆ فارسی، دانوسانێکی یەکلایەنەیە. ئەمە گفتوگۆیەکی دەروونیی یەکلایەنەی دوو زمانە. سەمەد، بە زمانێکی تر دەڵێت من لە زمانی خۆمدا ئەمەم، بەڵام زمانەکەی تر هیچ شتێك بە زمانی سەمەد ناڵێت. سەمەد ئەفسانە پەنهان و لە چاڵنراوەکانی نەژاد و قەوم و نەتەوەی خۆی لە ونبون وگومناوی ڕزگار دەکات، و لە زمانێکی تردا زیندووی دەکاتەوە و ناو وناوبانگی پێدەبەخشێت.زمانێکی ناوچەیی و محەلی- حەقیقەتێکی تاڵە، بەڵام دەبێ بگوترێ.وێڕای مەزڵومییەتی خودی سەمەد،سەرەڕای یاخیبوونی سەمەد و نووسەرانی ئازربایجانی هاوزاری ئەو ،دژی زوڵم و بێدادی، هێشتاش هەر بە مەزڵوومی ماوەتەوە. ئا، ئەی دەنگی زیندانی! ئەی زمانی زکماکی مەزڵووم.

"٦"

بەڵام ئەمش جوان و مایەی سەرنجە کە سەمەد تەرجەمە و پاچڤەی تورکی دەکرێت.پێشان هەندێ لە بەرهەمەکانی پاچڤەی تورکی ئازربایجانی کرابوون. ئەوجا هەموو بەرهەمەکانی لە پاش مەرگی خۆی و بە تایبەتی دوای شۆڕش و یان لە دەرو بەری شۆڕشدا، بەڵام نەوو گرینگترین چیرۆکی وادەکرێن بە تورکی تورکیا، (یەڵدز و قەلان، یەڵدز وبووکەڵەی قسەوێژ، ئەفسانەی خۆشەویستی، هەڵوژە، یەك وهەزار، ماسییە ڕەشە چکۆلەکە، بیست و چوار سەعات لە نێوان خەو وبێداریدا، وکوریژگەی چەوەنەرفرۆش.)بە هەمووی حەوت کتێبی لە لایەن (یەڵدز کورتولان)ەوە کراون بە تورکی،لە لایەن (مستەفا دەلی ئۆغلو وئەمیرساری ئەر)ەوە وێنەی یەجگار

جوانیان بۆ کێشراوە. هەڵبەتە دەلی ئۆغلو وێنەی شەشیانی کێشاوەو ساری ئەر، تەنیا وێنەی یەکێکانی کێشاوە، ئەویش کوریژگەی چەوەنەرفرۆشە. هەر حەوت کتێبەکە بە یەك قەوارەو بە شێوەیەکی یەجگار جوان لە لایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی (ئودا)وە چاپ وبڵاوکراونەتەوە. وێنەکان یەجگار جوانن، وبریا هەندێك لە بەرهەمەکانی سەمەد لە ئێرانیشدا بە هەمان ئەو وێنانەوە چاپبکرابوایەن.

سەیر لەوەدایە کە سەمەد زۆربەی چیرۆکەکانی لە کەلەپوورو کەلتووری ئازەرییەوە، کە بۆ خۆی بەشێکە لە کۆی کەلتوری تورکانی جیهان، هەڵێنجاوە و تەرجەمەی فارسی کردوون و نهوو ئەم چیرۆکانە دەکرێن بە تورکی، ئەویش نەك تورکییەکەی سەمەد، بەڵکو تورکی دیالێکتێکی دیکە. هەر لەو تەرجەمانەوە کە سەمەد لە تورکی تورکیاوە کردوونی، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە سەمەد شارەزاییەکی تەواوی لەم دیالێکتەدا هەبووە. هەروەها گومانمان لەوەش نییە کە جیهانبینی سەمەد بە جۆرێك لە دەرك و تێگەییشتنی گشتی پشت ئەستوور بووە. بۆ نموونە لە گوتارەکانیدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە سەمەد کەسێکی سۆسیالیست بووە وهەر خەڵکێکی سوسیالیست دەیتوانی بەو شێوەیە قسە لەمەڕ مەشروتیەت بکات.(مەشروتیەت: حکومەتی یاسایی و دەستووری و پەرلەمانی...وەرگێڕ) سەمەدیش وەکو دەیان نووسەری سوسیالیستی سەردەمی شا، لە ڕوانگەو تێگەییشتنێکی گشتییەوە دەربارەی سوسیالیزمی دەنووسی، ئاسایی بوو کە لە هیچ شوێنێکی نووسینەکانیدا باسی سوسیالیستی خۆی نەکات: وەکو دەیان نووسەری دی کە سوودیان لەم چەمکە وەردەگرت، بێئەوەی قسەیەکی لەمەڕ بکەن. لە هەمان کاتدا سەمەد بە گشتی، لەو چوارچێوە گشتییەدا دەگونجا کە پێی دەگوترا پەیامداری و پابەندی ئەدەبی. یانی ئەو ئیلتیزام و پابەندییەی کە لەگەڵ ناوهێنانی هەندێ نووسەرانی بێگانەی وەکو سارتەرو کامۆ و نیرۆداو شۆلۆخۆف و هەندێ لە نووسەرانی خۆمانەی وەکو نیما و هیدایەت و ئال ئەحمەد دەهاتەوە بیر. ئەم چەمك و تێگەییشتنە گشتییە جۆرە ڕەوت و ئاراستەیەك بە سەمەد دەدات. لە هەمان کاتدا سەمەد دوو دەرك و تێگەییشتنی خۆیشی هەیە: یەکێکیان ئەوەیە کە سەمەد سەر بەکاروانی کەلتوورێکی ئەوتۆیە کە نیما و هیدایەت و ئال ئەحمەد نەیان دەتوانی کاروانچی ئەو کاروانە بن، ئەویش ئیدراکی گشتی لەمەڕ کەلتووری گشتی توکەکانی جیهانە کە دوو لقی ئەسڵی دراوسێی سەر زەمینی سەمەدە. یەکێکیان کەلتووری ئازربایجانی باکوور و ئەوی تریان کەلتووری تورکیایە. لەم ڕوەشەوە سەمەد لە ناو کاروانی بە جیهانی بووندایە. حاڵبووکی نیما و هیدایەت و ئال ئەحمەد ئەم وەزع و حاڵەیان نەبوو. ئیدی ئەوەتا سەمەد غەرقی کەلتووری خۆماڵی ئازربایجانە کە بە رواڵەت فارسی زەدەیە، بەڵام لە جەوهەرو کرۆکدا یەجگار بە هێزو بەیارو نەکێڵراو ودەست لێنەدراوە. سەمەد لە هەر نووسەرێکی ئازربایجان فارسی نووس، پتر شارەزایی لە کەلتووری خۆماڵی و نەتەوەیی خۆی هەیە. زانیاری سەمەد لەمەڕ زمانی خۆماڵی خۆی هاوتای زانیاری محەمەد عەلی فەرزانەیە کە مامۆستای بێ چەندوچوونی زمانی تورکییە. واتا هێندە زاڵە بەسەر زمانی تورکیدا مەگەر تەنیا لەگەڵ زاڵی فەرزانەدا قابیلی بەراورد بێت.

پێویستە ئەوە بڵێم کە ئەو تورکییەی بەرهەمێن سەمەدی پێ وەرگێڕدراوە، زمانی فەرمی میللەتێکە، نەك زمای زوڵملێکراوی میللەتێکی کوشتەی دەستی زوڵم. لەمبارەیەوە، تورکی تورکیا پایەیەکی هەیە وەکو پایەی زمانی فارسی لە وڵاتی ئێمەدا، ئەگەرچی سەمەدی تورك، بە فارسی دەنووسێت، یەشار کەمال، کە ئەسڵی کوردە، بە زمانی تورکی دەنووسێت، ئەوا ئەگەر یەشار کەمال لە ئێراندا بووایە بە فارسی دەینووسی، ئەگەر سەمەد لە تورکیا بوایە بە تورکی دەینووسی، بە زمانی یەشار کەمال دەینووسی. ئەوساکە تەنانەت ئەندامی کەمە نەتەوەییش نەدەبوو. تۆ بزانە سنوور چ چارەنووسێکی ناکۆك وجۆراوجۆری بۆ نووسەرانی وڵاتان خوڵقاندووە! تورکی تورکیاش، چونکە زمانی حکومەتە، چونکە زمانی زۆینەیە، وەکو فارسی فەخرفرۆشی بەسەر زمانی کەمە نەتەوییەکانەوە دەکات، لەوانە کوردی و ئەرمەنی و یۆنانی.بەڵام ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە گەر پێمان وابێ ئەو زمان و شێوازەی سەمەدی پێ پاچڤەکراوە، زمان و شێوازی زۆرداره،هەرگیز!.. وەرگێڕ هوشیارو بە دەسەڵاتە،هەرچەندە لە هەندێ شوێنان کە پیشانی دەدەم،زیاتر شرۆڤەو تەفسیر دەکات تا پاچڤە. ڕاستە وەرگێڕ هاوسۆزی دەگەڵ مەزڵوومیەتی نەتەوەیی سەمەدا هەیە، بەڵام پانتورکیست و ڕاسیست نییە، باوەڕی بەوە نییە کە تورك لە هەمووان باڵاترەو ئەم بیرکردنەوە بێ بنچ و بناوان و بۆش وبەتاڵانەی لا نییە. لێ هەندێجار دەبێت بە کیسرەوی و تورکی دەنووسێت. واتا تاڕادەیەك عەودالی تورکی پەتییە، هەرچەندە لەم پەتی خوازییەشدا، سوود لە وشەی تورکی ئازربایجانی وەردەگرێت، لێ هەرچۆنێك بێت، ئەم زمانە لە هەندێ رووەوە، دروست هاوتای زمانە فارسییەکەی سەمەدی بیهرەنگی نییە. ئەمە خۆی لە خۆیدا لە دوو رووەوە مەسەلەی بەراوردی شێوەو شێواز دێنێتە گۆڕێ. من پێموایە وێرای ستایشی فراوانی (یەڵدنیز کورتولان)ی وەرگێڕ کە هیمەتێکی گەورەی کردووەو سەمەدی خستووەتە بەردەستی خەڵکی تورکیا، کە ئەلهەقی شایستەی دەستخۆشییە، دەبێ ئەم دوو خاڵە لەبەر چاوبگرین:

*- چەندین ساڵ بەر لەوەی تورکی پەتی باو پەیدا بکات، زمانی شیعری تورکی تەواو گۆڕابوو.ئەگەر بەراوردێك لە نێوان بەرهەمەکانی سەرەتای کەڵە شاعیری تا ئیستا زندووی تورك(فازیل حەسنود ئاغلارجا) و بەرهەمەکانی ئەم بیست ساڵەی دوایی بکرێت، ئەوە دەردەکەوێت کە (فازیل بێگ) لە سەرەتادا تورکی عوسمانی بەکارهێناوە کە تێکەڵەیەکی تورکی و فارسی و عەرەبی بووە، بەڵام پاشان بەرەو زمانێکی تورکیتر و پەتی تر چووە. بیرم دێت کە بیست ساڵ بەر لە ئیستا لە موغازەکەی خۆیدا لە پاینی (بایەزید)! بە منی دەگوت: "لە تەبرێزەوە وشەی تورکی نوێ و نایاب، داستانی نایابی ئازەریم بۆ بنێرە" ئەم خولیایەی لەوپەڕی هەڵچوون و هەڵکشاندا بوو، وبێگومان ئیستاش ئەو خولیایەی ماوە. نوێ لە ئەدەبیاتی ئەمرۆی تورکدا، زیاتر سوود وەرگرتنە لە جۆرە تورکییەکی پەتی، کە خۆی لە خۆیدا دژایەتی کردنی وشەی عەرەبی و فارسییە. هەوڵدانە بۆ بەکارهێنانی وشەی ناو دیالێکتەکانی دیکەی تورکی لە جیاتی وشەێن بێگانەو زمانانی دی. هەربۆیەش گوتم هاوتای ئەم تورکییە، لە زمانی فارسیدا، تا ڕادەیەك کەسرەوی یە تا سەمەدی بیهرەنگی.

سەمەد بە شێوەیەکی زۆر سروشتی زمان بەکاردێنێت: قەت لە هەوڵی ڕاگرتنی دەسکردی گەشەکردنی زماندا نییە، بگرە لە هەوڵی ئەوەشدا نییە لە دەرێڕا شتێك بێنێ و بیخاتە سەر ئەم زمانە. زمانی سەمەد بە وشەێن نافارسی مامەڵەی نەتەوەیی ناکات، یانی بە وشەێن نافارسی نەتەوەپەروەری ناکات. لەوەیە ئەگەر سەمەد بە تورکی نووسینی کردبا، بەمەبەستی دەوڵەمەندتر کردنی تورکی ئازەری، برێك وشەی فارسی و عەرەبی لە ناو زمانی تورکی ئەمرۆی ئازربایجاندا وەدەرنابوایە و وشەی تورکی ڕەسەن و پەتی لەبری بەکارهێنابان. لێ سەمەد لەبەر نزیکی خۆی لە شێوازی عامیانەوە، هەرگیز کارەکەی کیسرەوی نەدەکرد کە پاشان لە کارێن خەڵکانی وەك بهرۆز و مقدم و سادق کەیادا،گۆڕا بە جۆرێك لە فارسیخوازی. لێ ئەمە نیشاندانی خەیاڵی مێژووەو نابێت لەگەڵ مێژوودا تێکەڵ بکرێت و وەکو مێژوو تەمەشا بکرێت. سەمەد بە فارسییەك نووسیویەتی کە پەتی نییە، بەڵکو هاوچەرخە لەگەڵ مێژووی هاوچەرخی ئێراندا.

تەرجەمەی سەمەد، تا ڕادەیەك بە تورکییەکی پەتی کراوە، لە ڕاستیدا بە تورکییەکی ڕۆشنبیرانە کراوە، تورکییەکی (بژارکراوە) وئەم کارەش ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت کە رادەی پێشوازی عەوامی خەڵکی تورکیا لە بەرهەمەکانی سەمەد کەم بکاتەوە. هەڵبەتە من ، لە دوورەوە، بەڵکو زۆر لە دوورەوە دەستێکم لە ئەدەبیاتی توکیدا هەیە. تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە لە تەرجەمەی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵیدا هەرگیز ئەمە ڕوو نادات..کە خەت و ئەلفبای تورکی بە فرمانێك گۆڕا، مەگەر خوا بزانێ چ سامانێك، داب و نەریت و کەلەپوورو زنجیرە یادو یادگارێکی مەزنی کەلتووری و چ پێشینەیەکی زمانەوانی و فۆنەتیکی لە کیس تورکەکان چوو! هەنووکەش بە فەرمانی ڕۆشنبیران و ئەدیبانی تورك، زمانی تورکی لە حاڵی خۆ تەکاندن و وەدەرنانی بەروبوومی مێژوویی زمانانی کاریگەر بەسەر تورکییەوەن. لق و پۆپ وپەرچکردن و پاککردنەوەی تورکی لە مێژووی کاریگەریی فارسی و عەرەبی ڕەنگە مەحاڵ بێت، لێ ئەم خۆدورگرتنە لە ژینگەی واقیعی ڕۆژهەلاتی نزیك، لە چەمکێن هاوبەش، لە دەستەواژەی زمانانی دراوسێ، لەوەیە تورکییەکی(نەتەوەیی) لەم سەردەمە خێراو تیژتێپەڕەدا بێنێتە ئاراوە کە بەرەو بە نێونەتەوەیی بوون بچێت، بەلام ئەم تورکییە نەتەوەییە هەڵگری هەموو سنووردارییەکانی کارەکانی کیسرەوی، بەهرۆز ومقدم دەبێت.. بژارکردن و سڕینەوەی زاکیرەو هزرێن هاوبەشی ڕۆژهەلاتیان خراترین جۆری غەربزەدەگییە، وەکو چۆن سڕینەوەی هزری هاوبەشی میللەتێك خراترین خیانەتە لە بەردەوامبوونی ژیانی ئەو میللەتە. بە گومانی من لە تەرجەمەی بەرهەمێن ئێرانیانی دیکەشدا یان لە تەرجەمەی بەرهەمێن نووسەرانی هەموو زمانانی دیدا بۆ تورکی، هەمان ڕەفتار و مامەڵە دەکرێت وکراوە. وسەمەد لەوان جیا نیە.

*– خاڵی دووەم خودی پاچڤەکەیە. پاچڤەی سەمەد پێویستە سادە بێت.چونکە سەمەد هەرگیز وشەی قەبەو قەڵەو وبە توێکڵ بەکار نایەنێت، واتا وشەئارایی ناکات.ئەو ئاوەڵناوەی کە بۆ ناوێك بەکاری دێنێ، زۆر بە وردی هەڵیدەبژێرێت،سەمەد بە دەگمەن دوو سێ ئاوەڵناو لە پشت یەك وشەوە ریزدەکات، ئەگەر وابکا هەر یەکێك لەو ئاوەڵناوانە دەبێت بە باشترین ناو بۆ وشە وەسفکراوەکە. ئەمە سنعەتی کورتبڕی سەمەدە. یانی سەمەد زمانی چیرۆکێك بە جۆرێ

هەڵدەبـژێرێت، وەك بڵێیـت ئـەو چـیرۆکە بـەر لـەوەی سـەمەد بینووسـێت، بـەخۆی بـەو شـێوەیە هــەبووەو ســەمەد تــەنیا ئــەرکی جێبــەجێکردنی کەرەســتەی بابــەتی و بونیــادی چــیرۆکەکەی کێشـاوە،وەك بڵێـی سـەمەد پردێکـە بـۆ پەراندنـەوەی ئـەو هـەموو شـتە. واتـا سـەمەد بابایـەکی رۆمانسی نەبوو.کە نووسەرێك لەگەڵ قارەمانەکانیدا ئیحساساتی دەبێت، گوشاری نووسینەکەی بـەرز دەبێتـەوە، گوشـاری خـوێنش هەروایـە.نووسـینەکە سـەرەگێژکێ دەگرێـت، وشـەکان لـەو سنوورو مەدارەی کە بۆ مەبەست وماناى پێویست هێنراوەتەوە، دەردەچن. ئەمجۆرە هەڵچوون و حەساسیەتە خۆی لە خۆیدا دەستوەردانێکی نابەجێیە لە چارەنووسی کارەکتەرەکان و رەفتارو کرداریـان. بە هـەرحاڵ سـەمەد بابایـەکی دوورە لـە میـزاج، لـە هەڵچـوون،و زۆریـش وردە. سـەمەد لـەباری سایکۆلۆژییەوە نـەخۆش نییـە، ئاشقی سۆزو سۆزداری پەیوەنـدی نێـوان بنیادەمانـە، لێ خۆی لە دەرێی بازنەی ئەو سۆزو میهرەبانییە ڕادەگرێت.

خەسـڵەتێکی دیکـەی پەخشـانی سـەمەد، واقیعـی بوونیـەتی، سـەمەد پەخشـانی رازاوەو جـوان نانووسـێت. زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەو کتێبانـەی لـە لایـەن بنکـەی پـەروەردەی فیکـری منـدالاًن وچــیرۆکێن دیکــەی مندالاًنــەوە چــاپ وبلاًودەکرێنــەوە، بــە زمــانێکی نــاواقیعی نووســراون. نووسەرانی ئەم بەرهەمانە هەوڵدەدەن بە زمانێکی جوان، ئەدەبی، شاعیرانە و یان پەتی بنووسن، یـان لاسـایی شـێوازی فۆلکلـۆری بکەنـەوە، سـوود لـە هـەلور بـەلور بـازی بێسـوود و سـەخیفانە وەردەگرن. یـان هەندێجار سوود لە چۆلەکەیەکی،نەك مندالاًنە، بەڵکو نیمچە حەیوانی و نیمچە مرۆڤ دەبینن، کە هیچ پەیوەندییەکی بە چیرۆکەکەوە نییە یـان هێندە شێوازپەروەری دەکەن کـە چیرۆکەکە لـەژێرباری شـێوازدا ون دەبێـت.سەمەد بە پێچەوانەوە، هـەرگیز هـەوڵنادات کـە جـوان بنووسـێت. هـەرگیز شـتی قـەڵب لـە سـەرووی مانـاو مەبەسـتەوە لـە بەرهـەمی خـۆی بـار ناکـات. بـە کـورتی سـەمەد، بـە وردی بونیـادی نـاوەوەی زمـان دەناسـێت و زۆربـەی جـار بـە کـورتترین شـێوە پەیامی خۆی دەگەیەنێت. ئەگەرچی سەمەد هەندێجار تووشی دژواری و ئاڵۆزی دەربڕین دەبێت، بەلاًم ئەم دژواری وئاڵۆزییە پتر لەبەر ئەوەیە هەندێجار دەسەلاًتی تـەواوی بەسەر زمانی بێگانـەدا، کە زمانی فارسییە ناشـکێت،هـەروەها زادەی ئەم خاڵەشە کە سەمەد گوندانێك بۆ کۆکردنـەوەی کەرەسـتەو بابـەتی سـەرەتایی چیرۆکەکانی دەگـەرێت کـە بـە دەگمـەن کەسـێکیان لـە نـاودا پەیـدا دەبێت فارسـیی ڕەوان بێت.هـەروەها بـە زمانێك بابـەت دەنووسـێت کـە خوێنـەرانی یـا فارسـن یـا فارسـی دەزانـن، بـە هـەرحاڵ سپاردنی کەرەسـتەی خـاو وسـەرەتایی زمانێك بـە زمانێکی دیکـەی بێگانـە کـارێکی ئـاڵۆز و دژوارە، بۆیـە سـەمەدیش دووچاری هەندێ دژواری دەبێت، بە هـۆی ئـەم جووت زمانییەوە دەکەوێتە هەورازو نشێوەوە.لێ لە رووی جێبەجێکردنەوە سەمەد یەجگار وردە، لەم جێبەجێکردنەدا هێندە پشت بە بونیادی گشتی و پراتیکی زمانـان دەبەستێت کە دەتوانرێت بێ سێ و دوو بگـوترێ سەمەد ئەگـەر زمانی تـری بزانیبایـە، دەیتـوانی بـەو زمانانـە بابـەتی خـۆی ئەنجام بدات و دەربڕێت. رازی قابیلی تەرجەمەبوونی بەرهەمێن سەمەد لەم خاڵەدا پەنهانە.

خەسـڵەتێکی دیکـەش هەیـە کـە زادەی خـاڵێکی گەلـەك گرینگـە دەربـارەی ئـەو کەسـانەی کـە بـەزمانی زکمـاکی خۆیـان نانووسـن، وشـەو ڕسـتەو دەسـتەواژەێن زمـانی زکمـاك ئاوێتـەی بـیرو

بیرەوەری سەردەمی منداڵین، بۆیە یەجگار خۆشەویستە، کاتێ نووسەرێك بە زمانێکی دی بنووسێت، تەنانەت ئەگەر بیرەوەری و خاتیرەش بنووسێت، لە بواری زماندا، ئەو بیرەوەرییە،دوور دەبێت لە هەموو جۆرە تەکەلوفێك و ئاوێتەی جۆرێك لە عاتیفەی خۆڕسك دەبێت، کە دەکرێت ناوبنرێت شێواز. کاتێ مرۆڤ بە زمانێکی دی دەنووسێت و بە تایبەتی دەربارەی منداڵان و بۆ منداڵان کە بە تەبیعەت دەبێت پاراوییەکی عاتیفی خۆڕسکی تێدابێت، لەو پاراوییە عاتیفییە خۆرسکە دووربکەوێتەوە، لە ڕاستیدا شێوازی نابێت، چونکە بە زمان و پەخشانێکی گشتی وەها دەنووسێت کە لە واقیعدا هەیە. پەخشانی سەمەد هێندە واقیعییە کە شێوازی نییە، دروست بە پێچەوانەی پەخشانی جەلال ئال ئەحمەدەوە کە پاراوییەکی عاتیفی خۆرسکی هێندە بەهێز بەگەڵ قسەو یادو یادگارەکان کەوتووە کە سەربەخۆیی کاراکتەرەکانی لەنگ کردووە.شێوازی بێ پەرواو حیرەت ئەنگێزی جەلال، کاراکتەرەکانی کوێر کردووە. جەلال هەموو کەس و شتێك بەخۆی و بۆ خۆی دەگۆڕێت، سەمەد چاو لە خۆی دەپۆشێت.لە ئەدەبیاتدا کامیان پابەندترو پەیامدارترن؟ بێگومان سەمەد، پابەندی و ئیلتیزام لە چیرۆکدا دەکاتە چاوپۆشین لە خۆ و، بەخشینی ژیانی سەربەخۆ بەکەسانی دی. (من)ی جەلال زۆر بەهێزو زاڵە. سەمەد (من)ی نییە. هەموو کەسێك ئەوە. سەبارەت بە پاراوی و ئاوێتەیی عاتیفی خۆرسك، سەمەد عەوداڵی (مەودا دانانە) سەمەد مەودایەك لە نێوان خۆی و قارەمانانی چیرۆکەکانیدا دادەنێت تا لە ئەنجامی ئەم مەودا دانانەوە قارەمانەکان و کارو کردەوەیان،و بە شێوەیەکی گشتی رووداوێن چیرۆکەکە کە سوود لە سەربەخۆیی وەربگرن، لەوەش زیاتر سەمەد عەوداڵی مافی دیاریکردنی چارەنووسی قارەمانانی چیرۆکە. چیرۆکێك بێ هیچ دەست تێوەردانێکی سەمەد و دوور لە سەمەد دەکاتە پەیوەندییێن بنیادەمەکان بە یەکەوە ، ئەگەر هاوسۆزییەك لە نێوانیاندا هەبێت کە بێگومان هەشە،بە هۆی پەیوەندییێن سەربەخۆیی خودی ئەوانەوەیە. سەمەد لە دەرێی چیرۆکدا ماوەتەوە، ئەمە گەورەترین تەکنیکی سەمەدە.وەکو چۆن پەیکەرێك پاش تەواوبوونی چ پەیوەندییەکی بە پەیکەرسازەکەوە نامێنێ و دیاردەیەکی سەربەخۆیە، چیرۆکی سەمەدیش چ پەیوەندییەکی بەسەمەدەوە نامێنێ و سەربە پەیوەندییێن گشتی خودی ئەو بەرهەمەیە. رەنگە ئەگەر سەمەد چیرۆکەکانی بە زمانی زکماکی خۆی بنووسیبوایە، ئەوا بیرەوەری منداڵی و پاراوی عاتیفەی خۆرسکی منداڵی، بیانکردایەتە کارێك کە چیرۆکەکان لە سەر بەخۆیی مەحروم بن. لێ سەمەد بە خۆی، دەرهەق بە چیرۆکی خۆی بێلایەنە. قارەمانەکانی سەمەد بێلایەن نین و لایەنی فیکری و ئایدۆلۆژی تایبەتیان گرتووە. سەمەد کۆمەڵێك بنیادەم دروستدەکات کە دوور لە سەمەد روو بە رووی یەکتر دەوەستن. سەمەد بە تەواوەتی خۆی دەشارێتەوە. نووسەر پەنهان دەبێت تا نووسین بدۆزرێتەوە. سەمەد لە راستیدا پێمان دەڵێت ئەم چیرۆکانە هەبوون، هەن و دەبن. ئەم ماسییە بەم شێوەیە هەبوو، هەیە ودەبێت. ئەرکی من دەربڕینی ئەو (هەبوون)ەو (دەبێت)ەیە، نەك دەستوەردانی دەرەکی لە چەمکی ئەو (هەبوو، هەیە و دەبێ)یە. سەمەد بونیادی گشتی و قوڵایی ئەو رووداوانە دەردەبڕێت. ئاخر نووسەرێك بە چ هەقێ دەتوانێت دەست لەو بونیادە ئەستوونییە وەربدات! ئەو بونیادە ئەستوونییە لە

سایکۆلۆژی کەسێك بە هێزترە.بەشێکی هەر یەکێك لە ئێمە، بونیادی هەر یەکێك لە ئێمە لە (ماسییە ڕەشە چکۆلەکەدا) لە (قوجەلی)دا، لە (یەڵدن)دا هەیە. سەمەد وەکو نووسەری ئەو چیرۆکە، لەگەڵ مندا کە نووسەری چیرۆکەکە نیم یان لەگەڵ کەسێکدا کە هەر نووسەریش نییە، جیاوازی نییە. جوانی کاری سەمەد لەوەدایە کە زۆر بە ڕەحەتی دەچێتە پێستی کاراکتەرێن جیاوازەوە بێ ئەوەی کاراکتەرەکان لە خۆیدا بتوێنێتەوە (سەمەد دەقاو دەق بە پێچەوانەی سادقی هیدایەتەوە کاردەکات.) لەم ڕووەوە سەمەد چەند لە (مورغی ئامین)ی نیما نزیکترە! و چەند لە سایکۆلۆژیبازی دوور دەکەوێتەوە..

بەر هوەی بێینە سەر هەڵەو پەڵەێن تەرجەمەکان، پێویستە ئەوە بڵێین کە تەرجەمەکان بە شێوەیەکی گشتی، وێڕای ئەو هەڵانەش هەر باشن. ڕەنگە ئەم هەڵانە زادەی ئەوەبن کە (کورتولان) بە خۆی فارسی نازانێت، یان کەمێکی دەزانێت و بابایەکی ئێرانی فارسی و تورکی زانی دۆزیوەتەوەو بە گێڕانەوە چیرۆکەکەی بە زمانی تورکی بۆ گێڕاوەتەوە و وشە فارسییەکانی بۆ کردوون بە تورکی و کورتولان لە زاری ئەوی وەرگرتووەو دایڕشتووەتەوە، واتە گێڕانەوە لە کابرای گێڕەرەوە بووەو نووسین لە کورتولان. ئەمە یەکێکە لە تەرجەمە باوەکانی جیهان، چونکە بە دەگمەن ڕێدەکەوێت کەسێك شارەزای تەواوی هەردوو زمانەکە بێت، کەسێکی زاڵ بەسەر زمانی یەکەم و شارەزا لە زمانی دووەم دێت دەقەکە وشە بە وشە بۆ ئەو کەسەی کە شارەزایی تەواو یان ناتەواوی لە زمانی یەکەمدا هەیە و زاڵە بەسەر زمانی دووەمدا ،دەگێڕێتەوەو ئیدی نەفەری دووەم دەقەکە بە زمانی دووەم دادەڕێژێتەوە. لێ لەم جۆرە حاڵەدا، شێوازی ئەسڵی دەقەکە بە تەواوی ناگاتە گوێی نەفەری دووەم و،چونکە نەفەری یەکەم ناتوانێ دەستکاری شێواز لە زمانی دووەمدا بکات، ئیدی گیرو گرفتی نەقڵ وتەرجەمەی شێواز دێتە گۆڕێ، تەنانەت لە تەرجەمەی نووسەرانی وەکو سەمەدیشدا کە تەرجەمەیان کارێکی ئاسانە..خەوشێکی دیکەی ئەمجۆرە کارە ئەوەیە کە هەندێجار بابای گێڕەرەوە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، ڕستەیەك یان وشەیەك لە دەرێی دەقەکەوە بە وەرگێڕ یان جێبەجێکاری زمانی دووەم دەدات. ئیدی وەرگێڕ پێ بزانێت یان نەزانێت، هەندێ لەم ڕوونکردنەوانە تێهەڵکێشی دەقەکەی خۆی دەکات..دەشێت وای دابنەین کە کورتولان دروست کەوتووەتە وەزع و حاڵێکی واوە. لەم حاڵەدا ئەو لەو عەیب و ئیرادە ناچیزانەی لە تەرجەمەکەیمان گرتووە، دەخەلەسێت و گوناحی نابێت. جا با لەبەر ڕۆشنایی ئەو گوتانەی سەرێ و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو حەقیقەتەی کە هەندێك لە مەسەلەکان پەیوەستن بە تەرجەمەکەوەو هەندێکی تریان پەیوەندییان بە تەرجەمەکەوە نییە، چاوێکی خێرا بە سێ پارچەی تەرجەمەکانی (یەلدنیز کورتولان)دا بگێڕین: لاپەرەی یەکەمی (یەڵدز وقەلان) لاپەڕەی یەکەمی (یەڵدز وبووکەڵەی قسەوێژ) وشیعرێکی ناو چیرۆکی دووەم ولاپەڕەی یەکەمی (یەڵدز و قەلان) وەکو نموونەیەکی قسەکانی سەرێ بخەینە بەردەست و پاشان لەگەڵ دەقە تورکییەکەدا بەراوردی بکەین: " یەڵدز بە تاقی تەنیا لە ژوورەوە دانیشتبوو و تەمەشای دەرێی دەکرد. باوەژنەکەی چووبووە حەمام. دەرگای داخستبوو. بە یەڵدزی گوتبوو کە لە جێی خۆی نەجوڵێ ئەگینا بێتەوە بابی دەردێنێ، یەڵدز لە ژوورەوە دانیشتبوو و تەمەشای دەکرد. بیری

کردەوە. وەکو بنیادەمی گەورە لە فکران ڕاچووبوو. لە جێی خۆی نەدەجولا. زۆر لە باوەژنەکەی دەترسا. بیری لای بووکەڵە گەورەکەی بوو. تازە بووکە شووشەکەی ون کردبوو. ئەوەندە پەست بوو مەپرسە. چەند جارێك قامکەکانی ژماردن. ئەوجا بە ئەسپایی هاتە بەر پەنجەرەکە.

بێتاقەت بووبوو، لەپڕ بینی قەلێك لە کەنار حەوزەکە نیشتووەتەوە و ئاو دەخواتەوە. یەڵدز تەنیایی خۆی فەرامۆش کرد و دڵی کرایەوە. قەلەکە سەری هەڵبڕی. چاوی بە یەڵدز کەوت. ویستی هەڵفڕێ. کە دیتی یەڵدز هەقی نییە بە سەرییەوە، نەرۆیی.تۆزێ دەنووکی کردەوە. یەڵدز وایزانی دەیەوێ پێبکەنێت. دڵی خۆش بوو. پێی گوت: کاکە قەل، ئاوی حەزەکە پیسە، ئەگەر بیخۆیتەوە نەخۆش دەکەوی.

قەلەکە دیسان پێکەنی.ئەجا هەڵقونایەوەو هاتە پێشەوە، گوتی: نە گیانەکەم، بۆ ئێمەی قەلان چ فەرقێك ناکات، لەمەش پیستر دەخۆینەوەو هیچمان لێنایەت. چیتریش بەمن مەڵێ "کاکە قەل". من ژنم، چوار مندالم هەیە. پێم بڵێ" دایکە قەلێ"

ڕستەیەلی:" بە یەڵدزی گوتبوو کە لە جێی خۆی نەجوڵێ ئەگینا بێتەوە بابی دەردێنێ" لە ڕووی دەستورییەوە گۆڕاون و کراون بە : " کاتی ڕۆیشتنیش، لە کاتی جولاندا، لە گەڕانەوەدا بابی دەردێنێی گوتبوو."هەوڵم دا بە وردی ڕستە تورکییەکە تەرجەمە بکەم تا بزانن کە چۆن دەستوری ڕێزمانی چیرۆکەکەی سەمەد گۆڕاوە بۆ ڕستەیەکی فیکری. سەمەد کردارەکان دەگێڕێتەوە، بەلام وەرگێڕ فیکر وچەمکی کردارەکان دەردەبڕێت و ڕستەکە بەرەو ئەنجامگیری ئاراستە دەکات. واتە وەرگێڕ وەکو ڕۆشنبیر کاردەکات،سەمەد وەکو چیرۆکنووس، گونجاندن و پێکهێنانی چەند مانایەك لە یەك ڕستەی هەندێ درێژو ئالۆزدا، ڕۆشنبیرانەیە نەك چیرۆکانە. (کاتی ڕۆیشتنیش) لە دەقە فارسییەکەدا نییە. لە ڕستەی (بیری لای بووکەڵە گەورەکەی بوو)وشەی (ش) پەریوە. (تازە): بە (لە ڕابردوودا) تەرجەمەکراوە کە دەقاو دەق پێچەوانەی دەقەکەیە. پاش ڕستەی ( چەند جارێك قامکەکانی ژماردن) لە تورکییەکەدا وشەی (نەبوو) زیاد کراوە. سەمەد دەنووسێت: "کە دیتی یەڵدز هەقی نییە بەسەرییەوە، نەرۆیی" وەرگێڕ دەنووسێت، ئەمما چ ڕۆمانسیانە دەنووسێت!: "بەلام پاکی وراستگۆیی نیگای یەڵدز کردییە کارێك قەلەکە نەفرێت." سەمەد دەنووسێت: " قەلەکە دیسان پێکەنی. ئەوجا هەڵقونایەوەو هاتە پێشەوە." وەرگێڕ وای وەردەگێڕێت: "کاتێ کە قەلەکە ئەمەی ژنەوت بە بازێك لەبەردەم پەنجەرەکە نیشتەوە."

وشەی (پەنجەرە) ڕەگەزێکی نوێ بۆ بونیادی جوگرافیایی حەرەکەتەکە زیاد دەکات کە لە دەقەکەی سەمەدا نییە. سەمەد دەنووسێت : " نە گیانەکەم بۆ ئێمەی قەلان چ فەرقێك ناکات" وەرگێڕ وای تەجەمە کردووە: " بۆ ئێمەی قەلان پیسی یان خاوێنی ئەو ئاوەی دەیخۆینەوە فەرق ناکات." سەمەد دەنووسێت : "من ژنم" وەرگێڕ دەنووسێت : " من پیاو نیم، ژنم." سەمەد دەنووسێت: " پێم بڵێ دایە قەلێ!" وەرگێڕ دەنووسێت: " لێ ئەگەر بخوازی دەتوانی بە من دایە قەلێ بڵێی."! ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەم دوو پەرەگرافەی سەمەد لە لای وەرگێڕ بووە بە هەشت پەرەگراف.

